یەکەم پەرتووکی وێنەدار
بۆ نیشانەکانی ڕۆژیی دوایی



هەنگاوەکان بەرەو مەلیک ﷻ

# کۆتایی جیهان

## نیشانەکانی ڕۆژی دوایی گەورەو بچووک

لەگەڵ وێنەو نەخشەو ڕوونکردنەوەکان

د. محمد بن عبدالرحمن العريفي
و/م. مصدق محسن



یەکەم چاپ

2012

بسم الله الرحمن الرحيم

إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾



# کۆتایی جیهان

لەگەڵ چەندین وێنەو نەخشە و ڕوونکردنەوە

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : **کۆتایی جیهان**

ئامادەکردنی : محمد بن عبدالرحمن العریفی

وەرگێڕانی لەعەرەبیەوە : مصدق محسن

نەخـــــشەسازی و بەرگ: زانا ئەحمەد کەریم

چـــــــــاپی : یەکەم ٢٠١٢

شوێنی بڵاوکردنەوە : (کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی)

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (       )ی ساڵی ٢٠١٠ ی پێدراوە

**کتێبخانەی**

**حاجی قادری کۆیی**

**بۆ فرۆشتن چاپکردن و بڵاوکردنەوە**

هەولێر — کوردستان — عێراق

(٠٧٥٠١١٨١٩١٩) (٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣٩٤ ) (٠٦٦ ٢٢٢٣ ٨٦٨)






یەکەم پەرتووکی وێنەدار بۆ نیشانەکانی رۆژیی دوایی

هەنگاو ناونان بۆ لای پەروەردگار (عزوجل)

# کۆتایی جیهان

## نیشانە بچووکەکان و گەورەکانی رۆژی دوایی

لەگەڵ چەندین وێنەو نەخشە و ڕوونکردنەوە




د. محمد عبدالرحمن العريفي

وەرگێڕانی / مصدق محسن



٢٠١٢




## بەناوی خودای مەزن و دلۆڤان

سوپاس و ستایش بۆ خودای هەردوو جیهان، درووددو سڵاو بڕژێتە سەر پێغەمبەران و پەیامبەران، بەتایبەتی چاکترین درووود و پاکترین سڵاو بڕژێتە سەر پێغەمبەرمان موحەممەد درووودی خوای لەسەر بێت وە لەسەر یاران و شوێن کەوتووانی .

لەو سەردەمە دواکەوتووەی ئێمەدا، کە ڕاوکەرو تیرهاوێژ تێکەڵی یەکتر بوونە، کە ئێستا لەپەرتووکخانەکان دەبینڕدێ، وە پێگەکانی ئەنتەرنێت لەبەدگومانی و درۆ هەڵبەستن بۆ ڕووداوەکانی دوا ڕۆژ، وەپشت دەبەستێ بەو ئایەت و حەدیسانەی هێمادەکەن بۆ پێشهاتەکانی دوا ڕۆژ، کەوا پەیوەندی هەیە بە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، هەر بەڵاو ناخۆشی بۆ ئیسلام و خەڵکەکەی زیاد دەکات و خەڵکیش دەگەڕێن بەدوای کون و کەلەبەرەکان..

جارێک گوێت لێدەبێت لەهاتنی موحەممەدی مەهەدی...وەجارێکیش بە نزیک کەوتنەوەی داستانی گەورە لەگەڵ جوولەکەیان نەسرانیەکان.. و جارێکیش گوێ دەگریت بەڕۆژگیران، لەڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا.. وەزۆر شتی دیکەش.

بەڵکو پێش ماوەیەک من سەردانی یەکێک لەو وڵاتە ئەفریقایەکانم کرد، بینیم پیاوێک لەلایان دەرکەوتووە بانگەواز دەکات کە ئەو عیسای کوڕی مەریەمە دابەزیوە!!

بۆیە پێویست دەکات، لەڕوونکردنەوەی نیشانەکانی ڕۆژی زیندووبوونەوە، وە قسەکردن لەسەر ماناکانی و زانیاری تێگەیشتن لەبیرو باوەڕ... بۆ ئەم پەرتووکەی لەبەر دەستتدایە.

لەخودای گەورە داواکارم سوودبەخش بێت بۆ هەمووان، وە ئەم پەرتووکە بگێڕێت بەزانستێکی بەسوود کەوا لەڕۆژی دوایی شاهیدیمان بۆ بدات.. ئامین.

د. محمد عبدالرحمن العريفي



# بۆچی لەبارەی نیشانەکانی رۆژی دوایی دەدوێین




**هەر** کارێـک مرۆڤ بەدوایدا بگەڕێت و قسـەی دەربارەی بکات بێگومان بەرهەمی دەستدەکەوێت لەتوێژینەوەو زانستەکەی .

وە ئایـا لێکۆڵینـەوە لەنیشـانەکانی رۆژی دوایـی و زانینـی بەرهەمی دەبێت لەکاروبـاری ژیانماندا؟ یان تەنها زانیاریەکە مرۆڤ دەیخاتە سـەر رەسـیدی رۆشنبیریەکەی بێ ئەوەی کاریگەری هەبێت لەڕاستیدا؟

## وەڵام /

بێگومـان باسـکردنی نیشـانەکانی رۆژی دوایی لەقورئان و سـوننەتدا هاتووە، بۆیە بۆ مرۆڤ سوودێکی زۆری هەیە لەژیانیدا، لەمانەش :

١. دڵنیـا کردن و پتەوکردنـی بیروباوەڕ بەنهێنیەکانی (غەیب)، ئەمەش ڕوکنێکە لەشـەش روکنەکانـی ئیمان، خـودای گەورە دەفەرمووێـت : ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ ﴾ البقرە /٣

**واتە// (ئەوانەی باوەڕ بەنەبینراوەکان دەهێنن وەک - خواو فریشتەو ئەوانەی خواباسیان کردوون و ئێمە نایانبینین - هەروەها نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن).**

لەئەبی هورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت : پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت :
(أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ، ويقيموا الصلاة ، ويؤتوا الزكاة ، فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحق الإسلام، وحسابهم على الله )) رواه البخاري ومسلم

واتە: **((فەرمانم پێکراوە کەوا شەڕی خەڵک بکەم تاوەکو شایەتی دەدەن کەهیچ خودایەک نیـە جگە لەزاتی (اللـە)، وە باوەڕ بەمن دەهێنن بەوەی بۆم هاتـووە کە قورئانە، ئەگەر ئـەم کارەیـان ئەنجامدا ئەوا خوێن و ماڵیان لەمن حـەرام دەبێت تەنها بەو حەقەی کەوا لەسەریانە وە حیسابیشیان لەلای پەروەردگارە))**

وەباوەڕهێنـان بەنهێنیەکان مانای باوەڕهێنانە بەهەموو ئەوانەی خودای گەورە فەرمانی پێداوە یان پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت رایگەیاندووە،
دروسـتە ئەوەی لە ئەو بینیومانە، یان لیمان دیارنەماوە، دەزانین ئەو راسـتە، وەڕاستی فەرمـووە، وە لەنیشـانەکانی ڕۆژی دوایـی، وەکو هاتنی دەجال، وە دابەزینی عیسـای کـوڕی مەریەم ڕەزای خوای لەسـەر بێت، و هاتنی یەئجـوج و مەئجوج، وە پەیدابوونی (دابة) کەگیانلەرێکە لەگەڵ خەڵکی قسـەدەکات، وە هەڵاتنی ڕۆژ لەرۆژ ئاوا، زۆر شـتی دیکەش کەلەئەو گواستراوەتەوە دروستە.

٢. لەزانینـی نیشـانەکانی ڕۆژی دوایـی هاندانی دەروونە لەسـەر گوێرایەلی و ملکەچی بۆ خودای گەورە، وە خۆ ئامادەکردن بۆ ڕۆژی زیندووبوونەوە، لەخەو هەڵسانی غافلگیرانە، بۆ ئەوەی بەرەو تۆبەو لێخۆشـبوون بچن، و پشـت نەبەستن بەدونیا، ئەمەش پێغەمبەر درودی خوای لەسـەر بێـت رایگەیاند لەگەڵ ئەوانەی دەوروو بـەری کاتێک بەیەکێک لەنیشانەکانی رۆژی دوایی زانی، وەلەدوو فەرموودەی صەحیحدا کەوا پێغەمبەر درودی خوای لەسـەر بێت لەشـەودا لەخەوهەڵسا و فەرمووی (ويل للعرب من شر قد اقترب، اليوم فتح من سد يأجوج ومأجوج.....) الحديث.

واتە: **((هاوار بۆ عەرەب لەشەڕێک کەنزیک بۆتەوە، ئەمڕۆ یەئجوج و مەئجوج کونێکیان لەبەربەستەکە کردۆتەوە ..))**

هـەروەها دەفەرموێت (أيقظوا صواحب الحجر ، فرب كاسية في الدنيا عارية في الآخرة)

واتە: **((برۆن خێزانەکانم بەخەبەر بێنن بەراسـتی زۆرێک لەپۆشـتەو پۆشـاک لەبەران لەدونیادا ڕووت و بێ سەرمایەن لەرۆژی دواییدا)).**

٣. هەروەهـا ئاگادار کردنەوەو ڕوونکردنەوەی تێدایە بۆ یاسـاکانی شـەرعی و کاروباری

تێگەیشتن و زانیاری بیرو باوەری ئایینی.
لە چیرۆکی مانەوەی دەجال لەسـەر زەوی،رۆژێکی وەک ساڵێکە وە رۆژێکیشی وەک مانگێکە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەرۆژە درێژەکان کەدەجال لەسەر زەوی دەمێنێتەوە پرسیاریان لێکرد، ووتیان: (أتكفي في اليوم الواحد منها صلاة يوم؟!) واتە **((ئایا لەو رۆژە درێژەدا نوێژی رۆژێکی تێیدا ئەنجام بدەین؟!))**
پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی ((لا، اقدروا له قدره)) واتە: **((نەخێر لەنێوان نوێژەکاندا کاتی بۆ دابنێن))**
لەمەدا سوودمان وەرگرت ئەوموسڵمانانەی لەووڵاتان نیشتەجێن چۆن نوێژ دەکەن لەکاتێکدا رۆژ یان شەو مانگێک بەردەوام دەبێت.

٤. زانیاری پێغەمبەر ﷺ بەنیشانەکای رۆژی دوایی، ئەمەش کردارێکی نهێنی و شارراوەیە بەگومان و خەملاندن هیچت دەستناکەوێت، بەڵگەی تێدایە لەسەر راستی پەیامەکەی، ئەمە پێغەمبەرێکە لەلایەن خودای مهرەبانەوە پاک و بێگەردە زانایە بەشتەنهێنی و بەڵگەنامە دروستەکان، خودای گەورە دەفەرموێت ﴿عَـٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ٢٧﴾ (الجن /٢٦-٢٧)

**واتە// (ئەو زاتە زانای نهێنی وشاراوەکانە، کەسیش لەنهێنی وشاراوەکانی ئاگادارناکات، مەگەر بۆ پێغەمبەرێک خوا خۆی رازی بێت (بەوەی هەندێ بزانێ) ئەوکاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لەبەرو پشتەوە (تاپەری و شەیتانەکان نەتوانن زەفەری پێ ببەن)**

٥. زانین و زانیاریمان لەسەر نیشانەکانی رۆژی دوایی سوودمان پێدەگەیەنێت لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا بەرێگایەکی شەرعی، تاوەکو فەرمانەکەیمان لەسەر نادیار نەبێت، وەک هەواڵ پێدانمان لەبارەی دەجال بەتێرو تەسەلی، وە وەسفکردنی چاوەکەی و نێوچەوانی و ئەو شتانەی لەگەڵیدان، تاوەکو نەکەوینە ناو فیتنەو بەلاکەی بەڵکو بزانین ئەمە دەجالە.

٦. خۆئامادەکردنێکی دەروونی لەکاتێکدا دوارۆژ دادێت، بەجیاوازیەک ئەگەر هاتوو کارەکە لەناکاو روویدا .

٧. کرانەوەی دەرگای هیواو ئومید،چونکە لەنیشانەکانی رۆژی دوایی سەرکەوتنی موسلمانانی تیدایە، وەبڵاوبوونەوەی لەسەر زەوی، ئایینی جوولەکەو نەساریەکان بەرەو ئاوابوون و نەمان دەچێت، ئەمەش بەپێی ئەو موژدە پەیامبەریانە بە چەسپاندن و شارەزاکردن

بۆ ئیسلام، وە لەسەر هەموو ئایینەکان دا سەردەکەوێت هەرچەندە کافرەکان نایانەوێت و پێیان ناخۆشە.

٨. تێربوونی ئارەزووی خۆڕسک لەئامادەمیزاددا، کە وا خۆی دەردەکەوێت بۆ دەرخستنی ئەوانەی لێی وونبوە وەزانینی ئەوانەی لەدوارۆژدا لەڕاستی و ڕووداوەکان ڕوودەدات، لەگەڵ بەجێگەیاندنی یاسادانەر کەخودای تاک و تەنیایە بۆ هەواڵە ڕاستگۆیەکان لەبارەی ئەم شتەپەنهانیانە.

ئەگەر هاتوو ئیسلام ڕێگاکانی ئەو دەجالانەی داخست ئەوانەی بانگەوازی شارەزا بوون لەسەر ئەو نیشانانە دەکەن، وەک فاڵ گرەوەکان، جادوو گەرەکان، وە قەشەو ئایینبازەکان (کاهینەکان) وەزۆرانی وەک و ئەمانە، بێگومان ئێمە شارەزاین لەماوەی ئەو هەموو سرووشانە کەپێغەمبەرمان ﷺ بۆی هاتووە لەسەر زۆربەی ڕووداوە دوارۆژەکان ئەویش نیشانەی ڕۆژی دواییە

٩. باوەڕبوون بەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئیمانمان بەهێزو زیاد دەکات، وە هاتن و ڕوودانی ئەم جۆرە نیشانانە ڕاستی ئایین دەسەلمێنێ کەوا تۆ لەسەریەتی، جگە لەبەروو بوومی زۆر کەوا کاریگەری هەیە لەژیانماندا.



# یاساکانی مامەڵەکردن لەگەڵ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

**زانایانی** کۆن و ئێستا زۆریان نووسیوە لەبارەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، وە هێشتاش نووسین و دانراوەکان دەردەچێت، وە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن، و ئێزگەکان، وەپێگەکانی ئەنتەرنێت هەموویان لەبارەی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لەنێوان ساتێک و ساتێکی تر قسەو باس دەکەن، بێگومان هەندێک لەوانەی مامەڵە لەگەڵ دەقەکانی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەکەن دەکەونە ناوشتێک لەتێکەڵاوی و شپرزە بوون.
وام هاتە پێش چاو لێرەدا ژمارەیەک لەیاساکان لەمامەڵەکردنی لەگەڵ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و دەقەکانی شەرع بهێنمەوە :

## قایل بوون لەسەر دەقەکانی قورئان و سوننەتە دروستەکان لەساخبوونەوەدا.

ئەمەش چونکە هەردووکیان چاوگەیەکن کەدەکرێن زانیاری نهێنیەکانی لێوەربگیرێت ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (النمل/٦١)

**واتە// ((ئەی محمد پێیان بڵێ ئەوەی لەئاسمانەکان و زەوی دایە هیچ نازانێت لەبارەی غەیب و شتەشاراوەکان جگە لەخودا نەبێت، وەنازانن و هەست ناکەن کەی زیندوو دەبنەوە))**

﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾ ﴾ (الجن/٢٦/٢٧)

**واتە// ((زاناو شارەزایە بەشتەپەنهان و شاراوەکان هیچ کەسێک لەسەر شتەپەنهان و شاراوەکانی شارەزایی و سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، تەنها لەوەی فێری پێغەمبەرەکەی کردووەو لێی ڕازی بووە))**

خـودای گەورە بـۆ بەرژەوەندی ئایینەکـەی هەندێک لەشتەشـارراوەکانی ڕاگەیاندووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، لەوانە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، ئەمەش غەیبێکی دوا ڕۆژە.

بـەڵام زانینـی نیشـانەکانی ڕۆژی دوایـی لەچـوار چێوەی ئیسـرائیلیەکان، یـان خەون و لێکدانەوەکان، یان دابەزاندنی ڕووداوەسیاسیەکانی لەسەر ئەوەی گوایە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی یە بەبێ بەڵگە لەسەر هیچ شتێک، ئەمە دروست نیە و باوەڕی پێناکرێت.

ئەمەش بێگومان ئەو دەقانەی کەباوەڕپێکراون ئەوە دروستە و ڕاستە، ئەوانەی کە پەیوەندی هەیە بەپێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت، یان یەکێک لەسەحابە بەڕێزەکان.

نیشـانەکانی ڕۆژی دوایی بووەتە دەرگایەک بۆ وورووژواندن و بارزگانی و بۆ بازارگەرمی لەفرۆشـتنی پەرتووکەکان، وەڕاکێشـانی خوێنەر و زۆر کردنیان بە باسـکردنی شتی نامۆو جیاواز و درۆودەلەسەو خەون و خەیاڵەکان.

لەتازەترین بابەت کە خوێندوومەتەوە لەبارەی ئەم دیاردەیە یەکێک لەدانەرەکان دەڵێت:

**(لەشوێنەوارێکی بەنرخ و خۆشەویستدا، لەدەست نووسێکی دەگمەندا لەسەدەی سێیەمی کۆچیدا لەیانەی پەرتووکە ئیسلامیەکان، لەپەرتووکخانەی تورک لە ئەستەمبوڵ ئەبو هورەیرە و ئیبنو عەباس و عەلی کوڕی ئەبی تالب ڕەزای خوایان لێبێت ریوایەتیان کردووە، وەلەریواتێکی دیکەدا ئەبوهورەیرە ترساوە باسی بکات، وەکاتێک هەستی بەمردن کردووە ترساوە زانیاریەکە بشاردرێتەوە بۆیە بەو کەسانەی ووتووە کە لەدەوروپشتیدا بوون دەڵێت: لەهەواڵێکدا کەسێک زانیاری پێداوە لەبوونی جەنگێک لەکۆتایی ئەم سەردەمەدا، ووتیان : پێمان بڵێ‌ی خراپ نیە خواپاداشتی چاکەت بداتەوە، ووتی: لەساتەکانی کۆچی دوایی هەزارو سێ سەد، شەش یان حەوت ساڵی تریش پیاوێک فەرمانڕەوایی میسر دەکات بەنازناوی (ناصر)، عەرەب بانگی دەکەن بە پیاوی ئازای عەرەب (شجاع العرب) خودای گەورە یەک لەدوای یەک لەشەڕەکان زەلیلی دەکات، و سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت، و خودای گەورە دەیەوێت بۆ ووڵاتی میسر سەرکەوتن بەدەست بهێنێ کەبۆ ئەو مافێکی ڕەوایە، میسری بەخاوەن ماڵ و عەرەب ڕازی کرد بۆ پیاوی ئەسمەر سادا، کەباوکی ئەنوەرە، بەڵام ئەو پیاویگی گونجاوە بۆ ناپاکی کردن لە (مسجد الاقصی) بەووڵاتێکی خەمبار.**

**وە لەعێراقی شامدا پیاوێکی زۆردارو دڵڕەق....و... سوفیانی، لەیەکێک لەچاوەکانی تەمبەڵیەکی**

کەم بەدی دەکرێت، وەناویشی لە (صدام) واتە بەیەکدادان هاتووە، ئەوەش (صدام)ە بۆ هەر کەسێک بەرهەڵستکاری بکات، هەموو جیهان لێی کۆبوونەوە لە(کوت) وولاتێکی بچووکە و چەورو دەولەمەندە، بەڵام (سوفیانی)یەکەی هیچی بۆ ناکات تەنها بەئیسلام نەبێت، ماڵوێرانیش بۆ ئەو کەسەیە ناپاکی بەرامبەر موحەممەدی مەهدی دەکات.

وە لەساڵەکانی هەزارو چوار سەدی کۆچی، کەمتر لە دوو یان سێ ساڵ... مەهدی ڕاستگۆ دێتە سەر دونیا، جەنگ لەگەڵ هەموو جیهان بەرپادەکات، هەموو لێی کۆدەبنەوە لەزاڵمەکان و ڕق لێگیراوان و ئەوانەی هۆکارن بۆ نیفاق و دووروویی — لەووڵاتی ئیسراو معراج لەلای چیای مەجدون، وەشاژنی دونیا و مەکربازی لێ پەیدادەبێت، وە داوێن پیسێک ناوی (ئەمریکایە) لەم ڕۆژەدا هەموو جیهان هەڵدەخەڵەتێنێ لەگومرایی و کوفردا، وە لەم ڕۆژەدا یەهودی جیهان لەبەرزترین پلەدایە، دەست بەسەر هەموو قودس و شاری پیرۆزدا دەگرن، وەهەموو وولاتیان لەدەریاو ئاسماندا دێن تەنها وولاتی بەفری تۆقێنەرو ووڵاتی گەرمی تۆقێنەر نەبێت، و مەهدی دەبینێت کەوا هەموو دونیا لەسەریدا بەفێڵ و بەد ڕەفتارە، بەڵام خودای گەورە بەفێڵی ئەوان دەزانێت و زۆر توونده، دەبێنێ هەموو دونیا موڵکی خودایە، وە چارەنووس و گەڕانەوەیان بۆ لای ئەوە، هەموو دونیا دارێکەو لق و پۆپ و ڕەگی هەیەو موڵکی خودایە، خودای گەورە بەسەربازانی خۆی کە فریشتەن تیرهاوێژی دەکات و لێیانی دەدات بەتووندترین لێدان، زەوی و دەریاو ئاسمانی بەسەریاندا دەسوتێنێ، ئاسمانیش بارانێکی زیانبەخش دەبارێنێت، و خەڵکی زەوی هەموو کافرەکانی سەرزەوی نەفرین دەکات، و خودای گەورەش مۆڵەت دەدات بەنەمان و لەناوچوونی هەموو کوفرێک)

## گەڕانەوە بۆ لای زانایانی جێ باوەڕ لەم بابەتەدا :

پێویستە لەسەر ئەو کەسەی لە ناو دڵیدا شتێک کاریتێکردووە لەم بابەتەدا باپەلەنەکات لەئاشکراکردنی پێش ئەوەی پیشانی خاوەن زانستەکان بدات، ﴿فَسْئَلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾﴾ الانبیاء/٧

**خودای گەورە دەفەرمووێت// (دەبپرسن لەخاوەن کتێبەکانی پێشوو ئەگەر ئێوە ئەم ڕاستیە نازانن (٧))**

وە دەفەرموێت ﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾﴾ الانساء/٨٣

**هەروەها دەفەرمویت // (ئەگەر بیانگێرایەتەوە بۆ پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت، یان بۆ لای کاربەدەستانێک کە لەخۆیانن، ئەوە ئەوانەی کە لەنهێنی هەواڵەکان تێدەگەن و دەکۆڵنەوە، نهێنی و ڕازەکانیان لێ دەردەهێنا، جا ئەگەر فەزڵ و چاودێری خواو رەحمەت و میهرەبانیەکەی نەبوایە شوێنی شەیتان دەکەوتن، جگە لەکەمێکتان(٨٣) )**

ئەمە ڕێگای (سـلف الصالح) پیاوچاکەکانە، وە ئەمەش لەهەواڵی ئیبن توفەیل ڕەزای خوای لێـی لێبێت هاتووە دەڵێت (لەکووفە بـووم، ووتیان: دەجال دەرکەوت! چووینەلای حوذیفەی کوڕی ئەسیر ئەو قسەی دەکرد، پێمووت: ئەو دەجالە دەرکەوتووە! ئەو ووتی: دانیشە، منیش دانیشتم، بەرپرسی کاروبارەکانی خۆی بۆ ناردم، ووتی: ئەو دەجالە دەرکەوتووە و خەڵکی کوفەش بەدرۆی دەخەنەوە، ووتی : دانیشـە ئەو دانیشـت، ئینجا هاواری کردو ووتی ئەمە درۆیەکی بۆیە کراوە، ووتمان: ئەی باوکی سـەریحە تەنها بۆ ئەوە لەلات دانیشـتووین کەوا قسـەیەکمان بۆ بکەیت، ووتی: ئەگەر لەزەمانی ئێوە دەجاڵ دەرکەووتبایە ئەوا منداڵان بەرد بارانیان دەکرد، بەڵام دەجال لەناو خەڵکی توورە لەیەکترو حەسادەت بەیەکتر دەردەکەوێت، وە لەئاییندا سادەو نەزان، وە نێوانیان خراپ بێت، دەچێتە سەر هەموو ئاوخۆرگەو دەراوێک، زەوی وەک پێستەی بەران ووشک و گرمۆڵە دەکات..))

## هەندێک خەڵک بەئارەزووی دڵی خۆیان قسە دەکەن:

ژمارەیـەک لەوانـەی لەبارەی نیشـانەکانی ڕۆژی دوای دەدوێن زۆر ئاسـانی لێدەکات، بە گێرانەوەی حەدیسەکان و قسەکانی لەبارەی نیشانەکان لەگەڵ هەموو خەڵک یان ڕووداوەکانی ئیسلام لەوانەی کەگوێیان لێ دەبێت باش تێناگەن.

لەبڕیارەکانـدا هاتـووە مەرج نیە ئەوەی شـتێک بزانێـت بیڵێت، وە نەهەموو ڕاسـتیەکیش دروسـتە بۆ بڵاوکردنەوە، بەهۆی کەمتەرخەمی و پشـت گوێ خسـتنی زاناو بیرمەندەکان، هەندێـک جار لەبـەر سـەرقاڵی و بارگرانیان، یان لەبەر خـراپ مامەلەکـردن لەگەڵیدا، یان دانەبەزیینی قسەکە لەشوێنێکی ڕاست و دروست.

لەعەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت، دەفەرمویت ((حدثوا النّاس بما تعرفون، أتحبون أن يكذب الله ورسوله؟)) (بوخاری ریوایەتی کردووە)

واتـە (ئـەو قسـانە بۆ خەڵک بکـەن کە دەیزانـن، ئایا حـەز دەکەن خـوداو پێغەمبەر ﷺ بەدرۆزنتان دابنێن؟)

لەریوایەتێکـی دیکەدا (ئەی خەڵکینە حەزدەکەن خـوداو پێغەمبەر ﷺ بەدرۆزنتان دابنێن؟

ئەوانــە بڵێن کە دەیزانن، واز لەقســەی ناشــیرین و ناپەســەند بهێنن)) (موســلیم ریوایەتی کردووە)

**ئیبن مەســعود دەفەرمووێت : ما أنت بمحدث قوماً لاتبلغه عقولهم إلا كان لبعضهم فتنة**
**واتە: (نابێت تۆ قســەیەکی نوێ بــۆ خەڵکانێک بکەیت ئەگەر پرســی بەزاناکانیان نەکەیت چونکە ئیلا دەبێتە ئاژاوەو دووبەرەکی بۆ هەندێکیان)** (موسلیم ریوایەتی کردووە)



# چەند یاسایەک بۆ دابەزاندنی دەقی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر ڕاستەقینەیی

## دەرکەوتووە

لەکاتەکانی ڕابردووو داهاتوودا هەوڵێکی زۆر دراوە لەدابەزاندنی ڕووداوەکانی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر ئەرزی واقعدا. بۆیە وام هاتە بەرچاو کە (١٠٣) ژمارە لەیاساکانی دەربارەی دابەزینی دەقی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر ڕاستیەتی دا بگوازمەوە:

### یاسای یەکەم /

***داواکارنین بەدابەزاندنی کارەساتی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، لەسەر ڕاستەقینەییدا.***

ئامادە میزاد لەخۆڕسکدا ئامادەیە بەهەموو بەڵاو کارەساتەکانی بۆ ڕۆژو حیسابی خۆی وە بۆ ڕۆژی دوایی، خۆی بە ڕووداوەکان دەبەستێتەوە کەچی خەڵکی دیکە ئەوانەی بەدوای خۆیدا دێن بەڕووداوەکان نابەستێتەوە، ئەوانەی بیروو هەست و نەستیان بۆ ڕووداوەکانی ڕابردوویان ئامادە ناکەن، ڕووداوەکانی زەمانی خۆیان گەورە دەکەن و دەیتۆقێنن، وەبەڵاو موسیبەتەکانی ئێستا گەورەترە لەبەڵاو مووسیبەتەکانی ڕابردوو، وەک شاعیر دەڵێت :

*یـا زمـان بکیـت منــه  فلما صرت فی غیره بکیت علیه*

بۆیە خوای گەورە خۆی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و پێشەکیەکانی دادەبەزێنی لەسەر ڕۆژو شەوی خۆی وە ئەوەی خۆی دەیەوێت، و ئەوەی لەمێژوودا ڕابردووە لەوشتانە گەورە ترە، لەبەر کەمی کارتێکردن لەسەریدا، یان لەئەسلدا لەبەر نەفامی و تێنەگەیشتنیدا.

موجتەهیـد و کۆشــش کاران بیانو دەهێننەوە بۆ خاوەن زانسـت و زانیاریی و ئاینخوازان لەنیشانەکانی رۆژی دوایی وە کاتی دابەزینی.
وەک چــۆن ئیمامــی عومەر خوای لێی رازی بێت ئیبن ســەیادی بەدەجـال چوواند، لەگەڵ ئامادەبوونی پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت کەوا نارەزایی لەسەری دەرنەبڕی.
بەڵام ئەگەر ئەم جۆرە ئیجتیهادە بووە هۆی لێکترازانی ریزی موسـلمانان، یان ئەگەر ئەم جـۆرە ئیتجتیهادە بووە هۆی پابەند بوونی شــەرع و پێداویسـتیەکانی هۆکاری بەڵگەبوون، لێرەدا لەئامادەمیزاد قەدەغەکراوە بەتوورە بوون و تەریقکردنەوە تەنها بەبەڵگە نەبێت، وەک پێداویسـتیەکانی شەڕو ئاژاوە یان نیشاندانی ئابڕوو بردن یان لێکترازانی ڕیزەکان، ئەمەش نابێت تەنها بەبەڵگەیەکی سەربەخۆ لەوەحی و سرووش .
هەندێـک لەچاودێـران لەڕووداوەکانی نیشـانەکانی رۆژی دوایی ئاڵـوودەو خەریک بوون بەلێکۆڵینەوەی مێژووی ئێستاو ڕابردوو، وە خۆیان خەریک دەکەن بەدابەزینی کارەساتەکان کەوا هەواڵ دەدات بەڕووداو و کاروبارەکانی دوارۆژ و نیشـانەکانی رۆژی دوایی لەســەر ڕووداوو کارەساتەکان.
بـۆ نموونــە ئەم ووتەیــەش دەخوێندرێتــەوە (( خەریکە خەڵکــی عێراق هیــچ (قفیز)[1] یان (درهەم) وەک جەزیەو خەراج نەنێرێت بۆ خەزێنەی دەوڵەتی ئیسـلام)) دەڵێن ئەم نیشانەیە لەنیشانەکانی رۆژی دواییە ئەمەش لەساڵی (١٩٩٠ز، ١٤١٠ک) روویدا، کاتێک عێراق گەمارۆی ئابووری درا لەلایەن ئەمەریکا (عەجەم).
ئەمەش ئەگەر زۆر گونجاو بێت و ڕێی تێبچێت، ئەم ڕێگایەش تەنها لەدابەزینی کارەساتەکانە لەســەر رووداوەکانی ژیان تەنها شــتێکە لەکەمتەرخەمی و هەڵخلیسکاندن، بەتایبەتی لەگەڵ پێداگیری لەسەریدا.
گەورەتـر لەمــەش دیاریکردنــی تەمەنی دونیایە لەلایــەن هەندێک زانایـان، هەندێک دەڵێن ٩٠٠ســاڵە، وەهەندێکی تر دەڵێت ١٠٠٠ ساڵە، بەپشت بەسـتن بەهەندێک لەحەدیسەکان، وە لەوانەی ناوبانگی دەرکردووە، لەم بارەیەوە ئیمامی سیوتی، وە سەخاوی و گەلێکی تر.
کەواتە..بڕیاردان لەســەر ئەم نیشــانەیە، ڕوویداوە لەساڵی ئەوەندەو ئەوەندە بە دڵنیاییەوە سەلمێنراوە، ئەمەش نابێت تەنها دەبێت لەگەڵ شەرعدا بەڕوونی و بەئاشکرایی یەکبگرێتەوە، وەک زۆر کــەس حەدیســەکانی هاتنی مەهدی لەســەر کەسـانی دیاریکـراو دادەبەزێنن، وە پێدادەگرن لەسەر ئەوەی کەفلان کەس (مەهدی)یە، ئەمەش تەنها دەبێتە هۆی ئاژاوە نانەوەو خوێن ڕشتن، و دەرچوونیشە لەسەر گوێرایەڵی و پابەند بوون.

---

١) قفیز : جۆرێکە لەپێوەرەکان، خەڵکی عێراق بەکاریان دەهێنا، هەروەها ئەمڕۆ ئێمە بەکاری دەهێنین (کیلۆگرام، ڕەتل، ئۆقە.....)

### لەنموونەیەکدا لەسەر ئەمە نووسراوە:

ئەوەی خاوەنی پەرتووکی (إســرار الساعة) باسیکردووە دەڵێت: پێش دەرکەوتنی مەهدی، دەجاڵ سەرۆکایەتی ئێران دەکات، دوایی دەرکەوت و کەئەمە محمد خاتەمییە، وەنازناوەکەی (آية الله گۆرباتشۆف)ە.
لەپەرتووکی (المسيح الدجال) دا هاتووە، پێداگیری دەکات لەوەی کە مەهدی چاوەڕوانکراو: سەددام حوسێنی سەرۆکی پێشووی عێراقە.
أمیــن محمــد جمــال لەپەرتووکەکــەی بەنــاوی (هرمجــدون)، کــەوا ســوفیانی لەهەندێک لەحەدیسەکان هاتووە دانەری پەرتووکەکە بەسەدام حوسێنی داناوە.
لەپەرتووکی (أشــراط الســاعه وهجوم الغرب) کە دانەرەکەی (فهد مســالم) و سوفیانی بە شاحوسێنی شای پێشووی ئوردونی وەسفکردووە.
ئەم پڕوپاگەندانە دروست نیە باوەڕی پێبکرێت، بەڵام ئەگەر هەموو شەرعزان و یاساناسان کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی ئەو نیشانەیە لەحەدیسدا هاتووە، ئەوا بەتەواوی هاوجووت دەبێت لەسەر ڕووداوێکی دیاریکراو، ئەم کارەش گومانی تێدانیە و ئاشکرایە، وەخراپ نیە لەدابەزینی حەدیسێک لەسەر ئەم بابەتە، لەگەڵ دابەزینی حەدیس لەسەر زۆر ڕووداوی لەم جۆرە.

### لە نموونەیەکی دیکەدا :

١. موسلیم ریوایەتی کردووە کە ئەسمای کچی ئەبوبەکر خوای لێی رازی بێت لەچیرۆکی کوژرانــی کوڕەکەی عەبدوللای کوڕی زوبەیر، کە ئەو قســە لەگەڵ حەججاجی کوڕی یوســفی سەقەفی دەکات کەوا ســەرکردەی ئەو سوپایە بوو کە عەبدوللای کوشتووە، دەڵێت ((پێغەمبەر دروودی خوای لەســەر بێت بۆ ئێمەی گێڕایەوە کە لە ناو ســەقیف دا پیــاوی درۆزن و خوێــن ڕێژ هەیە، ئێمە پیاوی درۆزنمــان تێدا بینیووە بەڵام خوێن ڕێژەکە لەحەججاج بەدەر نیە)) ووتی ((حەججاج لەلای ئەســما هەستاو نەگەڕایەوە)) نەوەوی دەڵێت (( لەبارەی درۆزنەکە مەبەستی لە (المختار بن ابی عبيدالثقفي)یە، کەوا زۆر درۆزن بوو، لە درۆیە گەورەکانی پڕوپاگاندەی ئەوەی دەکرد، کە جوبریل سەلامی خــوای لێبێت هاتۆتەلای، زانایان یەکدەنگن لەســەر ئەوەی کە مەبەســت لەدرۆزەنەکە (مختــار بن ابی عبید) و لەخوێن ڕێژەکەش (حەججاج بن یوســف)ە، خوای گەورەش زاناترە))

٢. موسـلیم لـەئـەبوهـورەیـرە ڕەزای خـوای لـەسـەر بـێت ریـوایـەتـی کــردووە کە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ( لاتقوم الساعة حتى تخرج نار من أرض الحجاز تضيء لها اعناق الإبل ببصرى) واتە: (( قیامەت هەڵناستێت تاوەکو ئاگرێک لەزەوی حیجاز دەردەچێت ملی ووشتر لەبوصرا ڕووناک دەکاتەوە)) ئەم ئاگرە دەرکەوتووە، دەڵێن سێ مانگ مایەوە، ئافرەتی شار لەبەر ڕووناکایی خوریيان دەڕست.

أبو شامە لەوەسفی سورەتی الواقعه دەڵێت ((ئەو کات شەوی چوارشەممە (٣)ی جمادی ئاخره/٦٥٤ کۆچی بوو، کە دەکاتە ڕێکەوتی ١٢٥٦/٥/٢٩ زایینی، لەشاری مەدینەی منەورە دەنگێکی زۆر گەورە پەیدابوو، پاشان لەرینەوە ئینجا زەوی دەستی بەلەرزین کرد دیوارو سەربان و دارو دەرگاکان دەهەژانەوە کات لەدوای لەکات تاوەکو رۆی هەینی لەهەمان مانگ، پاشان ئاگرێکی زۆر گەورە لە (حره) لەنزیک (بنی قریظه) دەرکەوت لەچوار دەوری خۆمان لەناومەدینە ئاگرەکەمان دەبینی، وەک ئەوەی ئاگرێکی گەورە لەلای ئێمە بێت جا ئاگرەکە شل بووەوەو توایەوە بۆ دۆڵی (شظا) بەشێوەی جۆگەی ئاو دەڕۆیشت، ئەو پریشکە ئاگرانەی دەهاوێشت وەک کۆشکێک وابوو)) (التذکرة للقرطبی ص ٥٢٧)

**نەووەی دەڵێت** : **(لەزەمانی ئێمە ئاگرێک لەمەدینە دەرکەوت لەساڵی ٦٥٤ کۆچی ئاگرێکی زۆر گەورەبوو لەتەنیشت رۆژهەڵاتی مەدینە لەپشت (الحره) )** شرح صحيح مسلم ٢٨/١٨

**حافظ بن حجر دەڵێت**: **( ئەوەی بۆم ئاشکرا بوو، ئەو ئاگرەی باسکراوە لەدەوروبەری شاری مەدینە دەرکەوتووە، کە قرطبي و ئی دیکەش تێیگەیشتوون)**

٣. ئیمامی ئەحمەد لەئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت ریوایەتی کردووە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لاتقوم الساعة حتى تظهر الفتن، ويكثر الكذب، وتتقارب الأسواق، ويتقارب الزمان، ويكثر الهرج ، قيل : وما الهرج؟ قال: القتل)) واتە: **((قیامەت هەڵناسێت تاوەکو ئاژاوەو دووبەرەکی دەردەکەوێت، وەدرۆ زۆر دەبێت، بازارەکان گەورە دەبن و لێک نزیک دەبنەوە، و کاتەکان لێک نزیک دەبێتەوەو، (الهرج) زۆر دەبێت، ووتیان: الهرج چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : زۆر بوونی کوشتن))**

**شێخ بن باز** رەحمەتی خوای لێبێت لەلێدوانەکەی لەسەر فتح الباری دەڵێت : **(نزیکترین لێکدانەوە بۆ نزیک بوونەوە کە لەحەدیسەکەدا باسکراوە بەوەی لەم سەردەمەدا ڕوودەدات لەنزیک بوونەوەی نێوان شارەکان و هەرێمەکان، وەکورت بوونەوەی کات و ماوەی نێوانیان، بەهۆی داهێنانی فڕۆکەو ئۆتۆمبێل و ئێستگەکان، وە بۆ ئەوانی دیکەش خوای گەورە زاناترە)**

## یاسای دووەم :

### مەرج نیە بەم نزیکانە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ڕووبدات لەگەڵ ئەوەش کاتێکی زۆریش هاتۆتە پێش

مەرجەکانی ڕۆژی دوایی بریتیە لەو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسەر نزیک بوونەوەی ڕوودانی، ئەگەر هاتوو ئەو نیشانەیە نزیک بێت بۆ سەرهەڵدانی یاخود دوور بێت لێی.
بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((بعثت أنا والساعة كهاتين)) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە، واتە: **(هاتنی من و رۆژی دوایی وەک ئەم دووانە واین، پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بە نێوان پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاست دەکات)** ئەمە بەڵگەیە کەوا هاتن و مردنی پێغەمبەر ﷺ نیشانەن بۆ نزیک بوونەوەو هەستانی قیامەت، وە زۆر نیشانەی تر کە لەدووایدا دێن ئاماژەن بۆ نزیکتر کەوتنەوەی ڕۆژی دوایی.

### وە دەکرێت مەرجەکانی ڕۆژی دوایی دابەش بکەین بەپێی کاتی ڕوودانی بۆ چەند بەشێک:

- ئەوەی بەتەواوی ئاشکراو روونە کەوا پێغەمبەر ﷺ، رایگەیاندووە لەهاتن و مردنی، وە دەرکەوتنی کەسانێک بۆ بانگەوازکردنی پێغەمبەرایەتی...

- لەوانە : شتە سەرەتاییەکان ڕوویداوە، هێشتاش لەزیاد بووندایە، لە نزیک کەوتنەوەی بازاڕەکان، بڵاوبوونەوەی نووسین، زۆر بوونی کووشتن.

- لەوانەی هێشتا رووی نەداوە، بێگومان ئەمەش ڕوودەدات، وەک دەرچوونی (دابة) کە گیانلەبەرێکە قسە لەگەڵ خەڵک دەکات و، هاتنی دەجال.

## یاسای سێیەم

### ترسناکی دابەزاندنی هەڵە بۆ حەدیسەکان کەباس لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەکات لەسەر ڕاستیەتی :

#### ١- ئەمە ووتەو ئاخاوتنێکە بەبێ زانست و زانیاری وە تفەنگ بەتاریکییەوە دەنێن.

ئەگەر تۆ سەپاندت کەوا ئەو نیشانەی هاتووە لەحەدیسدا لەو شت و لەوشتەی ڕوویداوە.. پێویستت بەبەڵگە یان شەرعزان یان چاودێرێک دەکات، بەڵام ئەگەر بەڵگەو دەلیل یان ئیماندارێکی ڕاستگۆ نەبوو ئەوا پێویستە بگەڕێیت بەدوای کەسێکدا کەزمانی لە کاروباری شەرعدا پاک و پاراو بێت.

### ٢- هەڵسان بەکاری ناڕەواو نامەشروع یان وازهێنان لەکاری ڕەوا.

هەندێ کەس پەرتووکێک دەخوێنێتەوە باس لەهاتنی مەهدی دەکات، بۆیە هەندێک لەخوێنەران چاوەڕوانی مەهدی دەکەن، بۆ کاتی دەرکەوتنی کاروباری خۆیان ڕێک دەخەن، هەشیانە ئەسپ و شیرو ڕم دەکڕن بۆ خۆ ئامادەکردنیان بۆ داستان و شەڕکردن بۆ ساڵانی داهاتوو.
وە هەشیانە ماڵ و منداڵی خۆیان وازدەهێنن، بەپێی ئەوەی دەجال دێت یان کاتی نزیک بوونەوەی هاتووە...وەزۆرشتی دیکە.

### ٣- ئالوودە بوون بۆ تاوانە گەورەکان وەک درۆهەڵبەستن بەدەمی خواو پێغەمبەرەکەی درودی خوای لێ بێت.

ئەگەر یەکێک بۆ نموونە باوەڕبکات کەمەبەست لەمەهدی فلانەکەس بێت، دوایی دەرکەوت کە ئەمە وانیە، کەواتە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی درۆکردن بە حەدیسەکانی هاتنی مەهدی، وەنموونەیەک وەک ئەوەی باوەڕکردن بەهەندێ نیشانە بەبێ بەڵگەیەکی تەواو و دروستی دابەزینەکەی لەسەر ڕاستەقینەیی.



# ماناى نیشانەكانى رۆژى دوایى

## نیشانەكان :

كۆی نیشـــانەیە، وەنیشانەش هێماكردنە یان ئاماژەیە، نیشانەكانی رۆژی دوایی واتە هێماو ئاماژەكانی و هۆكارەكانی، ئەو نیشانانەن كەوا لەدواییدا رۆژی دوایی سەر هەڵدەدات.

## رۆژى دوایى :

ئەوكاتەی كەوا قیامەت تێیدا هەڵدەستێت، و پێی دەوترێت رۆژی دوایی چونكە بەكت و پڕی خەڵك ڕوو بەڕووی دەبێتەوەو لەیەک كاتدا هەموو گیانلەبەرێک بەدەنگێكی گەورە دەمرن.

# بەشەکانی نیشانەکانی رۆژی دوایی

**نیشانەکانی رۆژی دوایی وە هێماکانی دابەش دەکرێت بۆ دووبەش :**

**بەشی یەکەم // نیشانە بچووکەکان ئەمە دوو جۆرە.**

### جۆری یەکەم / نیشانە دوورەکان :

ئەمانەن کەوا دەرکەوتوون و کۆتایی پێهاتووە، وە بریتیە لەنیشانە بچووکەکان، بۆ دووری کاتی ڕوودانی لەکاتی سەر هەڵدانی رۆژی دوایی، بۆ نموونە هاتنی پێغەمبەر ﷺ وە کەرت بوونــی مانــگ، وە دەرکەوتنی ئاگرێکی گەورە لەمەدینە(تەماشــای نیشــانەکانی ژمارە (١)، (١٣)، بکە)

## جۆری دووەم / دووەم نیشانە مامناوەندیەکان

ئەمانەن کەوا دەرکەوتوون بەڵام کۆتایی پێنەهاتووە بەڵکو زیاد دەکات و زۆر دەبێت، ئەمەش گەڵێک زۆرە، ئەمانەش هەر لەنیشانە بچووکەکانە کەوا دێت.
لەوانە : منداڵ لەسەر دایکی دەبێتە گەورەو سەردار وەخەڵکانی ڕووت و برسی و پێ پەتی و شوانی مەڕو بزن بوونەتە خاوەنی خانووی بەرز وە دەرکەوتنی سی کەسی دەجال کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، (تەماشای نیشانەکانی (١١)، (١٩)، (٢٠) بکە)

## بەشی دووەم // نیشانەگەورەکان

ئەمەیان ئەو نیشانانەن کە دەرکەوت رۆژی دوایی بەدوایدا دێت، ئەمانەش دە نیشانەن تاوەکو ئێستا هیچیان دەرنەکەوتوون.
**حوذەیفە** دەڵێت: (**پێغەمبەر ﷺ هاتەلامان و ئێمەش قسەمان لەگەڵ یەکتر دەکرد، فەرمووی ((ئەوە باسی چی دەکەن؟)) ووتیان : باسی رۆژی دوایی و قیامەت دەکەین، فەرمووی** ((إنها لن تقوم حتى تروا قبلها عشر آيات، فذكر)) **واتە: ((بەڕاستی قیامەت ڕوونادات تاوەکو دە نیشانە لەپێشیدا دەبینن، ئینجا باسی نیشانەکانی کرد))**

1. **دووکەڵ**
2. **دەجاڵ**
3. **ئاژەڵێکی قسەکەر (دابە)**
4. **هەڵاتنی رۆژ لە رۆژ ئاوا.**
5. **دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم علیە السلام**
6. **هاتنی یەئجوج و مەئجوج و**

### سێ ڕووچوونی زەوی

7. **رووچوونێک لەرۆژ هەڵات**
8. **رووچوونێک لەرۆژ ئاوا**
9. **روو چوونێک لەدوورگەی عەرەب**
10. **لەکۆتایی ئەمانە ئاگرێکە لەیەمەن دەردەچێت خەڵک ڕاودەنێت بۆ شوێنی کۆبوونەوەیان (موسلیم ریوایەتی کردووە)**

لەهەندێک حەدیسی تردا هاتووە باسی هاتنی مەهدی، و ڕووخانی کەعبە، وە بەرزبوونەوەی قورئان لەزەویەوە بۆ ئاسمان دەکات.

# نیشانه بچووكه‌كان

## به‌شی یه‌كه‌م / ئه‌و نیشانانه‌ی ڕوویداوه:

١. هاتنی پێغه‌مبه‌رمان ﷺ
٢. كۆچی دوایی كردنی پێغه‌مبه‌رمان ﷺ
٣. كه‌رتبوونی مانگ
٤. نه‌مانی سه‌حابه‌و پیاو چاكه‌به‌ڕێزه‌كان
٥. رزگاركردنی بیت المقدس
٦. مردنی به‌كۆمه‌ڵ و له‌ناكاو وه‌ك ئه‌و درده‌ی توشی مه‌ڕ ده‌بێت.
٧. زۆر بوونی فیتنه‌و ئاژاوه به‌هه‌موو جۆره‌كانی
٨. ده‌ركه‌وتنی كه‌ناڵه ئاسمانیه‌كان

٩ هەواڵ پێدانی پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت لەسەر رووودانی جەنگی صِفّین
١٠ دەرکەوتنی خوارج
١١ دەرچوونی دەجالە درۆزنەکان لەبانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتی.
١٢ بڵاو بوونەوەی ئەمن و ئاسایش و خۆشگوزەرانی
١٣ دەرکەوتنی ئاگر لەحیجاز
١٤ شەڕکردنی تورك
١٥ دەرکەوتنی پۆلیس وپیاوی زۆردار بەقامچی لەخەڵك دەدەن
١٦ زۆر بوونی کووشتن
١٧ بزربوونی سپاردەو بەرزبوونەوەو دەرهاتنی لەناو دڵدا
١٨ شوێنکەوتنی سوونتەکانی گەلانی ڕابردوو
١٩ منداڵ ببێتە گەورە سەردار لەسەردایکی
٢٠ دەرکەوتنی ئافرەتی ڕووت و بەرگ تەنك
٢١ خەڵکانی پێ پەتی و ڕووت وشوانی مەڕ ببنە خاوەنی کۆشك و خانووی بەرز
٢٢ سەلام کردن لەکەسی ناسیاو (سەلام کردنی تایبەت)
٢٣ بڵاو بوونەوەی بازرگانی
٢٤ بەشداری کردنی ئافرەت لەگەڵ پیاوەکەی لەبازرگانیدا

٢٥ دەست بەسەرداگرتنی هەندێك بازرگان بەسەر بازاردا

٢٦ شایەتی دانی بەدرۆ

٢٧ شاردنەوەی شایەتی دان بەحەق و ڕاستی

٢٨ دەرکەوتنی نەزانین

٢٩ زۆر بوونی ڕەزیلی و چرووکی

٣٠ پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی

٣١ دراوسێی خراپ

٣٢ دەرکەوتنی خراپەکاری

٣٣ بەناپاك دانانی پیاوی دەستپاك، وە باوەڕکردن بەپیاوی ناپاك.

٣٤ نەمانی پیاوی چاك و دەرکەوتنی کەسانی بێ نرخ.

٣٥ گوێنەدان بەچاوگەی دەستکەوتنی پارە لەحەرامی یان لەحەڵاڵی.

٣٦ وەرگرتنی دەستکەوت و غەنیمەکان لەنێو خۆیاندا.

٣٧ کاتێك ئەمانەت و سپاردە دەبێتە دەستکەوت .

٣٨ هەندێ کەسی دەوڵەمەند بەڕەزیلی زەکات دەدەن (وادەزانن زەریبە و غەرامەیە)

٣٩ فێربوونی زانست بۆ خوا نەبێت.

٤٠ گوێڕایەڵی بۆ خێزانەکەی وە سەرپێچی کردنی مافی دایك.

٤١ دانیشتن و ڕابواردن لەگەڵ برادەران و پشت گوێ خستنی

دایك و باوك

٤٢ دەنگ بەرزکردنەوە لەمزگەوتەکان.

٤٣ دەسەڵاتگرتنە دەستی کەسانی بێ نرخ لەسەر گەڵ و وولاتەکەی.

٤٤ هیچ و پووچترینیان دەبێتە سەر کردەی گەلەکەیان.

٤٥ ڕێزگرتنی پیاوێك لەترسی شەڕو زولمەکەی.

٤٦ حەڵاڵ کردنی زینا (داوێن پیسی).

٤٧ حەڵاڵکردنی ئاوریشم بۆ پیاوان.

٤٨ حەڵاڵکردنی مەی خواردنەوە.

٤٩ حەڵاڵکردنی ئامێری مۆسیقا و گۆرانی گوتن.

٥٠ تەمانناکردنی خەڵك بۆ مردن

٥١ زەمانێك دێت پیاو بەیانیان ئیماندارە وە ئێوارە دادێت کافرە.

٥٢ ڕازاندنەوەی مزگەوتەکان وە خۆپێهەڵکێشانی

٥٣ ڕازاندنەوەی ماڵان و جوانکردنی

٥٤ زۆر بوونی هەورە تریشقە لەکاتی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی.

٥٥ زۆر بوونی نووسین و بڵاو بوونەوەی

٥٦ دەستکەوتنی پارە بەزوبان و شانازی کردن بەقسە.

٥٧ بڵاو بوونەوەی کتێب جگە لەقورئان.

٥٨ زەمانێك خوێنەر تێیدا زۆر دەبێت و پیاوی تێگەیشتوو و زانا

لەئایین کەم دەبێت.

٥٩ زانست بکەوێتە دەست منداڵان

٦٠ مرنی لەناکاو

٦١ فەرمانڕەوایەتی گەمژە و کاڵفامەکان.

٦٢ نزیک بوونەوەی کاتەکان

٦٣ کەسانی نەفام لەکارو باری خەڵک قسە دەکەن.

٦٤ لەدونیادا هیچ و پووچی کوڕی هیچ و پووچ دەبێتە بەختەوەرترین کەس.

٦٥ بەکارهێنانی مزگەوتەکان بۆ کاری تایبەت نەک بۆ نوێژکردن.

٦٦ بەرزبوونەوەی مارەیی ئافرەت پاشان دابەزینی .

٦٧ بەرزبوونەوەی نرخی ئەسپ و پاشان دابەزینی نرخەکەی.

٦٨ لێک نزیکبوونەوەی بازاڕەکان.

٦٩ پەلاماردان و چاوتێبڕینی گەلان لەسەر ئومەتی ئیسلام

٧٠ یەکتر پاڵدانی خەڵک بۆ پێش نوێژی کردن.

٧١ ڕاست دەرچوونی خەونی ئیمانداران

٧٢ زۆر بوونی درۆ

٧٣ قسە لەگەڵ یەکتر نەکردن و یەکتر نەدواندن لەنێوان خەڵکدا.

٧٤ زۆر بوونی بوومەلەرزە

٧٥ زۆر بوونی ئافرەت

٧٦ کەمبووی پیاو

٧٧ دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی داوێن پیسی

٧٨ وەرگرتنی کرێ لەسەر خوێندنەوەی قورئان

٧٩ دەرکەوتنی قەڵەوی‌ەی زۆر لەنێو خەڵکدا.

٨٠ دەرکەوتنی کەسانێك شایەتی دەدەن بێ ئەوەی بیبینن یان ئاگایان لێبێت.

٨١ دەرکەوتنی قەومێك خۆیان نەزردەکەن بۆ ماڵ بەخشین بەڵام نەزرەکەیان بەجێ ناهێنن.

٨٢ بەهێز لاوز دەخوات.

٨٣ واز هێنان لەو حوکمەی کەواخوای گەورە دایبەزاندووە.

٨٤ زۆربوونی ڕۆم و کەمبوونی عەرەب.

## بەشی دووەم / ئەو نیشانانەی هێشتا ڕووینەداوە

٨٥ زۆر بوونی سەروەت وسامان لەنێوان خەڵکدا

٨٦ دەرکەوتنی گەنجینەو ئاڵتوونەکە لەناو زەویدا

٨٧ دەرکەوتنی (المسخ) شێوە گۆڕین

٨٨ دەرکەوتنی رۆچوونی زەوی

٨٩ بەرد بارانکردن

٩٠ بارانێك ئەومالأنەی لەقورو بەرد دروستکراوە لێ دەربازنابێت

٩١ لەئاسمان باران دەبارێت بەڵام لەزەویدا هیچ شتێك شین نابێت.

٩٢ فیتنەی بەهیلاك چوونی عەرەب

٩٣ قسە کردنی دارو درەخت سەرکەوتنە بۆ موسلمانان

٩٤ قسەکردنی بەرد سەرکەوتنە بۆ موسلمانان

٩٥ شەڕکردنی موسلمانان لەگەڵ جولەکە

٩٦ ئاوی فورات چیایەك ئاڵتوونی تێدا دەردەکەوێت

٩٧ زەمانێك دێت پیاو دادەمێنێت لەنێوان هەلبژاردنی نەکردن و کردنی ئیشی خراپە.

٩٨ گەڕانەوەی دوورگەی عەرەب بەباخچەو ڕووبار.

٩٩ دەرکەوتنی فیتنەی (الاخلاس)

١٠٠ دەرکەوتنی فیتنەی (السراء)

١٠١ دەرکەوتنی فیتنەی (الدهیماء)

١٠٢ زەمانێك دادێت بردنی سووجدەیەك یەکسانە بەدونیاو ئەوەی تیایەتی.

١٠٣ گەورە بوونی مانگ

١٠٤ زەمانێك دادێت کەس نامێنێت تەنها دەبێت بگاتە شام.

١٠٥ داستانی گەورە لەنێوان موسلمانان و ڕۆمەکان

١٠٦ رزگارکردنی قوستەنتینیە (ئەستەمبۆل)

١٠٧ میرات دابەش ناکرێت.

١٠٨ خەڵك دڵخۆش نابن بە دەستکەوتەکان

١٠٩ گەڕانەوەی خەڵك بۆ چەك و سواربووە کۆنەکان.

١١٠ ئاوەدانکردنەوەی بیت المقدس

١١١ وێـران بـوونـی مەدیـنە و چـۆڵ بـوونـی لەدانیـشتـوان و میواندااران

١١٢ مەدینە پیاو خراپان لەخۆی دەردەخـات وەك چۆن ئاسنی ئاگراوی پیسی ئاسن لادەبات.

١١٣ نەمانی چیا لەجێگای خۆیان

١١٤ دەرکەوتنی پیاوێك لەقەحتان خەڵکی گوێڕالی دەبن.

١١٥ دەرکەوتنی پیاوێك پێی دەڵێن جەهجاە.

١١٦ قسەکردنی دەرندەو بێ گیانەکان لەگەڵ مرڕڤ

١١٧ قسەکردنی جێ دەستی قامچی مرۆڤ

١١٨ قسەکردنی قەیتانی نەعل

١١٩ هەواڵ پێدانی ڕانی مرۆڤ بەوەی کەبەسەر ماڵ و منداڵیدا هاتووە

١٢٠ قیامەت هەڵناستێت تاوەکو ئیسلام بەرەو نەمان و پووکانەوە دەچێت.

١٢١ بەرزبوونەوە و نەمانی قورئان لەناوسنگی خەڵکیدا.

١٢٢ سوپایەك كەعبە داگیر دەكات لەسەرەتاوە تادواییەكەی رۆدەچێت

١٢٣ وازهێنانی حەج کردن بۆ ماڵی خودا

١٢٤ گەڕانەوەی هەندێك هۆزی عەرەب بۆ پەرستنی بت و سەنەم

١٢٥ لەناوچوونی هۆزی قورەیش

١٢٦ رووخاندنی كەعبە لەسەر دەستی پیاوێكی حەبەشی

١٢٧ هەڵکردنی بایەکی فێنك بۆ گیانکێشانی ئیمانداران

١٢٨ بەرزبوونەوەی بیناکانی مەککە

١٢٩ نەفرەت کردنی دوا ئوممەت لەئوممەتی پێش خۆی

١٣٠ سواربووە نوێیەکان ... ئۆتۆمبێل

١٣١ دەرکەوتنی مەهدی.






## پێشەکی

نیشـــانـه بچووکەکـان و گــەورەکـــانی رۆژی دوایــی بەرەو پێش هـاتوون، جیاوازی نێوانیان ئەوەیە نیشـــانە گەورەکان کاتێکی نزیکی ماوە بۆ هەڵســـانی قیامەت، و کاریگەریەکی زۆر گەورەی هەیە، وە هەموو خەڵکی هەستی پێدەکات، بەڵام نیشانە بچووکەکان کات لەدوای کات بەرەو پێشەوە دەچێت، لەشوێنێک ڕوودەدات و لەشوێنێکی تر روونادات، هەندێک هۆزو گەل هەستی پێدەکەن وهەندێکیان هەستی پێناکەن.

لێرەدا دەســتپێدەکەین بەباســکردنی نیشـــانە بچووکەکان، ئەمانە لەئایەت و حەدیســەکاندا هاتووەو چەســپاوە، لەدووری و دروســتی حەدیسەکاندا ســەلمێنراوە، وە شوێنەوارەکانی جێگیرکراوە.

# ١

# ڕەوانە کردن و هاتنی پێغەمبەرمان 

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە هاتنی ئەو بەڵگەو نیشانەیە لەسەر نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی، ئەمەش یەکەم نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دواییە.

لەسەهلی کوڕی سەعد ڕەزای خوای لێبێت ووتی : پێغەمبەرم ﷺ بینی بەهەردوو پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی شایەتمان ئیشارەتی دەدا دەیفەرموو : ((بُعِثت والساعة كهاتين)) **واتە: ((هاتنی من و قیامەت وەک و ئەم دووانەیە ))** موسلیم و بوخاری ریوایەتیان کردووە.

وەهەروەها دەیفەرموو : ((بُعِثت في نسم الساعة )) **واتە: (( من ڕەوانە کراوم لەگەڵ سەرەتای شنەبای قیامەتدا))** حاکم ریوایەتی کردووە.

**قرطبي** دەڵێت : **(یەکەمین پێغەمبەرە درووودی خوای لەسەر بێت چونکە پێغەمبەری ئاخیر زەمانە، هاتووە کەوا لەنێوان ئەوو نێوان قیامەتدا هیچ پێغەمبەرێک نیە )** (التذكره للقرطبي /٧١٠)



## ٢

# مردنی پێغەمبەرمان



مردنـی پێغەمبەر ﷺ کارەسـاتێکی گەورەبوو، ئەمەش یەکەمین نیشـانەکانی نزیک بوونەوەی ڕۆژی دواییـە، عەوفـی کوڕی مالیک دەفەرموێت (لەغەزوی تەبووکـدا، لەکاتێکدا لەقوبەی ئەدەم بوو- واتە: لەناو خێوەتێک بوو کەلەپێستە دروستکرابوو)، هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((أعدد ستا بين يدي الساعة: موتي، ثم فتح بيت المقدس، ثم موتان يأخذ فيكم كقعاص الغنم، ثـم استـفاضة المال حتى يعطى الرجل مائة دينار فيظل سـاخطا، ثـم فتنة لايبقى بيت من العـرب إلا دخلته، ثم هدنة تكون بينكم وبين بـني الأصفر، فيغدرون فيأتونكم تحت ثمانين غاية تحت كل غاية اثنا عشر ألفا ))




**واتـە: ((شـەش ڕووداو بژمێـرە پێـش هاتنـی قیامـەت : مردنـی مـن، ڕزگارکردنـی بیـت المقدس، پاشـان مردنی بەکۆمەڵ لەنێوانتان ڕوودەدات وەک دەردە ئـاژەڵ وایە، پاشان زۆر بوونی سەروەت و سـامان تاوەکـو وای لێدێـت دەتەوێت سەد دینار بدەیتە پیاوێک لێت توورە دەبێت – واتە پارە لای خەڵـک ئەوەنـدە زۆر دەبێـت هەتا پیاوێک نادۆزیتەوە دڵی خۆش بێت تەنانەت بەهەزارەها دیناریش – پاشان فیتنە و ئاشووبێک دێت هیچماڵێکی عەرەب نامێنێت ئیـلا دەبێـت بچێتە ناوی، پاشـان ڕێککەوتنامەیـەک لەنێوان ئێوەو بنـی الاصفر (ڕۆمەکان) مۆردەکرێت، جا ئەوان زوڵمتان لێ دەکەن و ڕێککەوتنامەکە دەشکێنن و لەژێر هەشتا ئاڵادا هێرشـتان بۆ دەهێنن لەژێر هەر ئاڵایەک دوازدە هەزار شـەڕکەر هەیە))** بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

بێگومـان مردنـی پێغەمبـەر ﷺ لەگەورەترین کارەسـات و ناخۆشـیەکان بوو کەوا تووشـی موسلمانەکان بوو، لەپێش چاوی سەحابەکان، مەدینە تاریک داهات کاتێک پێغەمبەر وەفاتی کرد.

بەمردنـی پێغەمبـەر دروودی خـوای لەسـەر بێت لەئاسـماندا سـروش پچـڕاو هیچی تر دانەبـەزی، و ئەمـەش یەکـەم دەرکەوتنی فتنەو ئـاژاوە بوو کەوا هەندێ عـەرەب لەئایینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە.

# ٣

# کەرتبوونی مانگ

خـودای گـەورە دەفـەرمـوویـت : ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ۝٢ ﴾ القمر/١-٢ **واتە// (ڕۆژی قیامەت نزیک بۆتەوەو مانگیش لەت بوو خۆ ئەگەر ئەوانە هەر موعجیزەو بەڵگەیەک ببینن پشت هەڵدەکەن و دەڵێن : ئەمە جادوویەکی بەردەوامە )**


وێنەیەك كەوا كەشتیە ئاسمانیەكان بلاوی كردۆتەوە وێنەی لەت بوونێكی ئاشكراو روون لەناوەراستی مانگ پیشان دەدات

**حافظ بن كثیر** دەڵێت: **( ئەمە لەزەمانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت روویداوە، کەوا لەحەدیسە یەک لەدوای یەکەکاندا هاتووە بەپاڵشتی ئیسنادە سەحیحەکان، ئەم کارەش بەیەکدەنگی لەنێوان زاناکاندا ڕێکەوتوون کەوا لەتبوونی مانگ لەسەردەمی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت روویداوە، وەئەمەش یەکێکە لەموعجیزە هەرە گەورە بریقەدارەکان)**

**ئەنەس** ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت :**(خەڵکی مەککە پرسیاریان کرد لەپێغەمبەر ﷺ کەوا نیشانەیەکیان پێ نیشان بدات، ئەویش کەرتبوونی مانگی پێ نیشاندان)**

**وە عبداللەی کوڕی مسعود** ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : **(کاتێک ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووین دروودی خوای لەسەر بێت لە (منى) مانگ دزری تێکەوت و بووبە دوو کەرتەوە، کەرتێکیان کەوتە پشت چیاکەوەو کەرتێکیشیان لەخوارووی ئەودا بوو، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی: ((ببینن ))** متفق علیه




## ئیبنو عەباس ڕەزای خوای لەسەر بێت

دەفەرموێت دەفەرموێت (کافرەکان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوەو ووتیان: ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت مانگمان بۆ بکە بەدوو کەرت، نیوەی لەسەر ابی قبیس بێت، وە نیوەکەی تر لەسەر قعیقعان بێت، ئەو کاتە شەو بەدر بوو، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت لەخودای گەورە داوای کرد ئەوەی دەیەوێت بۆی بکات، بەویستی خوا مانگ بوو بەدووکەرت، نیوەی لەسەر ابی قبیس، وە نیوەکەی تر لەسەر قعیقعان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((بیبینن)) ابو نعیم ریوایەتی کردووە.



مزگەوتی کەعبەی پیرۆز لەدواوە چیای ئەبی قبیس دەردەکەوێت

٤

# نەمانی سەحابە بەڕێزەکان ڕەزای خوایان لەسەر بێت

هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ چاکترین پیاوی ئەم ئومەتەن لەدوای پێغەمبەرمان دروودی خوای لەسەر بێت، لەحەدیسی ابی موسی کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (( النجوم أمنة للسماء ، فإذا ذهبت النجوم أتى السماء ما توعد ، وأنا أمنة لأصحابي ، فإذا ذهبت أتى أصحابي ما يوعدون ، وأصحابي أمنة لأمتي ، فإذا ذهب أصحابي أتى أمتي ما يوعدون ))
**واتە: (( ئەستێرەکان پارێزەرن بۆ ئاسمان جاکە ئەستێرەکان ڕۆیشتن و نەمان ئەو بەڵێنە دێت کە بەئاسمان دراوە، منیش پارێزەرم بۆ هاوەڵان جا کە ڕۆیشتم (مردم) ئەو بەڵێنەدێت کە بەهاوەلەکانم دراوە،وەهاوەڵەکانیشم پارێزەرن بۆ ئوممەتەکەم جاکە هاوەڵەکانم نەمان ئەو پەیمانە دێت کەبەئوممەتەکەم دراوە))** موسلیم ریوایەتی کردووە.



## لەم فەرموودەدا :

- سەدەی ڕۆیشتنی سەحابەکانە (ڕەزای خوایان لێبێت)، بەڕۆیشتنی دوو نیشانە لەڕۆژی دوایی، ڕۆیشتن و لەناو چوونی ئەستێرەکان، وە دابەزینی ئەستێرە کلکدارەکان، و مردنی پێغەمبەر ﷺ.

- ئەمەش چەسپاوە لەحەدیسەکان کەوا پیاوچاکان یەک بەدوای یەکدا دەڕۆن و قیامەتیش هەڵدەستێت لەسەر خراپترین کەسەکان.

٥

# رزگارکردنی بیت المقدس

کاتێک پێغەمبەر ﷺ هات، بیت المقدس لەژێر زەبرووزەنگی رۆمەکاندا بوو، رۆمەکانیش دەوڵەتێکی بەهێزو بەتوانابوون، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت موژدەی رزگارکردنی بیت المقدسی دا، ئەمەشی ژمارد بە نیشانەکانی رۆژی دوایی، کەلەحەدیسی عەوفی کوڕی مالیک دا هاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((أعدد ستا بين يدي الساعة: وذكر منها فتح بيت المقدس )) واتە: **((شەش رووداو بژمێرە لەنیشانەکانی هاتنی رۆژی دوایی .....)) وە یەکێک لەمانە ((رزگار کردنی بیت المقدسە))** بوخاری ریوایەتی کردووە



مزگەوتی ئەقسا

ئەوە بوو بیت المقدس لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب رەزای خوای لێبێت رزگارکرا لەساڵی (١٦کۆچی - ٦٣٧زایینی)، وە لەکوفرو بێباوەڕەکان پاکی کردەوەو مزگەوتێکی تیا دروست کرد.

بیت المقدس دووجار رزگار کراوە جارێکیان لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب رەزای خوای لێبێت، وە جارێکیش لەسەردەمی دەوڵەتی ئەیوبیەکان، سەلاحەدینی ئەیوبی - رەحمەتی خوای لێبێت - لەساڵی (٥٨٣ کۆچی - ١١٨٧ زاینی ) رزگاری کرد.

بەیارمەتی خودای گەورەو میهرەبان قودس جارێکی تریش لەسەر دەستی کۆمەڵێکی ئیماندار رزگار دەکرێتەوە، هەتاکو دارو بەرد قسەدەکەن و دەڵێن (ئەی موسلمان ئەی بەندەی خودا، ئەمە جوولەکەیە لەپشت من خۆی حەشار داوە وەرە بیکوژە) موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەدواییدا باسی هەندێک شەڕ لەنێوان موسڵمانان و جولەکەدەکەین کەلە دەرورو بەری قودس ڕوویداوە . (تەماشای نیشانە ژمارە (٩٥)بکە لەنیشانە بچووکەکان)

٦

# مردنی بەکۆمەڵ وەک دەردی مەڕ

ئەمەش لەنیشـــانەکانی رۆژی دواییە، کەمردنێکی زۆر و بەکۆمەڵە، وەک ئەوە وایە دەردێک لەناوتـــان بڵاوبێتـــەوە کۆمەڵ کۆمـــەڵ خەڵک دەمرێـــت، وە دەڵێن ئەمە روویـــداوە لەتاعونی عمـــواس، وەتاعـــون بریتیە لەدوومەڵ یان ئاوســـان و کیس کردن لەلەشـــدا بەدیار دەکەوێت لەگەڵ سووتانەوەیەکی تووندو زۆر بەئازار، ئەمەش نەخۆشیەکی زۆر کوشندەیە.

عمواس : شارۆچکەیەکە لەفەلەستین نزیک بیت المقدس.




لەعەوفی کوڕی مالیک هاتووە پێغەمبـــەر ﷺ دەفەرموێـــت ((أعدد ســـتا بين يدي الساعة: وذكر فيهـــا موتان يأخذ فيكم كقعاص الغنم)) **واتە: ((شەش رووداو دەژمێرم .. باســـی کرد لەوانـــە دوو دەردی کـــوژەر کەبکەوێتـــە ناوتانـــەوە وەک دەردی مـــەڕ وایـــە))** بوخـــاری ریوایەتی کردووە.

ئـــەم ڕووداوە لەســـەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لـێ بێت روویـــدا، دوای ڕزگار کردنـــی قودس لەســـاڵی (١٦ کۆچـــی) نەخۆشـــی تاعون بڵاوبـــووەوە، ئەمەش لەســـاڵی (١٨ کۆچـــی) – لە خاکی شـــام بووە هۆی مردنی بیست و پێنج هەزار کەسی موسڵمان.




شوێنی گوندی عەمواس

بەهـــۆی ئەم پەیمانەوە کۆمەڵێک لەســـەحابە بەڕێزەکان مـــردن، لەنێوانیاندا، معازی کوری جەبـــەل، و ئەبـــو عوبەیـــدە، وشـــەرحەبیلی کوری حەســـنە، والفضلی کوڕی عباســـی کوڕی

عبدالمطلب وە زۆری تریش خوالێیان ڕازی بێت.
دەردەمەڕ دەردێکی کوشندەیە، لەلووتدا شتێک دێتە خوارەوە، لەناکاو دەمرێت جا پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێت ئەمەی شوبهاندووە بە دەردە مەڕ چونکە تاعوون سوتانەوە لەلاشە پەیدا دەکات و ئاویشی لێ دەچۆڕێت، پاشان تووشبووەکە پێیەوە دەمرێت.

٧

# زۆر بوونی دەرکەوتنی فیتنەو ئاژاوە، بەهەموو جۆرەکانی

ئەمەش لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە کە لەم سەردەمەدا بەڕوونی دەستی پێکردووە، وەمرۆڤ دەورە دراوە بەهەموو جۆرەکانی فیتنەو ئاژاوە.
فیتنەی سەیرکردنی شتی حەرام لەو ماوەیەی کە لەکەناڵە ئاسمانیەکان و گۆڤارەکان پیشان دەدرێت و بڵاودەکرێتەوە، وەلەسایتەکانی ئەنتەرنێت، ئەو وێنەو گرتە ڤیدیۆییانەی کە لەمۆبایلەکان بڵاودەکرێتەوە، هەرکەسێ ئەم جۆرە فیتنەو ئاژاوانە واز لێبێنێت ئەوا ڕزگاری دەبێت لەسزاو لەو فیتنانەی تووشی ئادەمیزاد دەبێتەوە، وە خودای گەورەش شیرینی ئیمانی پێدە بەخشێت لەناو دڵیدا.




فیتنەی پارەو پوولی حەرام، وەک پارەی سووخۆری، وبەرتیل وەرگرتن، و فرۆشتنی کەل و پەلە حەرامەکان وەک عارەق و جل و بەرگی حەرام و شتی دیکە.
وە خواردنی ماڵی حەرام خودای گەورە دوعاکەی گیراناکات و پەیمانیشی داوە بەسزادان، وە فیتنەی جل و بەرگی حەرام چ پیاو بێت چ ئافرەت.

وە زۆری تیا کەوتنی خەڵک لەفیتنەو ئاژاوە، تاوەکو وای لێدێت پاک و بێگەرد نامۆ بێت لەنێوانیان.

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی هاتنی فیتنەو ئاژاوەی گەورەی داوە کەوا خۆی حەشار داوە لەسەر موسڵمانی ڕاست و، کاتێک ئاشکرا دەبێت، ئیماندارەکە دەڵێت: ئەو فیتنەیە دەبووە هۆی لەناو چوونم پاشان لەسەری لادەچێت، ئینجا فیتنەو بەڵایەکی تری بۆ دێت.

لەئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێت دەڵێت پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((بادروا بالأعمال فتنا كقطع الليل المظلم ، يصبح الرجل مؤمنا ويمسي كافرا ، أو يمسي مؤمنا ويصبح كافرا ، يبيع دينه بعرض من الدنيا)) واتە: **((پەلە بکەن لەکردەوەی چاکە بەر لەوەی فیتنە بێ وەک پارچە شەوی تاریک وایە بگاتە سەرتان، دەگاتە ئەو ئاستەی پیاو بەیانی ئیماندارە، کەچی ئێوارە دەکاتەوە بەکافری، یان ئێوارە دەکاتەوە بەئیمانداری و، بەیانی دەکاتەوە بەکافری دینەکەی دەفرۆشێت بە کەمێک ماڵی دونیا))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

## ماناى حەدیسەکە :

دەستپێشخەری بۆ پەلەکردن لەئەنجامدانی کردەوەی چاکە پێش ئەوەی ئەو فیتنەو ئاژاوانە تووشمان بێت و لەسەرمان کەڵەکە بێت و خۆمانی پێوە خەریک بکەین، وەک چۆن پارچە شەوی تاریک لەسەریەک کەڵەکە دەبن بەبێ مانگەشەو.

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت ئەم فیتنەو ئاژاوەی بەجۆرێک وەسف کردووە، وەک ئەوە وایە پیاو ئێوارە بەبڕواداری بکاتەوەو پاشان بەیانیەکەی بەکافری، وە بەپێچەوانەوە، ئەمەش لەگەورەیی فیتنەکەیە، مرۆڤ لەیەک ڕۆژدا وەردەگەڕێت بەو جۆرەوەرگەڕانە.



# ٨

# دەرکەوتنی کەناڵە ئاسمانیەکان

لەئاسمانی ئەمڕۆدا نزیکەی سێزدە هەزار کەناڵی ئاسمانی مەلەدەکەن و دەسوڕێنەوە، تەنها فیتنەو ئاژاوەی تیایە، جا ئەمە نیشانەیە بۆ فیتنە لەحەدیسەکانی ڕابردوو بە گشتی ((بادروا بالأعمال فتنا كقطع الليل ...)) واتە: **((دەستپێشخەری بکەن لەکاری کردەوەی چاکە لەفیتنەیەک وەک پارچە شەوێکی تاریک وایە...))** ئەمەش نیشانەیە بۆ فیتنەی کەناڵەکان و شەڕەکەی .




ابن ابی شیبە لە (مصنف) نوسراوەکەیدا بەسەنەدێکی سەحیح ڕیوایەت دەکات لەحذیفە بن الیمان ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت : ((خەریکە لەئاسماندا شەڕێک بەسەرتاندا بڕژێت تاوەکو دەگاتە (الفیافی)، ووتی ئەی باوکی عەبدوللا فیافی چیە؟ ووتی: زەوی چۆل و بیابان)

عەرەب ووشەی (السماء) بۆ ئەوە دەردەبڕن کەلەسەرووی ئادەمیزادە وەبێت. تەلەفزیۆنەکانی ئەمڕۆش پێشوازی دەکات لەو فیتنەوگالتە بازیەی کە مانگە دەستکردەکان بەسەریاندا دەبارێنێت، تاوەکو خێوەتەکانی چۆڵ و بیابانەکانیش لەم فیتنەیە بێبەش نین و وەری دەگرن.



٩

# هەواڵ پێداني پێغەمبەر ﷺ لەسەر رووداني جەنگى صفين




شوێنی جەنگی سەفین

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە کە وا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بە ڕووداني شەڕو جەنگ، جا لەنێوان موسلمان و کافرەکان بێت، یان لەنێوان موسڵمانان خۆیان بێت، لەمانەش : جەنگی صفين، ئەم شەڕە ڕوویدا لەنێوان علی و معاويه پاش شەهيدكردنى عوسمان رەزای خوالی لێ بێت سالی (٣٦کۆچی) ئەمەش لەنیشانەکانی رۆژی دواییە.

لەئەبی هورەیرە رەزای خوالی بێت دەڵێت پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویێت: ((لاتقوم الساعة حتى تقتتل فئتان عظيمتان، يكون بينهما مقتلة عظيمة، و دعواهما واحدة)) واتە: **((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو دوو کۆمەڵی گەورە شەڕ لەگەڵ یەکتردادەکەن، کوشتارێکی زۆر گەورە لەنێوانیاندا ڕوودەدات، داواکانیشیان یەکە))** متفق عليه.

## باسکردنی هەڵوێستی أهل السنه لە فتنەو ناژاوەی نێوان سەحابەکان

ناگاداری گرنگ

سەحابەکان (رەزای خوایان لێبێت) پێغەمبەر نەبوون بەڵکو مرۆڤێکی ئاسایی بوون، ئەوەی لەسەحابەیەک ڕوودەدات لەتەواوی خەڵکیشدا ڕوودەدات لەکۆششکردن و هەڵە کردن و ناکۆکی بەڵکو - شەرکردنیش - وە أهل السنه بەگشتی کۆکن لەسەر ئەوەی سەحابە بێتاوانترین و چاکترین و نزیکترینیان بۆ باوەڕهێنان و ڕێگای راستی پێغەمبەر درووی خوای لەسەر بێت وە دەست هەڵگرتن و خۆگرتن لەوکاتەی شەڕێک لەنێوان سەحابەکان ڕوودەدات، وە بێدەنگی لێکردن لەوەی لەنێوانیاندا ڕوویدا لەناکۆکی، وەگەورەنەکردن و لێکۆڵینەوە لەبارەی ناکۆکیەکانیان، یان بڵاوکردنەوە لەنێوان خەڵکدا بەگشتی، لەوانەیە لەشوێنەوارێکی خراپ لەورووژاندنی فیتنەیەک یان غیرەکردنێک بێت، یان تێگەیشتنێکی هەڵەبێت.

وە ڕێبازی تیپی ڕزگارکەر لە اهل السنه والجماعه، بریتیە لەدەست هەڵگرتن لەوەی لەنێوانیان ڕوویداوە خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت

# ١٠
# دەرکەوتنی خەوارج (هەڵگەڕاوەکان)

لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەرچوونی هەندێک تیپ وفیرقەن کەجیاوازو ناکۆکن بەپەیرەوو بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ وەسەحابە بەڕێزەکان وەلەمانەش تیپ و کۆمەڵەی خەواریجەکانن، ئەمانە هۆزێک بوون لەکۆمەڵەی عەلی ڕەزای خوای لێ بێت، شەڕیان لەگەڵیدا دەکرد، پاشان لەژێر ئەمرو فەرمانی دەرچوون، دوای کێشەی حوکم کردن لەنێوان عەلی و معاویە ڕەزای خوای لێ بێت، وە لەئیمامی عەلی جودا بوونەوە چوونە گوندێک نزیکی کووفە بەناوی (حەروراء).



## لەبیرو باوەڕەکانیان :

١. بەکافر دانانی ئەو موسڵمانانەی گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن وەک (داوێن پیسی و، مەی خواردنەوە،....) ئەوانە بەنەمری لەئاگردا دەمێننەوە.. ئەمەش گومڕاییەکی ئاشکرایە، ڕاستیەکەی کاتێک موسڵمانێک گوناهێکی گەورە ئەنجام دەدات ئەم گوناهە گەورانە موسڵمان کافرناکات، بەڵام دەبێتە مرۆڤێکی گوناهکار بەکردەوە، وەپێویستە لەسەری تەوبە بکات وازبێنێت لەسەرپێچیەکەی.
٢. بەکافر دانانی عەلی و معاویە – خوالێیان ڕازی بێت – وە زۆر لەو سەحابانەی بە حوکمی ئەوان ڕازی بوون خواله هەموویان ڕازی بێت.
٣. حوکمدانی داوێن پیس و گوناهکاران بەدەرچوون لەدین ئەوانەی ئیسپات نەبووە کەوا کەوتوونەتە ناو کوفر.

بانگەشەی زانست دەکەن، خۆیان ماندوو دەکەن بەخواپەرستی، وەحوکمەکانی قورئان بەنەزان دەزانن، لەوانە، ذو الخويضرة، کە پێغەمبەر ﷺ، لەبارەیەوە دەفەرموێت ((يمْرُقون من الدين كما يمْرُق السهم من الرَّميَّة)) **واتە: ((لەدین دەردەچن وەک چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت))** لەم بارەیەوە:

ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبیت دەلێت : لەکاتێکدا ئێمە لەخزمەتی پێغەمبەر ﷺ دابووین دەستکەوتەکانی بەسەر موجاهیدەکان دابەش دەکرد، ذو الخويضره کابرایەک بوو لە

بەنــی تەمیــم هات و ووتی (ئەی پێغەمبەری خوا ڕاســت و عادل بــە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:
**(( قور بەســەرت جاکێ عادل دەبێت ئەگەر من عادل نەبم وە فێڵبازو زەرەرمەند دەبووی ئەگەر عــادل نەبــم)) جا عومەری کوڕی خەتتاب فەرمووی (ئــەی پێغەمبەری خودا ڕێگەم بدە با لەملی بــدەم) پێغەمبــەر ﷺ فەرمــووی : ((وازی لێبێنــە، ئەمە کۆمەڵێکــی لەگەڵدایە هێنــدە نوێژکەرو ڕۆژوو گــرن، نوێــژو ڕۆژی ئێوە بەکەمتر دەزانن لەچاو نوێژو ڕۆژووی ئەوان، قورئان دەخوێنن بــەڵام لەگەروویــان ناچێتە ناو دڵیــان وە لەدین دەردەچن وەک چۆن تیر لەکــەوان دەردەچێت.. نیشانەکەشــیان ئەوەیە پیاوێکی ڕەشــیان لەگەڵدایە، قۆڵێکی وەک مەمکــی ئافرەت وایە یان وەک پارچــە گۆشــتێک وایە دەلەرێتەوە لەکاتێکــدا دەردەچن کە ناکۆکــی و پەرتەوازەیی لەناو خەڵکدا هەیە))** متنف علیە.

لەعەبدوڵــلای کوڕی مەســعود ڕەزای خوای لەســەر بێت دەڵێت : پێغەمبــەر ﷺ دەفەرموێت:
((یخــرج آخر الزمان قوم أحداث الأســنان، ســفهاء الأحــلام، یقرؤن القرآن لایجــاوز تراقیهم، یقولــون مــن قــول خــیر البریــة، یمرقون مــن الدیــن کما یمــرق في الســهم مــن الرمیة))
واتە: **((لەئاخیری زەماندا کۆمەڵێ پەیدا دەبن بەتەمەن بچووکن، کاڵفامن، قورئان دەخوێنن بەڵام تێناگــەن و لەگەروویان ناچێتە خوارەوە، لەدیــن دەردەچن وەک چۆن تیر لەکەوان دەردەچێت))** متفق علیە.

## سەرەتای دەرکەوتنی خەوارج

دوای کۆتایــی هاتنــی جەنگــی صفین...وەرێکەوتی خەڵکی شــام و عێراق لەســەر حوکم کردن لەنێوان هەردوو کۆمەڵدا، و لەکاتی گەڕانەوەی عەلی ڕەزای خوای لێبیت، بۆ کووفە خەوارجەکان لێــی جــودا بوونەوە، لەســووپاکەیدا ژمارەیان هەشــت هەزار کەس بوو، هەندێک دەڵێن شــازدە هەزار کەس بوون، دابەزین بۆ حروراء)

جا ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت ئیبن عەباســی نارده لایان قســەی لەگەڵدا کردن و هەندێک لەخوارجــەکان لەگەڵیدا گەڕانەوە و هاتنەوە ژێر فەرمانڕەوایی خەلیفەی موســڵمانان ئیمام عەلی ڕەزای خــوای لێبیت، وە هەندێکیشــیان لەنــاو گومڕایی مانەوە، ئینجا ئیمــام عەلی ڕەزای خوای لێبێــت، لەمزگەوتی کووفە ووتاری بۆ خوێندنەوە، لەنــاکاو لەقوژبنەکانی مزگەوت هاواریان کرد (لاحکــم الا لله)، هەروەها ووتیان تۆ هاوبەشــیت بۆ خــودا پەیدا کردووە. بەبڕیاری مرۆڤ کارت کردووەو بەقورئان حوکم ناکەیت.

جا ئیمام عەلی ڕەزای خوای لێبێت پێی ووتن : ((ئێوە سێ شتان لەسەر ئێمەیە، قەدەغەتان ناکەین بێنە ناو مزگەوتەکان، وە لەدەســتکەوت و غەنیمەتدا بێ بەشــتان ناکەین، و دەستپێشخەرنابین لە شەڕ کردن لەگەڵتان تا ئەوکاتەی فەسادتتان پەیدا نەکردووە.

پاشــان ئەمانە کۆبوونەوە، ئەو موسڵمانەی بەلایاندا تێدەپەڕی دەیانکووشت، پاشان عەبدوڵلای کوڕی خەبابی کوڕی ئەرەت کەیەکێکە لەسەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ کووشتیان، وسکی خێزانیان هەڵدڕی، کاتێک عەلی پێی زای پرســیاری لێکردن، کێ ئەوانەی کووشت؟ خەوارجەکان وەڵامیان دایەوە: ئێمە هەموومان کووشتمان، ئینجا عەلی ڕەزای خوای لێبێت خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕکردن لەگەڵیاندا لەشوێنێک پێیان گەیشتن بەناوی النهروان بەتەواوی تێکی شکاندن.

# ١١

# دەرکەوتنی دەجالە درۆزنەکان بۆ بانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتی

لەنیشانەو ئاماژەکانی رۆژی دوایی دەرکەوتنی دەجالە درۆزنەکانە، ئەوانە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، جا بەکردەوە خراپ و ناشیرینەکانیان فتنەو ئاژاوە دەورووژێنن، هەروەها پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی داوە کەژمارەی ئەو دەجالانە نزیکە لەسی کەس.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لاتقوم الساعة حتى يبعث دجالون كذابون قريب من ثلاثين كلهم يزعن انه رسول الله)) واتە: **((قیامەت هەڵناسێت تاوەکو نزیکەی سی دەجالی درۆزن سەر هەڵدەدەن هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوان ))** بوخاری ریوایەتی کردووە.

ئەم نیشانەیە ڕوویداوەو لەنیشانەکانی رۆژی دواییە، وە زۆرێک لەم بانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتی لەکۆن و ئێستا دەرکەوتوون، بەدووریش نازانرێ کەوا چەند دەجالێکی درۆزنی دیکە سەر هەڵبدەن تاوەکو دەجالە راستەقینەکە کەئەویش دەجالە کوێرە درۆزنەکەیە- پەنادەگرین بەخودای گەورە لەفیتنەو ئاژاوەکەی - رۆژێک پێغەمبەر ﷺ ووتارێکی داو فەرمووی: ((انه والله لاتقوم الساعة حتى يخرج ثلاثون كذاباً اخرهم الأعور الكذاب)) واتە: **((سوێند بەخوا قیامەت هەڵناسێت تاوەکو سی درۆزن سەر هەڵنەدەن کۆتاییەکەیان دەجالە کوێرە درۆزنەکەیە))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە

لەثوبان رەزای خوای لێبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لاتقوم الساعة حتى تلحق قبائل من أمتي بالمشركين، وحتى يعبدوا الأوثان،وإنه سيكون في أمتي ثلاثون كذابون، كلهم يزعم انه نبي، وأنا خاتم النبيين لانبي بعدي )) واتە: **((قیامەت هەڵناسێ تاوەکو چەند هۆزێک لەئوممەتەکەم دەگەنەوە بێباوەڕەکان، تاوەکو بت دەپەرستنەوە، ئەمەو لەئوممەتی مندا سی درۆزن پەیدا دەبن، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەپێغەمبەرن، منیش کۆتایی پێغەمبەرانم هیچ پێغەمبەرێک لە دوای من نایەت))** ابو داواد و ترمذی ریوایەتیان کردووە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە لەسەر دەرکەتنی بیست و حەوت بانگەشەکاری پێغەمبەرایەتی، لەوانە چواریان ئافرەتن، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ئەو پێغەمبەرە.

لە حذیفە ڕەزای خوای لبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((في أمتي كذابون دجالون، سبعة وعشرون، منهم أربع نسوة، وأني خاتم النبيين لا نبي بعدي) واتە: **((لەئوومەتی من بیست و حەوت دەجالی درۆزن سەر هەڵدەدەن، لەوانە چواریان ئافرەتن، وە من کۆتایی پێغەمبەرانم لەدوای من هیچ پێغەمبەرێکی تر نیە))** ئەحمەدو طبرانی و بەزاز ریوایەتیان کردووە.

## لەرابردوودا ژمارەیەکی زۆر لەوانە دەرکەوتوون :

١. لەکۆتای ژیانی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت، ئەسوەدی عەنسی لەیەمەن بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد لەکاتێکدا لە ئیسلام پاشگەزبۆوەو بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کرد، ئەمەش یەکەمین بەرپەرچدانەوە بوو لەئیسلام لەسەردەمی پێغەمبەر درودی خوی لەسەر بێت، وە زۆر شەرکەری لەدەوری خۆی کۆکردەوەو بۆماوەی چوار یان پێنج مانگ دەستی گرت بە هەموو بەشەکانی یەمەن جا پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی ڕەوانەکرد بۆ موسڵمانەکانی یەمەن، هانی دان لەسەر شەڕکردنیان ئینجا موسڵمانانی یەمەن وەڵامی پێغەمبەریان دایەوەو لەماڵەکەی خۆیدا کووشتیان، بەهاوکاری خێزانەکەی کەپاش کووشتنی مێردەکەی بەزۆر هێنابووی، ئەو ئافرەتێکی بڕوادار بوو بەخواو بەپێغەمبەرەکەی درودی خوای لێ بێت، بەکوشتنی ئەو دەجالە ئیسلام لەیەمەن و لەناو خەڵکدا دەرکەوتەوە، وە بۆ پێغەمبەریان درودی خوای لێ بێت نووسی، ئەمیش ئەو هەواڵەی لەئاسمانەوە پێگەیشت و بەسەحابەکانی ڕاگەیاند، ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو درۆزنەلەکاتی سەرهەڵدانی تائەو کاتەی کووشتیان سێ مانگ بوو، هەندێک دەڵێن چوار مانگ .

٢. لەوانەش طلحەی کوڕی خوەلیدەی ئەسەدی، موسلمانەکان بەردەوام شەڕیان لەگەڵیدا دەکرد، بەڵام لەدواییدا خۆی تەسلیم کردەوە وەهاتەوە ناوئیسلام، بەسووپای موسلمانان گەیشت، و لەزۆربەی جیهادەکان بەشداری کرد، تاوەکو لە نەهاوەند شەهید کرا ڕەزای خوای لێبێت.

٣. یەکێک لەوانە موسەیلەمەی درۆزن، ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لەتاریکیدا وەحی بۆ دێت، ئەبوبەکری صدیق ڕەزای خوای لێبیت سوپایەکی بۆ نارد بەفەرماندەی خالیدی کوڕی وەلیدو عکرمەی کوڕی ئەبو جەهل و شەرحەبیلی کوڕی حسنە ڕەزای خوایان لێبێت، موسەیلەمە بە سوپایەک بەرەنگاریان بووەوە کەچل هەزار شەرکەری هەبوو، لەنێوانیان شەڕێکی قورس ڕوویدا، ئەوەبوو بەسەر موسەیلەمەو سوپاکەیدا زاڵبوون، وەموسەیلەمەش بەدەستی وەحشی کوڕی حرب ڕەزای خوای لێبیت کوژرا، هێزی هەق سەرکەوت و ئاڵای یەکتاپەرستی بەرزبووەوە.

٤. یەکێک لەوانە سەجاحی کچی حارسی تەغلەبی بوو، ئەم ئافرەتە یەکێک بوو لەنەسارە عەرەبەکان، پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، خەڵکێکی زۆر لەهۆزەکەی و لە شوێنی تر لێی کۆبوونەوە، شەڕی لەگەڵ هەموو هۆزەکانی دراوسێی کرد، تاوەکو گەیشتە یەمامە، بەموسەیلەمەگەیشت و باوەڕی پێکرد، و مارەی کرد، کاتێک موسەیلەمە کوژرا ئەو گەڕایەوە وولاتەکەی خۆی، لەناو هۆزەکەی لەبنی تغلب جێگیربوون پاشان هاتە ناوئیسلام و بەباشی ئیسلامەتیەکەی خۆی دەکرد، پاشان چوو بۆ بەسرا هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

الشام
بحر الروم
بلاد فارس
خليج البصرة (العربي)
بحر القلزم (البحر الاحمر)
المدينة
اليمن
الحبشة
بحر العرب

خالیدی کوڕی وەلید — عکرمە کوڕی ابی جهل — سویدی کوڕی مقرن
خالیدی کوڕی سەعید — عمرو کوڕی عاص — حوذیفەی کوڕی غطفانی
عرججەی کوڕی هرتمە — شەحیلی کوڕی حسنة
العلاء کوڕی الحضومی — المهاجر کوڕی ابی امیە

جەنگی هەڵگەڕاوەکان

٥. بەڵام لەسەردەمی شوێنكەوتووان و دوای ئەوانیش، موختاری كوڕی ابی عبید ئەلسەقیفی سەری هەڵدا، یەكەمجار بەشیعەگەرایەتی بەدیار كەوت، كۆمەڵێكی زۆر لەشیعە لەچوار دەوری كۆبوونەوە، و بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە جبریل (علیه السلام) لەسەری دابەزیووە، لەنێوان ئەوو نێوان موسەعەبی كوڕی زبیر ژمارەیەك شەڕو كوشتار ڕوویدا لەئەنجامدا موختار تێیدا كوژرا .

٦. وەیەكێك لەوانەش حارسی كوڕی سەعیدی درۆزن، لەدیمەشقدا بەخواپەرستی بەدیاركەوت پاشان بانگەوازی كرد كە ئەو پێغەرمبەرە، كاتێك زانی ئەم هەواڵەگەیشتە خەلیفە عەبدولمەلیكی كوڕی مەروان خۆی شاردەوە، پیاوێك لەبەسرە توانی شوێنەكەی بناسێتەوە، وە خۆی بۆ پیاوەكە ئاشكرا كرد بەشێوەیەكی باوەڕپێكراو فەرمانیدا كەقەدەغەی ناكات هەر كاتێك بیبێتەلای، ئەم پیاوە هەواڵەكەی گەیاندە عەبدولمەلیك، ئەویش ژمارەیەكی زۆر سەربازی لەگەڵدا ناردو گرتیان، هێنایانە لای عەبدولمەلیك، عەبدولمەلیكیش فەرمانی دا لەپیاوانی فقهزان و زانایان كەوا ئامۆژگاری بكەن و فێری بكەن كەوا ئەم كردەوەیە لەكاری شەیتانە، حارس ملی نەداو قایل نەبوو تۆبەبكات. ئینجا عەبدولمەلیك كووشتی.

٧. لەسەردەمی ئێستادا پێش زیاتر لەسەدەیەك، لەهیندستان پیاوێك دەركەوت بەناوی (میرزا غولام احمد القادیانی) بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەكردو، بانگەوازی ئەوەی دەكرد كەلەئاسماندا وەحی پێگەیشتووە، هەروەها بانگەوازی ئەوەی دەكرد لەخودای گەورە هەواڵی پێداوە كەوا هەشتا ساڵ دەژیت، شوێنكەوتووی بۆ پەیدا بوو، زۆر لەزانایان ڕەتیان دایەوەو ووتاریان لەدژی دەنووسی، وایان پیشانی خەڵك دەدا كە ئەمە دەجالە، یەكێك لەم زانایە گەورانە (پناء اللە الامر تسری) كەئەمە توندترینی زاناكان بوو لەدژی ئەو.




تاوەكو لەساڵی (١٣٢٦كۆچی - ١٩٠٨زاینی) قادیانی بەربەرەكانی شێخ پناء اللەی كرد، بەوەی كە ئەو درۆزنە بوختانكەرە لەپێیەكانیەوە دەمرێت، وەداوای لەخودا گەورە كرد كە ڕۆحی ئەم درۆزنە بكێشێت،




وە پاڕایەوە کەنەخۆشی تاعوونی تووش بکات، هەر بەم نەخۆشیەوە بمرێت، جا پاش ساڵێک قادیانی تووشی ئەم دەردەبوو، باوکی خێزانەکەی باس لەدواکاتی دەکات و دەڵێت: کاتێک نەخۆشیەکە زۆری بۆ هێناو توندبوو لەسەری منی لەخەو هەڵساند، چوومەلای و بینیم لەتاوی نەخۆشیەکە ئازار دەکێشێ، قسەی لەگەڵ کردم و ووتی: تووشی کولێرا بوومە، پاشان دوای ئەم ووشەیە بەڕاشکاوی هیچ قسەی تری نەکرد تاوەکو مرد.

ئاوا سەرهەڵدانی درۆزنەکان یەک لەدوای یەک بەردەوام دەبێت تاوەکو ژمارەکانیان دەگاتە جێ کەوا پێغەمبەری ڕاستگۆو باوەڕپێکراو محمد ڕەزای خوای لەسەر بێت ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە، تاوەکو کۆتاییەکەیان کەمەسیحی دەجالە ئاخری زەمان دەردەکەوێت -خودای گەورە پەنامان بدات لەفیتنەو ئاژاوەکەی- وە عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت سەلامی خوای لەسەر بێت) بۆ زاڵبوون بەسەر دەجال و فیتنەکەی.



هەندێک ڕایان جیاوازە کەوا پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت ئەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن سی کەسن، کەچی مێژوو وە واقیع شایەتی دەدەن کە ژمارەکە لەوە گەورەترە.

گێڕەرکێ

وەلامەکە :
ئەم سی کەسە ئەوانەن کە ناوبانگ و دەوڵەت و شوێنکەوتوویان هەیە، بەڵام ئەوانی تر کە دێن، لەم سی کەسە هەژمار ناکرێن.



# ١٢
# بڵاوبوونەوەی ئەمن و ئاسایش و خۆشگوزەرانی

موسڵمانان زەمەنێک لەمەککە و مەدینە ژیان، وە ئەوانە لەنێوان لەشەرکردن لەگەڵ دوژمنەکان و چاوەڕێ کردن بۆ شەرو جەنگ، پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە کەوا لەگەڵ هاتنە پێشی ساڵەکان، وەنزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی ئەمن و ئاسایش زۆر دەبێت و دونیا دەبێتە خۆشگوزەرانی، وە دەفەرموویێت (( لا تقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجا وأنهارا، وحتى يسير الراكب بين العراق ومكة، لا يخاف إلا ضلال الطريق، وحتى يكثر الهرج ، قالوا : وما الهرج ؟ يا رسول الله، قال: القتل))




**واتە: ((قیامەت نایەت تاوەکو خاکی عەرەب دەگەڕێتەوە بۆ سەوزایی و ڕووبار، تاوەکو دونیا ئەوەندە ئاسایش دەبێت سوار ڕێگا دەگرێتە بەر لەنێوان عێراق و مەککە لەهیچ ترسی نابێت تەنیا لەڕێ وونکردن نەبێت، تاوەکو (هەرج) زۆر نەبێت)) ووتیان هرج چیە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی ((کووشتن و کووشتار))** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.

پێغەمبەر ﷺ بۆ عودەی بن هاشم دەدوێت و دەفەرموێت : ((يا عدي ، هل رأيت الحيرة ؟ قلت : لم أرها ، وقد أنبئت عنها ، قال : فإن طالت بك حياة ، لترين الظعينة ترتحل من الحيرة ، حتى تطوف بالكعبة لا تخاف أحدا إلا الله )) **واتە: ((ئەی عودەی ئایا تۆ (حیرە)ت بینووە)) ووتم نەم بینووە، بەڵام هەواڵیم زانیوە، فەرمووی ((ئەگەر تەمەنت درێژ بوو ئەوا ئافرەتیان دەبێنی تاکو تەوافی کەعبە دەکەن لەهیچ کەس ناترسن تەنها لەخوای گەورە نەبێت))** بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

ئینجا سەروەت و سامان زۆر دەبێت و زیاد دەکات - بەیارمەتی خوای گەورە- وە دادوەری جێگای ستەم و زۆرداری دەگرێتەوە لەزەمانی مەهدی و عیسا (سەلامی خوای لێبێت)، خوای گەورە زاناترە.

# ١٣

# دەرکەوتنی ئاگرێک لە حیجاز

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە، دەرکەوتنی ئاگرێکە لەخاکی حیجاز لەتەنیشت مەدینەی منەوەرە، هەندێک لەزانایان و مێژوو نووسان ئەم نیشانەیە لەساڵی ٦٥٤ کۆچی دادەنێت.




**حافظ بن كثير** لەم بارەیەوە دەگێڕێتەوە:

**(ئاگرێک لەخاکی حیجاز بەدیارکەوت کەوا بەرملی ووشتری لە (بوصرا) رووناک دەکردەوە)** ئێستا شاری حۆرانە لەسوریا.

پێغەمبەر دروودی خوای لێبێت دەفەرموویێت **((لاتقوم الساعة، حتى تخرج نار من أرض الحجاز، تضيء، لها أعناق الإبل ببصري ))**

**واتە: ((قیامەت هەڵناسێ تاوەکو ئاگرێک لەخاکی حیجاز دەردەکەوێت، بەرملی ووشتر لە بویسرا ڕووناک دەکاتەوە))** بوخاری ریوایەتی کردووە.

دەڵێن ئەم ئاگرە سێ مانگ مایەوەو ئافرەتانی مەدینە لەبەر رۆشنایی ئەم ئاگرە خوریان دەڕست) البدايه والنهايه ١٩٩/١٣



شوێنەواری ئەو گەرماییە بەلێشاوەی لەگڕکانی (حره) کەلەساڵی ٦٥٤کۆچی ڕوویداوە، و شوێنەکەش لەمەدینەی منەوەرەیە.

**ابوشامه** لەوەسفی ڕوودانەکەدا دەڵێت **(ئەو کاتە شەوی چوارشەممە ٣/جمادی اخر/ ٦٥٤ کۆچی بوو (کەدەکاتە ڕێکەوتنی ٢٩/٥/١٢٥٦زایینی) لەمەدینەی منەووەرە دەنگێکی زۆرگەورە پەیدابوو، پاشان**



بوومەلەرزە دەستیپێکرد لەئەنجامدا زەوی دەستی بەلەرزین کردو دیوارو دارو سەربان و پەنجەرەو دەرگاکان هەژانەوە کات لەدوای کات ئاوەکو رۆژی هەینی لەهەمان مانگدا.

پاشان ئاگرێکی گەورە لەمەیدنە –نزیک بنی قریضة – دیارکەوت، لەناو مەدینە ئێمە بەچاوی خۆمان دەمانبینی، وەک ئەوە وابوو لای ئێمە بێت، دۆڵەکانی پڕ ئاگرکرد تاکو گەیشتە دۆڵی (شـڤا) ئاگرەکە وەک ئاو ڕێچکەی دەکرد، پریشکی دەهاوێشت بەئەندازەی قەسرێک دابوو)

چیای مەلیساء

گرکانی (حرە) کە دامرکاوەتەوە، ئەمەش دوا شۆڕشەکانیەتی لەساڵی (٦٥٤کۆچی – ١٢٥٦زایینی)، کەوا ژمارەیەک لەبوومەلەرزەی دژوارو تەقینەوەی تووندی بەخۆوە دیت، ئەم چالاکیە گڕکانیەش بەگوێرەی چاوگەمێژووییەکان نزیکەی پەنجاو دوو رۆژ بەرەوم بوو، بۆ دووری (٢٣کیلۆمەتر) بۆ لای باکور لەناوچەی گڕکانەکە ئاگری تواوەی لەبەر ڕۆیشتووە، کە دەگاتە سنووری لای باشووری فرۆکەخانەی مەدینەی منەوەرەی ئێستا، وەئاگرە تواوە لەبەر ڕۆیشتووەکەی بەدووری (١٢کیلۆمەتر) لەمەدینەی منەوەرەوە وەستا، پاشان ڕێچکەکەی گۆری بۆ باکوور، وە بەرزیەکەی گەیشتە (٩١٦مەتر) لەسەر ڕووی دەریا.

# ١٤
# شەڕکردن لەگەڵ تورک

لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی پێشهاتەچوون هەیە، ئەو شەڕوجەنگانەی کە پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێداوون لەنێوان موسـلمانەکان خۆیان لەگەڵ هۆزو قەبیلەی دیکە، لەو شەڕانەی کە لەنێوان موسلمانەکان و تورک ڕوودەدات، ئەمەش لەسەردەمی سەحابیەکان شەڕو کوشتار ڕوویدا، لەیەکەم خەلافەتی بەنی ئومەییە، کەوا تورکەکان دۆڕاندیان و کەوتنە دەست سەحابەکان.
لەئەبی هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت (( لاتقوم الساعة حتى تقاتلوا الترك، صغار الأعين، حمر الوجوه، ذلف الأنوف، كان وجوههم المجان المطرقة، ولاتقوم الساعة حتى تقاتلوا قوما نعالهم الشعر)) **واتە: ((قیامەت نایەت هەتاکو شەڕ لەگەڵ تورکدا دەکەن، ئەمانە میللەتێکن چاویان بچووکە، دەم و چاویان سوورە، لووتیان کورت و پانە، دەم و چاویان دەڵێی بەچەرم داپۆشراوە، قیامەتیش هەڵناسێ تاکو شەڕ لەگەڵ هۆزێک دەکەن پێڵاوەکانیان لەموو دروستکراوە))** موسلم و بوخاری ڕیوایەتی کردووە.
مەبەسـت لێیان (خوازاناترە) تەتارە مەغۆلەکان کەوا وولاتی ئیسلامیان لەساڵی ٦٥٦کۆچی – ١٢٥٦زایینی داگیرکرد، وە خوێنێکی زۆریان ڕشت، بەڵام لەکۆتاییدا هاتنە ناو ئیسلام.



وێنەی پیاوێک و منداڵێکی مەغۆل ئەگەر بەووردی سەیری بکەین هەمان وەسفەکە لەحەدیسەکەدا هاتووە.



قەڵغان: بریتیە لەوەی کە جەنگاوەر بەدەستیەوە دەیگرێت بۆ خۆپاراستن و لێدانەکانی تیرو شمشێرو ڕمەکان



نەخشەیەك: دەرکەوتنی میرنیشینی تەتارەکان، ساڵی ٦٠٣ کۆچی



وێنەی سوارچاکێکی مەغۆل



وێنەی جل و بەرگێکی کۆنی مەغۆلەکان




نەخشەیەك: سوپاکانی تەتار بەشدار بوو لەگەمارۆدانی بەغدا



وێنەیەکی کۆنی جەنگاوەرێکی مەغۆل




نەخشەیەك: میرنیشینی تەتارەکان پاش داگیر کردنی شام



تابلۆیەکی کۆنی جەنگیز خان، یەکگرتنی هۆزەکانی تەتار

# ١٥
# دەرکەوتنی پۆلیس و پیاوی ستەمکار کەوا بەقامچی لەخەڵک دەدەن



لەنیشـــانەکانی رۆژی دوایی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە، لەفەرمانڕەوایی کردنی حاکمە ستەمکارەکان، ئەوانـــەی بەقامچـــی لەخەڵـــک دەدەن وەکـــو کلکـــی مانـــگا وایە، ئەم قامچیانەش هەمە جۆرن، پێســـتیەو کارەباییە، وە لاستیکیە یان لەدار دروستکراوە.

لەئەبویەمامە رەزای خوای لێبێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت((یکون أخر الزمان، رجال معهم سیاط کـأذناب البقر، یغدون في سخط الله، ویروحون في غضبه )) **واتە: ((لەئاخری زەماندا هەندێک پیاو پەیدا دەبن قامچیان بەدەستە وەک کلکی مانگاوایە، بەیانی تانیوەڕۆ لەرقی خوادان، وە لەنیوەڕۆ تا ئێوارە لەتوورە بوونی خوا دەمێننەوە))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێبێت پێغەمبەر دروودی خـوای لێبێت دەفەرموێت((صنفان من أمتي لم أرهما...قوم معهم سیاط کأذناب البقر یضربون بها الناس)) **واتە: ((دوو کۆمەڵ هەن لەئەهلی دۆزەخ من نەمبینیوون ...قەومێکیان کەسانێکن قامچیان بەدەستەوەیە وەک کلکی مانگاوایە پێی لەخەڵک دەدەن..))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێبێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((إن طالت بك مدة أوشکت أن تری قوماً، یغدون في سخط الله ویروحون في لعنته في أیدیهیم مثل أذناب البقر)) **واتە: ((ئەگەر تەمەنت درێژ بێت خەڵکانێک دەبینیت، لەرقی خوا رۆژدەکەنەوە، وە ئێوارەش لەلەعنەتی خوا دەمێننەوە، ئەمانە قامچیەکیان بەدەستەوەیە وەک کلکی مانگا وایە))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

ئەم حەدیسەش ئەگەر هیچ لێدوانێکیش بۆ نەدرێت ئەوانە بەم قامچیانە لەخەڵک دەدەن، وە لەرق و تووڕەیی خوادا دەمێننەوە، ئەمەش هێمایەکە بۆ زۆری دەستدرێژی و ستەمکاریان.

# ١٦

# زۆربوونی کوشت و کوشتار (الهرج)

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کە پێغەمبەر ﷺ باسیکردووە، زۆربوونی کوشتن، تاوەکو پیاو پیاوێک دەکوژێت نازانێت بۆ کوشتی، وەکو کوژراویش نازانێت بۆ کوژراوە.
ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((والذي نفسي بيده، لاتذهب الدنيا حتى يأتي يوم لايدري القاتل فيم قتل، ولا المقتول فيم قتل، فقيل: كيف يكون ذلك؟ قال: الهرج القاتل والمقتول في النار)) واتە: **((سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، دونیا ناڕوات و قیامەت نایەت تاکو رۆژێک دێت بکوژ نازانێت بۆ چی خەڵکی کوشووە، وەکەسی کوژراویش نازانێت بۆ کوژراوە)) ووتیان: ئەمە چۆن دەبێت؟ فەرمووی ((هەرەجە بکوژو کوژراو لەناو ئاگردان))** موسلیم رایوایەتی کردووە.
وە هەرەج بەکوشتنی عوسمانی کوڕی عەففان رەزای خوای لێبێت دەستی پێکرد، شەڕو کوشتار روویدا بەبێ هۆکارێکی سەلمێندراو، لەم پێناوەدا هەزاران کەس کوژران، لەگەڵ پەیدابوونی چەکە کۆمەڵکوژو کاوڵکەرەکانی ئەمڕۆ خزمەتی ئەم شەڕە وێرانکەرە دەکات.


بۆمبا بارانکردنی هیرۆشیما نزیکەی ١٤٠,٠٠٠ کەسی کوشت، ئەمە شوێنەوارێکی راستەوخۆیە بۆ تەقینەوەکە.

### ئەمەش ئاماری کوژراوانی هەندی شەڕو کوشتارە:

١- جەنگی جیهانی یەکەم ١٥ ملیۆن کوژراو
٢- جەنگی جیهانی دووەم ٥٥ ملیۆن کوژراو
٣- شەڕی ڤێتنام ٣ ملیۆن کوژران
٤- شەڕی ناوخۆی رووسیا ١٠ ملیۆن کوژران
٥- شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا ١٢ ملیۆن کوژران
٦- شەڕی عێراق و ئێران (شەڕی کەنداوی یەکەم) : ١ ملیۆن کوژراو
٧- داگیر کردنی عێراق : زیاتر لەیەک ملیۆن کوژران

ئەم شەڕو کوشتارانە ئەگەر هەندێکیشیان حەدیسەکە بەسەریدا هاوجووت نەبێت ((بکوژ نازانێت بۆ چی کەسێکی کوشتووە..)) من تەنها بۆ ئاشکراکردنی بڵاوبوونەوەی شەڕو کوشتارو زۆریەکەی بەنموونە هێناومەتەوە.

# ١٧

# برزکردن و بەفیڕۆ دانی سپاردە وەدەرهێنانی لەناو دڵدا

دانانی پیاوی گونجاو بۆ شوێنی گونجاو بریتیە لە کۆڵەکەی مانەوەی گەل ومیللەت، وەچاککردنی وولات و ئادەمیزاد و بووژانەوەی شارستانی، بەڵام ئەگەر سپاردەو ئەمانەت نەما ئەوا هاوکێشەو پارسەنگەکان تێک دەچێت، و تەواوی خەڵک تووشی فەسادی دەبێت، کارەکان دەدرێتە کەسانی نەشیاو و دەبێتە ئاژاوەو تێک چوون، ئەمەش ئەم ڕووداوەیەکە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە.

حوزەیفە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (( أن الأمانة نزلت في جذر قلوب الرجال ، ثم علموا من القرآن، علموا من السنة )) واتە: **((سپاردە دابەزیوەتە ناو ڕەگی دڵی پیاوان، پاشان قورئان دابەزیوە، ئینجا لەقورئانەوە فێر بوون، ئینجا لەسووننەتەکانەوە فێربوون))**

ثم حدثنا عن رفع الأمانة فقال صلى اله عليه وسلم: ((ينام الرجل النومة ، فتقبض الأمانة من قلبه ، فيظل أثرها مثل أثر الوَكْت ، ثم ينام النومة فتقبض الأمانة من قلبه، فيظل أثرها مثل المجل، كجمر دحرجته على رجلك فنفط، فتراه منتبرا وليس فيه شيء - ثم أخذ حصى فدحرجه على رِجله- فيصبح الناس يتبايعون لايكاد أحد يؤدي الأمانة حتى يقال: إن في بني فلان رجلاً أمنياً، حتى يقال للرجل، ما أجلده! ما أظرفه ما أعقله! وما في قلبه مثقال حبه من خردل من إيمان)) پاشان باسی بۆ کردن لەبارەی دەرهێنانی سپاردە لەناو دڵدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت واتە: **((پیاوێک دەخەوێ، ئینجا ئەمانەتەکەی لەناودڵیدا دەردەهێنرێت، شوێنەوارەکەی وەک و خاڵێک دەمێنێتەوە، پاشان جارێکی تر دەخەوێت، ئەمانەتەکەی لەدڵیدا دەردەهێنرێتەوە، شوێنەوارەکەی وەک قلیشانێکی سووک وەک زیپکەوایە، وەکو پۆلە ئاگرێک بەسەر خەڵک کرین و فرۆشتن دەکەن بەڵام کەسێک نادۆزیتەوە ئەمانەت پارێزبێت تاوەکو دەڵێن: لەنەوەی فلاندا پیاوێکی دەستپاک هەیە، تاوەکو بەپیاوێ دەگوترێ، چەند ژیرو هۆشمەندە! چەند ماقوول و پیاوچاکە! کەچی لەدڵیدا گەردیلەک باوەڕی تێدانیە))**

حوزەیفە دەڵێت: (زەمانێک هاتووە بەسەرمدا هیچ گوێم پێنەدەدا کە کەلوپەلێک بفرۆشمەکەسێک یان لێی بکڕم جا ئەگەر کەسەکە موسڵمان بوایە ئەوا لەبەر موسڵمانیەکەی

ناپاکی لەگەڵد نەدەکردم، بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی من ڕەفتارم لەگەڵیدا دەکرد نەسرانی یا جوولەکە بوایە لەبەر فەرمانڕەوای کاربەدەستان و سزادانی نەیدەتوانی ناپاکی بکات، بەڵام ئەمڕۆ تەنها لەگەڵ فلان و فلاندا کڕین و فرۆشتن دەکەم) متفق علیه.

بەڵام ئەگەر زۆربەی خەڵک خراپ بوون، وە فەرمان و کاروبار بدرێتە کەسانێک کە شایستەی ئەو جێگایەنین، ئەوا ئەمانەت و سپاردە بەفیرۆ دەچێت، ڕۆژی دوایش نزیک دەبێتەوە.

لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: ((بينما النبي ﷺ في مجلس يحدث القوم ، جاءه أعرابي فقال : متى الساعة ؟ فمضى رسول الله صلى الله عليه وسلم يحدث ، فقال بعض القوم : سمع ما قال فكره ما قال . وقال بعضهم : بل لم يسمع ، حتى إذا قضى حديثه قال: أين - أراه - السائل عن الساعة قال : ها أنا يا رسول الله ، قال : فإذا ضيعت الأمانة فانتظر الساعة، قال : كيف إضاعتها ؟ قال : إذا وسد الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة))

واتە: **((کاتێک پێغەمبەر ﷺ لەناو هاوەڵەکانیدا قسەی دەکرد، کابرایەکی دەشتەکی هات و ووتی : کەی قیامەت دێت؟ کەچی پێغەمبەر لەسەر قسەکردنەکەی بەردەوام بوو، بۆیە هەندێک لەخەڵکەکە ووتیان : ئەوەی کابراکە ووتی بیستی و گوێی لێبوو، بەڵام پێی ناخۆش بوو کە ئەمەی ووت، وە هەندێکی تروویان بەڵکو قسەکەی گوێ لێ نەبوو، تاوەکو پێغەمبەر ﷺ لەقسەکانی بووەوەو فەرموی ((کوا ئەو کەسەی پرسیاری قیامەتی دەکرد)) کابرا ووتی ئەوەتا لێرەم ئەی پێغەمبەری خودا، فەرمووی ((ئەگەر سپاردەو ئەمانەت فەوتاو نەما ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بکە)) کابراکە ووتی: فەوتان و نەمان چۆن دەبێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((ئەگەر کاروبار درایە دەست کەسانێک کە شایستەی ئەو جێگایە نەبوون، ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بکە))** بوخاری ریوایەتی کردووە

ئەم نیشانە، ڕێک وەک و واقیعی ئەمرۆمانە بەتەواوەتی، زۆر لەبەرپرسان دەبینی لەوەزارەتەکان و، لەزانکۆکان پێگەی بەرزیان هەیە لەکۆمەڵگادا، کەئەمانە پەیوەندیان بە بەرژەوەندی خەڵکەوە هەیە، وە ئینسانی بەتواناو چاک دانامەزرێنن، زیاتر پەیوەندی بەئەمانەت و چادێری بەرژەوەندی خەڵکەوە هەیە، بەڵکو ئەوکەسانە دادەمەزرێن کەخزمو ناسیاوی بەرپرسەگەورەکانن، یان بەرژەوەندیەکی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە، وەزۆرشتی وەک لەوبابەتە...

بەڵێ: ((ئەگەر کاروبار درایە دەست کەسانێک کە شایستەی ئەو جێگایە نەبن ئەوا چاوەڕوانی ڕۆژی دوایی بکە))

# ١٨

# شوێن پێ هەڵگرتنی ڕێچکەکانی گەلانی ڕابردوو

لەگەورەترین ئەو فیتنە و ئاژاوانەی موسڵمان تووشی دەبێت، فیتنەی لاسایی کردنەوەیەکی کوێرانەیە، وەلاسایی کردنەوەو پێک چوواندنی بەداب و نەریت و رەفتارەکانی جولەکەو دیانەکان، یان گەلێکی تر لەکافرەکان.

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بەوەی کەوا کۆمەڵێک لەئوممەتەکەی لاسایی گەلە ستەمکارو گومڕاکان دەکەنەوە لەجولەکە و دیانەکان لەداب و نەریت و سروشت و ژیانیان.
لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لێبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((لاتقوم الساعة حتى تأخذ أمتي يأخذ القرون قبلها شبراً بشبر و ذراعاً بذراع، فقيل: يارسول الله كفارس والروم؟ فقال: ومن الناس إلا أولئك )) واتە: **((قیامەت هەڵناستێ تاکو ئوممەتەکەم شوێن پێی میللەتەکانی پێش خۆی هەڵدەگرێت بست بەبست و باڵ بەباڵ)) جا ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت فارس و رۆمەکانە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی((ئەی خەلک کێن جگە لەوانە))**
بوخاری رایوایەتی کردووە

بەڕاستی زۆرن ئەوانەی کەوتوونەتە ناو ئەو گێژاوە کە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردۆتەوەو ئەوانی تریش خەریکن دەکەونە ناو ئەو فیتنەیە، وەلەو حەدیسەدا هاتووە.

لە أبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێبێت دەڵێت پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویت (( لتتبعن سنن من قبلكم شبرا بشبر ، وذراعا بذراع ، حتى لو سلكوا جحر ضب لسلكتموه « ، قلنا يا رسول الله : اليهود ، والنصارى قال: فمن)) واتە: **((بەڕاستی ئێوە شوێن ئەوانەی پێش خۆتان هەڵدەگرن بست بەست وەباڵ بەباڵ، هەتا ئەگەر ئەوان بچنە کونی بزنمژەوە ئێوە بەدوایان دەکەون)) ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا: جولەکەو دیانەکان؟ فەرمووی : ((ئەی کێ؟))** متفق علیە

قازی عیاض رەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت : ((بست و باڵ و چوونەکونی بزن مژەوە لاسایی کردنەوەیە بۆ شوێن پێ هەڵگرتنیان وەچاولێکەری کردنە لەوانە))
لاسایی کردنەوەی جولەکەو دیانە خراپەکان، مەبەست ئەوەنیە کەنابێت لەگەڵیاندا زانیاری

و زانست بگۆڕێتەوە، وەسوود وەرگرین لەداهێنانەکانیان و بەڕێوەبردنی کارگێری و شتی تر بەمەرجێک ناکۆک نەبێت لەگەڵ ئاییندا.
بەڵام لاسایی کردنەوە لەجل و بەرگیان و ، داب و نەریتیان، و چۆنیەتی مامەڵەکردنی کۆمەلایەتی لەتێکەڵبوون و لابردنی حیجاب، یان رێکخستنی پارەو پوول کە ناکۆک بێت لەگەڵ دین و سووخۆری و زۆر شتی دیکە.

# ١٩

# منداڵ دەبێتە گەورەو سەردار لەسەر دایکی

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە کەدایک ببێتە خزمەتکاری منداڵەکەی و ئەویش ببێتە گەورەو سەری دایکی، ئەمەش کە کابرایەکی گەورەو ئازاد کەنیزەیەک مارەدەکات و سکی لێ دەبێت، پاشان منداڵێکی دەبێت، ئەم منداڵە دەبێتە گەنجێکی ئازاد، وە باوکیشی ماوەو زیندووە، دایکیشی هێشتا کەنیزەکە لەکەنیزەکان، لێرەدا کوڕەکە دەبێتە گەورەو سەردار لەسەر دایکی.
لەحەدیسێکی جبریلدا (سەلامی خوای لێبێت) کەوا پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو فەرمووی ((وسأخبرك عن أشراطها: إذاولدت الأمة ربتها)) واتە: **((نیشانەکانی رۆژی دواییت پێ دەڵێم: ئەگەر منداڵ ببێتە گەورەو سەردار لەسەر دایکی))** موسلیم ریوایەتی کردووە.
دەڵێن ماناکەی، کەوا ئەو دایکانەی کە کەنیزەک و خزمەتکارن منداڵی گەورەو ئازادیان دەبێت، ئەو کاتە دایکەکە دەبێتە خزمەتکارو منداڵەکەش دەبێتە گەورەو سەردار بەسەریدا.

٢٠

# دەرکەوتنی ئافرەتی ڕووت و بەرگ تەنک

لەنیشـانەکانی رۆژی دوایـی بڵاوبوونەوەی ئارایشـت کـردن و ئافرەتی سـافیرەو بەرگ تەنکەو، ئافرەتەکان بەپۆشاکی تەسک دەردەچن کەوا لەش و لاریان بەدیاردەکەوێت یان جل و بەرگیان ئەوەندە تەنکە شـەرمگا یان لەکاتی دانیشتن و رۆیشتندا بەدیار دەکەوێت، ئەمانە بەچاو پۆشـاکیان لەبەردایە،بەڵام لەبەر تەسـکی و تەنکی پۆشـاکەکانیان وەک رووت وایە چونکە گشت عەورەتیان بەدیاردەکەوێت وەجوانیەکانیان بۆ خەڵک دەردەخەن.

لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێت دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( صنفان من أهل النار لم أرهما ، قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس ، ونساء كاسيات عاريات مميلات مائلات ، رءوسهن كأسنمة البخت المائلة ، لا يدخلن الجنة ، ولا يجدن ريحها ، وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا)) **واتە: ((دوو کۆمەڵ هەن لەناو ئاگردان کەمن نەم بینوون کۆمەڵێکیان قامچیان پێیە لەکلکی مانگا دەچێت پێی لەخەڵکی دەدەن، وەئافرەتانێک کە پۆشاکی تەنک و تەسکیان لەبەردایە و لەشیان رووتەو پرچیان لەدواوە کۆدەکەنەوە لوولی دەکەن وەک پشتی ووشتر، ئەم ئافرەتانە ناچنە بەهەشتەوە، بۆنیشی ناکەن، کەبۆنی بەهەشت لەدووری ئەوەندە و ئەوەندە هەستی پێدەکرێ))** موسلیم ریوایەتی کردوە

((مائلات)) واتە خوارو خێچن بۆ ملکەچی و گوێرایەلی خودا، ڕاست و ڕێک نین لەسەر ملکەچی و گوێرایەلیەکەی.

((مميلات)) واتە لوولی دەکەن بۆ خەڵکی نامەحرەم، ئەوانە خراپەکارن و خەڵکیش بەهیلاک دەبەن.

((رؤسهن كأسمن البخت)) واتە: پرچیان لەدواوەی سەریان کۆ دەکەنەوە هەروەک پشتی وشتر وایە، بەرزبۆتەوە.

# ٢١

# خەڵكانی پێ پەتی و ڕووت شوانی مەڕوبزن دەبنە خاوەنی كۆشك و خانووی بەرز

لەنیشانەكانی رۆژی دوایی كەوا دەركەوتووەو پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەم بارەیەوە پێداوە وەخەڵكی ئاگادار كردۆتەوە لەباڵەخانەی بەرزو ڕازاندنەوەی ماڵەكان، دوای ئەم خەڵكانە پێشتر برسی و شوانی مەڕو بزن بوون.

ئەمەش دوای شەڕو ئازادكردنی وولاتان لەلایەن موسلمانەكانەوەو، زۆر بوونی خێرو بەرەكەت و پارەو پوول، وبلاوبوونەوەی ناكۆكی و پێشبڕكی لەسەر دونیا.

لەعومەری كوڕی خەتاب رەزای خوای لێبێت لەحەدیسێكی جوبریلدا هاتەلای پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێكرد دەربارەی ئیسلام و ئیمان و چاكەكردن، و دەربارەی رۆژی دوایی، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی نیشانەكانی رۆژی دوایی باسیكردو فەرمووی ((ان تلد الأمة ربتها، وأن ترى الحفاة العراة رعاة الشاء يتطاولون في البنيان)) واتە: **((كاتێك دایك دەبێتە خزمەتكاری منداڵەكەی، وەكاتی دەبینیت كابرایەكی ڕووت و برسی شوانی مەڕو بزن دەبێتە خاوەنی كۆشك و باڵەخانەی بەرز))** موسلیم ریوایەتی كردووە.



لەڕیوایەتێکی دیکە: ((ورأيت الحفاة الجياع العالة كانوا رؤوس الناس: فذلك من معالم الساعة وأشراطها)) واتە: ((کاتێ بینیت پێ پەتیەکی برسی دەبێتە گەورەو سەرکردەی خەڵک ئەمە لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە)) ووتیان ئەی پێغەمبەی خوا: ئەمانە کێن خاوەنی مەڕو پێ پەتی و برسیەکان؟ فەرمووی ((عـــــەرەب)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە.



بێگومان دروستکردنی مـــاڵ و بـاڵـەخـانـەو بـەرزکـردنـەوەی حەرام نیە ئەگەر سوودی هەبێت نەک بۆ شانازی پێوەکردن و بۆ خۆ بەزل زانین.
درێژکردنەوە لەبنیاتنان دەبـێـتـە زۆر بـوونـی نـهۆمـەکـانـی مـــاڵان و بەرزبوونەوەی بۆسەرەوە، و دەبێتە هۆی پتەوکردنی بینایەکەو بەهێزکردنی و خۆشگوزەرانی تیایدا و، دەبێتە فراوان بوونی مـاڵـەکـەو زۆربـوونـی دانیشتن و میوانداری.

هەموو ئەو راستیانە لەزەمانی ئێمە لەکاتێکدایە کەسەروەت و سامان زۆر بووەو دنیاش لەسەری سانابووە، و مەبەست لەشوانی مەڕ کە دانیشتووی بیابان بووە شوێنی خۆیان جێهێشتووە، و ڕوویان کردۆتە شاران و کۆشک و تەلار بەرزدەکەنەوە، وەململانێی یەکتر دەکەن بەشانازی کردن و خۆبەگەورەزانین لەدروست کردنی باڵەخانەو خانوو بورجەکان.

هەرکەسەو دەیەوێت خانووی ئەو لەهی بەرامبەرەکەی بەرزتربێت، وەئێستا لەناو عەرەبەکان و نەتەوەکانی تر درێژەی هەیە، تاوەکو وولاتەکانیش ململانێی یەکتر دەکەن لەدروستکردنی بورجی بەرزو شانازی پێوەکردن.

# ٢٢
# سەلام کردن لەکەسانی ناسیاو (سەلام کردنی تایبەت)



خودای گەورە عزوجل سەلام کردنی داناوە بۆ ئەوەی ببێتە نیشانەی خۆشەویستی و پێکگەیشتنی نێوان خەڵک، دەبێت بچووک سەلام لەگەورە بکات، دەوڵەمەندیش سەلام لە هەژاران بکات، پێویستە عەرەب و غەیرە عەرەب و سپی و ڕەش ..سەلام لەیەکتر بکەن ئەگەر بیناسێت یاخود نەیناسێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : ((لاتدخلون الجنة حتى تؤمنوا، ولا تؤمنوا حتى تحابوا، أوَلا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم)) واتە: ((**ناچنە بەهەشت تاوەکو باوەڕ نەهێنن، وە باوەڕناهێنن تاکو یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامی بدەن یەکترتان خۆش بوێت؟ سەلام کردن لەنێوانتاندا بڵاوبکەنەوە**)) موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی سەلامکردنی تایبەتە، بریتیە لەوپیاوەی سەلام ناکات تەنها لەوکەسەی دەیناسێت، وەسەلامیش ناکات لەکەسێک کەنایناسێت، لەگەڵ ئەوەش سوننەتە سەلام بکەیت لەسەر ئەو کەسەی دەیناسیت یاخود نایناسیت.

ابی جەعد دەڵێت: عەبدوللا بەپیاوێک گەیشت، پیاوەکە پێی گوت السلام عليك يا ابن مسعود، عەبدوللاش ووتی، خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە ﷺ کەدەفەرمووێت ((ان من أشراط الساعة ان يمر الرجل في المسجد، لا يصلي فيه ركعتين والا يسلم الرجل إلا على من يعرف)) واتە: ((**لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، کاتێک پیاوێک بەلای مزگەوتدا تێدەپەڕێت، دوو ڕکعەت نوێژی تێداناکات، وەتەنها دەبێت سەلام لە پیاوێک بکات کە نەیناسێت**)) بن خزیمە ریوایەتی کردووە.

لەدوو (سەحیح)دا هاتووە کە وا پیاوێک پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد، کامە ئیسلام خێری زیاترە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أي الإسلام خير؟ قال: تطعم الطعام وتقرأ السلام على من عرفت ومن لم تعرف)) واتە: ((**خواردن ببەخشیت و سەلام بکەیت لەو کەسەی کەدەیناسیت و نایناسیت**))

٢٥ ٢٤ ٢٣

# بڵاو بوونەوەی بازرگانی - بەشداری کردنی ئافرەت لەگەڵ پیاوەکەیدا لەبازرگانی دا - دەست بەسەر داگرتنی هەندێک بازرگان بەسەر بازاردا

بریتیە لەبڵاو بوونەوەی، وەئیشکردنی زۆرترین خەڵک تێیدا لەبەر ئاسانی کاروبارەکەی، تاکوو وای لێهاتووە ئافرەتیش لەگەڵ پیاوەکەی بەشداری دەکات لەبەڕێوەبردنی ئەو دوو نیشانەیە لەیەک حەدیسدا هاتووە.



یەکێك لەبازارەکانی قاهیرە



یەکێك لەبازارەبازرگانیەکان

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((إن بين يدي الساعة: تسليم الخاصة، وفشو التجارة، حتى تعين المرأة وزوجها على التجارة، وقطع الأرحام، وشهادة الزور، وكتمان شهادة الحق، وظهور القلم)) **واتە: ((پێش هاتنی قیامەت سەلام کردن تایبەت دەبێت، بازرگانی بڵاو دەبێتەوە، تاوەکو ئافرەتیش دەبێتە هاوبەشی مێردەکەی لەبازرگانیدا، وە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و شایەدی دانی بەدرۆ، وەشاردنەوەی شایەدی حەق و ڕاست و، دەرکەوتنی قەڵەم و نووسین))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

لەعەمرو کوڕی تەغلەب ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((إن من أشراط الساعة : ان يفشو المال ويكثر، وتفشو التجارة،



ويظهر الجهل، ويبيع الرجل البيع فيقول: لا، حتى أستأمر تاجر بني فلان، ويلتمس في الحي العظيم الكاتب لايوجد)) **واتە: ((لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی: پارەو پوول و سامان بڵاو دەبێتەوەو زۆر دەبێت، وە بازرگانی بڵاودەبێتەوە نەفامی و نەزانین دەردەکەوێت، وەپیاوێک کڕین و فرۆشتن دەکات، دەڵێت: نا تاوەکو فەرمان دەکەم بازرگانێک لەنەوەی فلان بێت ئەو کارەی پێ بسپێرم، وە داوادەکات لەنووسەرێک لەحی العظیم بەدەستی ناکەوێت))** نسائیی ریوایەتی کردووە

وە لێرەدا فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ((يبيع الرجل البيع، فيقول: لا، حتى أستأمر تاجر بني فلان، ويلتمس في الحي العظيم الكاتب لا يوجد)) **واتە: ((پیاوێک کڕین فرۆشتن دەکات، و دەڵێت: نا، تاوەکو فەرمان دەکەم بازرگانێک لەنەوەی فلان بێت ئەو کارەی پێ راسپێرم، وە داوادەکات لەنووسەرێک لەحی العظیم بەدەستی ناکەوێت))**



ئەمە دیارو ئاشکرایە کە بازرگانێکی گەورەیە، لەوانەیە خاوەنی بانق و پارە سەرەکیەکان بێت، یان بریکاری باوەڕپێکراو بێت لەکەل و پەل هێنان و هاوردەکردن، ڕەنگە ئەمانە دەستیان گرتبێت بەسەر بازاردا، حوکم بەنرخەکان دەکەن، بازرگانە بچووکەکان ناتوانن دەستکاری بەبازرگانەکانیان بکەن تەنها بەمۆڵەتی ئەوان نەبێت.

یان مەرجی لەسەردا دەنێت لەکاتی فرۆشتندا مامەلە لەگەڵ فلان بازرگاندا بکات.

وە لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((داوادەکات لەنووسەرێک لەحی العظیم دەستی ناکەوێت)) لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی داوە لەحەدیسەکانی تردا بەبڵاوبوونەوەی نووسراوی زۆر، مەبەستی

لێی بڵاوبوونەوەی ئامێرە نوێیەکانی نووسینە، وەک ئامێری کۆمپیوتەر، و مۆبایل، و ئامێری وەرگێرانی دەنگ بۆ دەقەنووسراوەکان، وەزۆر شتی وەک ئەمانە، بۆیە نەوەیەکی وا پەیدابووە کە نازانێت بەدەست بنوسێت یان بەباشی ئەم کارە ئەنجام نادا.

یان ڕەنگە لێرەدا مەبەستی نووسینەوە بێت، کێ گرێبەستی بازرگانیەکە دەنووسێت، وە مەرجەکانی کڕین و فرۆشتن و یاساکانی بەباشی ئەنجام دەدات و، لەنێوان خەڵک دا بەبێ تەماعی لەبەخشیندا ژمێریاری دەکات و دەنووسێت.

## ٢٦

# شایەدی دانی بەدرۆ

شایەدی دانی بەدرۆ، بریتیە لەئادەمێزادێک درۆبکات لەشایەتدانی بەسەر خەڵکانی دیکەو، شایەدی بدات بەوەی کەفلان هەقی لەسەر فلانە بەدرۆو بەبوختان، ئەمەش لەتاوانە گەورەکانە.



پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (( ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ ثلاثا: قالوا: بلى يارسول الله، قال: الإشراك بالله ، وعقوق الوالدين، - وجلس، وكان متكئاً فقال: ألا وقول الزور)) **واتە:** **((ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لەسێ گوناهە گەورەکان، ووتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا : فەرمووی ((هاوبەش دانان بۆ خودای گەورە، ڕەنجاندنی دڵی دایک و باوک)) لەسەر لابوو ئینجا راست بووەوەو دانیشت و فەرمووی ((شایەدی دانی بەدرۆ))** متفق عليه.

بڵاوبوونەوەی ئاسان بوونی خەڵک تیایدا لەنیشانەکانی رۆژی دواییە، وەک لەحەدیسەکانی پێشوودا هاتووەو، دەفەرمویت ((ان بين يدي الساعة.. وذكر منها: شهادة الزور))

واتە: ((لەپێش قیامەتدا...)) و باسیکردن لەوانەش ((شایەدی دانی بەدرۆ)) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.

شایەدی دانی بەدرۆش تایبەت نیە بەشایەدان لەلای قازی یان دادوەر، بەڵکو ئەمە گشتیەو لەهەموو شایەدی دانێک وەک شایەدانی خەڵک لەناو یەکتر، وەک فەرمانبەرەکان لەکۆمپانیاکان و دام و دەزگاکان لەکاتی بەرپرسیارەتیان، وەشایەدی دانی قوتابیان لەقوتابخانەو زانکۆکان، وەشایەدی دانی منداڵ لەلای دایک و باوکیان.

پێغەمبەریش ﷺ ئاگاداری کردۆتەوە لەشایەدی دانی بەدرۆ و خواردنی مافی خەڵک بەسوێندنی درۆ یان بوختان کردن، وە دەفەرمووێت ((من اقتطع مال امرئ مسلم بيمين كاذبة ، لقي الله وهو عليه غضبان)) **((هەرکەسێک حەقی مالی موسلمانێکی بچڕاندو بەسوێندنی درۆ خوارد پاشان مرد، ئەوا خوای گەورە لێی تووڕەیە))**

پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوەو فەرمووی ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ ال عمران/٧٧

**واتە// ((بەڕاستی ئەوانەی کەپەیمانی خواو سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن ئەمانە لەدوارۆژدا هیچ بەشێکیان نابێت (لەسۆزو میهرەبانی خوا)، هەروەها لەڕۆژی قیامەتدا خوا نایاندوێنێت و تەماشایان ناکات (لەچلکی پیسی گوناە) خاوێنیان ناکاتەوەو سزای پڕ ئێش و ئازاریش بۆیان ئامادەیە))**

لەئەبی امامە الباهلی ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((من أقتطع حق امرىء مسلم بيمينه فقد أوجب الله له النار وحرم عليه الجنة، فقال له رجل: وان كان شيئاً يسيراً يا رسول الله؟ قال: وإن كان قضيباً من أراك)) واتە: **((هەر کەسێک حەقی کەسێکی موسلمان بەدرۆ بخوات ئەوا خوای گەورە دۆزەخی لەسەر واجب کردووەو بەهەشتی لەسەر حەرام کردووە)) ئینجا پیاوێک پێی ووت : ئەگەر ئەم شتەش زۆر بچووک و کەمیش بێت ئەی پێغەمبەی خوا فەرمووی ((ئەگەر لکەدارێکیش بێت لەئاراک))** موسلیم ڕیوایەتی کردووە.



# ٢٧

# شاردنەوەی شایەدی دانی حەق و ڕاستی

خودای گەورە فەرمانی بەموسـڵمانان داوە کەبراکەی سـەربخا ئەگەر هاتوو ستەمکار بێت یان ستەم لێکراو بێت، والە ستەمکارەکە بکات واز لەستەمەکەی بهێنێت و پەشیمان ببێتەوە، وەمافی سـتەم لێکراوەکەش وەربگرێتەوە ئەگەر توانـی، وە خـودای گەورەش حەرامـی کردووە لەسـەر شـاردنەوەی شـایەدی دانـی حـەق و ڕاستی.




﴿ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ﴾ البقره/٢٨٣.

**واتە// ((نەکەن شایەدی بشارنەوە، ئەوەی شایەدی بشارێتەوە ئەوە بەڕاستی دڵی ژەنگاوی و ناپوخت و گوناهبارە))**

لەکۆتایی زەماندا خەڵک مافی یەکتر دەخۆن وە ئەوانەی دەزانن خۆیانی لێ بێدەنگ دەکەن و هیچ لێدوانێک نادەن، لەگەڵ ئەوەش توانایان هەیە لەسەر ووتنەکەیان بەڵام بێدەنگ دەبن بەڵام ئەمانە ڕەنگە بەرژەوەندی تایبەتی لە نێوانیاندا هەبێت لەسەر ئەو شایەدی دانە، ئەمەش لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە، کەوا لەحەدیسەکانی پێشوودا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویت ((إن بين يدي الساعة..وذكر منها: وكتمان شهادة الحق)) **واتە: ((لەپێش هاتنی قیامەتدا... وەباسیکرد: لەوانەش شاردنەوەی شایەدی دانی حەق و ڕاستی)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە.**

# ٢٨

# دەركەوتنى نەزانين

خوداى ميهرەبان عزوجل فەرمانى بە پێغەمبەرەكەى ﷺ داوە بەفێربوونى زانست و زانيارى لەئايەتێكى پيرۆزدا بەپێغەمبەر دەفەرموێت ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ ﴾ طه/١١٤

**واتە// (( ئەى پێغەمبەر درودى خواى لەسەر بێت، بڵێ ئەى پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانيارى زۆرترو زياترم پێ ببەخشە))**

پێغەمبەر ﷺ نەزانينى زەمكردووە دەفەرمووێت: (( إن الله يبغض كلَّ جعظري - أي الغليظ في طبعه - طوَّ -أي أكول-، سخّاب في الأسواق - أي يرفع صوته في الأسواق -، جيفة بالليل، حمار بالنهار، عالم بأمر الدنيا، جاهل بأمر الاخرة ))

**واتە: ((خوداى گەورە تووڕەيە لەكەسێك سروشتى توندوتيژى هەبێت، زۆر خۆربێت، لەبازارەكاندا هاواربكات، لاشەيەكى بۆگەن بێت لەشەودا، گوێ درێژێك بێت لەرۆژدا، زانا بێت لەكارو بارى دونيا، نەزان بێت لەكارو بارى دوارۆژ))** ابن حبان ريوايەتى كردووە.

پێغەمبەر ﷺ هەواڵى داوە كەلەنيشانەكانى رۆژى دوايى بڵاوبوونەوەى نەزانينە بۆيە دەفەرمووێت ((إن بين يدي الساعة لأياماً يرفع فيها العلم وينزل فيها الجهل)) **واتە: ((لەپێش هاتنى قيامەتدا رۆژانێك هەن زانست نامێنێ و بەرزدەكرێتەوە، وە نەزانين تێيدا دێتە خوارەوە))** متفق عليه.

لەريوايەتێكى ديكە هاتووە ((إن بين يدي الساعة لأياماً يرفع فيها العلم، ويفشو فيها الجهل))

**واتە: ((لەپێش هاتنى قيامەتدا رۆژانێك هەن زانيارى تێيدا بەرزدەكرێتەوە وە نەزانين تێيدا بڵاو دەبێتەوە))** ئەحمەد ريوايەتى كردووە.

وەدەفەرموێت ((يأتي على الناس زمان لايَدري فيه ما صلاة؟ ما صيام؟ ما صدقة؟))

**واتە: ((زەمانێك بەسەر خەڵكدا دێت نازانێت نوێژ كردن چيە؟ وە رۆژو گرتن چيە؟ وەسەدەقەو خێرو چاكە چيە؟))** تەبەرانى ريوايەتى كردووە

هەروەها دەفەرموێت ((بين يدي الساعة..وذكر منها: ويظهر الجهل)) **واتە: (لەپێش هاتنى قيامەتدا ...باسيكرد لەمانەش ((نەزانين دەردەكەوێت)** ئەحمەد ريوايەتى كردووە.

لەبيركردنــەوەو ئاواتى حاڵەتى خەڵكى ئەمڕۆ لەزۆربەى وڵاتانى ئيســلام، ســەير دەكرێ

کـە ئەوانـە ئیش وکار دەکەن بۆ گوزەراندنی ژیانیان و بەرژەوەندیان، دەزانێت یەکێک چۆن مامەڵەدەکات لەگەڵ کۆمپیوتەرو لەگەڵ مۆبایل، وە ئۆتۆمبیل وشتی دیکە...

بەڵام کاتێک پرسیاری لێ دەکەیت: مانای الله الصمد چیە؟ ..مانای (غاسق اذا وقب چیە؟ ..کەی سوجدەی سەهوودەبەیت پێش سەلام دانەوە یان پاش سەلام دانەوە؟ ...دەبینیت سەری بەتاڵە.

بەڵێ .. نەزانین بەدیار دەکەوێت.

تاوەکو یەکێکیان رۆژێک پرسیاری لێکردم ئایا دەست نوێژ هەڵگرتن واجبە پێش نوێژی سوننەت و غەیرە واجبەکان، یان تەنها دەست نوێژ هەڵگرتن واجبە بۆ نوێژە فەرزەکان؟ من سەیرم پێهات لەپرسیار کردنەکەی، وە زیاتر سەرسورمان بووم کاتێک زانیم کە ئەو قوتابیە لەقۆناغی سێ یەمی زانکۆ.

جگە لەمەش نەزانینی زۆر هەیە لەناو خەڵک لەیاساکانی تەڵاق و مارەیی و، کڕین و فرۆشتن و خواپەرستی، لەگەڵ ئەوەش زۆر پێویستیان پێی هەیە، واگومان دەبەم ئەمە هۆکارێکە بۆ زۆری مەلهاو شوێنی رابواردن و، خەریک کردنی خەڵک بە کاروباری گوزەراندن، وازهێنانیان لەوەرگرتن و کۆکردنەوەی زانیاری و، دانیشتن لەگەڵ زانایان و، خوێندنەوەی کتێبە شەرعی و یاساکان.

خودای گەورەش یارمەتیدەرە



٢٩ ٣٠ ٣١

# زۆر بوونی ڕەزەیلی و چرووکی، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، دراوسێی خراپ



لەنیشانەکانی رۆژی دوایی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیە دەروونیەکانە کە کۆمەڵگای ئیسلامی لێک هەڵدەوەشێنێتەوە، لەوانەش ڕەزیلیە .

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لێبێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت **((لەنیشانەکانی رۆژی دوایی ڕەزیلی دەردەکەوێت))** تەبەرانی ریوایەتی کردووە.

لەئەنەش رەزای خوای لێبێت، دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (( لايزداد الأمر إلاشدة، ولايزداد الناس إلا شُحاً)) واتە: **((کارەکان زیاد نابن تەنها بەرچاوتەنگی ناخۆشی دەبێت، وە خەڵکیش لەڕەزیلی و پیسکەیی چیتر پەرەپێنادەن))** ابن ماجە ریوایەتی کردووە.

هەروەها دەفەرمووێت ((يتقارب الزمان، وينقص العمل، ويُلقى الشّحّ، وكثر الهرج)) واتە: **((ڕۆژگار لێکنزیک دەبێتەوە وەکارکردن کەم دەبێتەوە، وەچرووکی زۆر دەبێت، وەکوشت وکوشتاریش زۆر دەبێت))** بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە.

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت ((لاتقوم الساعة حتى يظهر الفحش، والتفاحش، وقطيعة الرحم، وسوء المجاورة)) واتە: **((قیامەت هەڵناستێ تاوەکو خراپەکاری، وە قسەی ناشیرین و ناڕێک، وەپچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، وەخراپی دراوسێ یەتی دەردەکەوێت))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

ئەبو هورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((والذي نفسي بيده ، لا تقوم الساعة حتى يظهر الفحش ، والبخل ، ويخون الأمين ، ويؤتمن الخائن ، وتهلك الوعول ، وتظهر التحوت . فقالوا : يا رسول الله ، وما الوعول ، وما التحوت ؟ قال

: الوعول وجوه الناس ، وأشرافهم، والتحوت الذين كانوا تحت أقدام الناس لا يُعلم بهم))
**واته: ((سوێند بەو کەسەی گیانی محمدی بەدەستە، قیامەت هەڵناسێ تاوەکو خراپەکاری وڕەزیلی دەردەکەوێت، دەست پاک ناپاک دەبێت ناپاکیش پاک و باوەڕپێکراو دەبێت، وە مرۆڤی چاک و شەریف لەناودەچێت و خەڵکی هیچ و پووچیش دەردەکەوێت)) ئینجا ووتیان (الوعول) چیە وە (التحوت) چیە؟ فەرمووی ((الوعول : خەڵکە دیارو چاکەکانیان، وە التحوت: ئەو کەسانەی هەمیشە لەژێرپێی خەڵکان بوون و کەم نرخەکەنیانن))** حاکم ڕیوایەتی کردووە.



ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە ڕاست دەرچووە، وا دەبینین فەساد ئاشکرا دیارە لەنێو زۆربەی خەڵکاندا، وە دەشبینین پچڕاندن و خراپی دراوسێ پەیدابووەو، ڕەق هەڵسان و تورەیی، لەنێوانیاندا جێگای خۆشەویستی و ڕەحم و بەزەیی گرتۆتەوە، تاکو ئێستا دراوسێ دراوسێکەی خۆی ناناسێت و، خەڵک خزمی نزیکی خۆی ناناسێت ڕەحمی بۆ ناچێت، ئایا ئەوانە لە زیندووەکانن یان لەمردووەکانن.

## ٣٢

# دەرکەوتنی خراپەکاری

خراپەکاری بریتیە لە ئاسانکردنی پۆشاکی بێشەرمی، و ووتە ناشیرین و ناماقوولەکان کەوا خەڵک شەرمی لێدەکات، وە جوێن دان و زمان پیسی.

وەلەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەرکەوتنی خراپەکاری و داوێن پیسیە.

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویێت ((والذي نفس محمد بيده، لا تقوم الساعة حتى يظهر الفحش)) **واته: ((سوێند بەوکەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، قیامەت هەڵناسێ تاوەکو داوێن پیسی و خراپەکاری دەردەکەوێت..))** حاکم ڕایوایەتی کردووە.

## ٣٣

# ناپاک کردنی دەست پاک، وە باوەڕ کردن بەناپاک

ئەمە لەنیشـــانەکانی ڕۆژی دواییە، کەوا باسـکراوە لەنیشـــانەکانی ڕۆژی دوایی ئەمانەت و ڕاسپاردە بەرزدەکرێتەوەو نامێنێت، وە کارو بارەکە دەدرێتە یەکێکی تر جگە لەخاوەنەکەی، وە لەنیشانەکانیشی : دەستپاک بەناپاک دادەنرێت، کە گومانی لێدەکرێت وەباوەڕی پێناکرێ لەئەمانەت کردن وراستگۆییەکەی، کەچی باوەڕبەدرۆزن و دووڕوو دەکرێت کەهەردەم مەیل و ئارەزووی لەناپاکیە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (( والذي نفس محمد بيده، لاتقوم الساعة حتى..وذكر منها: ويخون الأمين، ويؤتمن الخائن )) **واتە: ((سوێند بەوکەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە قیامەت هەڵناستێ تاوەکو ....وەباسیکرد لەمانەش : دەستپاک بەناپاک دادەنرێت، وە ناپاکیش بەپاک و باوەڕپێکراو دادەنرێت))** حاکم ڕیوایەتی کردووە.

## ٣٤

# نەمانی پیاوچاکان و دەرکەوتنی کەسانی بێ نرخ


هەزارەها کەس لەدەوری یەکێک لەگۆرانی بێژەکان کۆبوونەتەوەو لەسەر ملی خۆیانیان هەڵگرتووە

ئـــەمـــەش لـەنـیـشـانـەکـانـی ڕۆژی دوایـیـە کـەوا پیاوچاکان دەمـرن، دەسـەڵاتـدارەکانیان، ئـاقـلـمـەنـدەکـانـیـان، زاناکانیان، پاشان جێگرەکەی دەردەکەوێت و، کـەسـانـی بێـنـرخ و خـراپ دەردەکەون، ئەمانە کەسانی نەزان و گێرەشێوێنن، چونکە ئەمانە کەش و هەوایان بۆ چۆڵ بووە.



هەزارەها کەس لەدەوری یاریزانێك کۆبوونەتەوەو لەسەر ملی خۆیانیان هەڵگرتووە

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((والذي نفسي بيده ، لا تقوم الساعة حتى.. وذكر منها: ويهلك الوعول ، وتظهر التحوت . فقالوا : يا رسـول الله ، ومـا الوعول ، وما التحوت ؟ قال : الوعول وجوه الناس ، وأشرافهم، والتحـوت الذين كانـوا تحت أقدام الناس لا يُعلم بهم)) واتە: ((سوێند بـەو کەسـەی گیانـی موحمـەدی بەدەسـتەوەیە، قیامەت هەڵناسـێ تاکو..وەباسـیکرد لەوانە (( پیاوی چاک لەناو دەچێت و پیاوی نەزان و گێـل و بـێ نـرخ دەردەکەوێت))،

ئینجـا وتیان: ئەی پێغەمبـەری خوا (الوعول) چیە و؟ (التحوت) چیـە؟ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەمووی ((الوعول پیاوماقوول و بەشەرەفەکانیان والتحوت ئەو کەسانەن کە لەژێر پێی خەڵکیدا بوون کەس پێیان نەدەزانی)) حاکم ریوایەتی کردووە

کەسانی نـەزان و بێنرخ بەهۆی بـەرزبوونـەوەی پایەو مەنسەبەکانیان دەردەکـەون، وەخزمەتکردنی هۆیەکانی راگەیاندن بۆیان و، زۆربوونی دەهۆڵ کوتەکان لەچواردەوریان، وکەسانی نەجیبزادەو ئاقڵمەندو ئامۆژگارکاران ئـەوانـەی لەبەر دڵـی خەڵکانن، دوور کەوتوونەتەوە لەهۆکارەکانی راگەیاندن.

لەناو خەڵکدا کەس بەناوبانگ نابێت جگەلە گۆرانیبێژو سەماکەرو خراپەکاران، بەڵام کەسانی زاناو داهێنەرو هەڵکەوتوو لەپزیشکی و ئەندازە...و زۆریش لەمانە ئەوا جێگایان نیە.

ئەم نیشانەیەش دیارو ئاشکرایە.

هێشتا خەڵکانێک هەن خواست و ئارەزوویان هەیە لەسەر باسکرد ن و ووتاردانی ئایینی، وە لەزۆربەی ووڵاتان دەبینین رێزگرتنی موسڵمانان هەیە لەزانایان و بانگەواز خوازان و، پێداگیری دەکەن لەسەر دانیشتنە ئایینیەکان و، سەیرکردنی بەرنامە ئاسمانیەکانی دینی و، کەناڵەپارێزراوەکان لەشتی خراپە رۆژ لەدوای رۆژ لەزیاد بووندان، بەڵکو خواستی کەسانی غەیرە موسڵمانیش هەیە لەسەر ووتارە ئایینیەکان ئەمەش کردارێکی لێووردبوونەوەیەو، سوودێکی زۆریش دەگەیەنێت.

٣٥

# گوێدان بەسەرچاوەی پارەکۆکردنەوە لەحەلال یان لەحەرام

ئەگەر موسڵمان ترسانی لەخودا کەم بێت ئەوا دینەکەشی کەم دەبێت، وە ئەگەر دینەکەی کەم بێت ئەوا دەکەوێتە ناو شتە گوماناویەکان، پاشان دەکەوێتە ناوحەرام و گوێ پێنادات بەسەر چاوەی پەیداکردنی پارەو پوولەکەی، ئایا ئەمە لە حەڵالە یان لەحەرامە؟ ئەمەش لەسەردەمی ئێمەدا ڕوویداوەو سەلمێندراوە لەوەی کە پێغەمبەری خوا دروودی خوای لەسەر بێت فەرموویەتی : لەئەبو هورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((ليأتين على الناس زمان لايبالي المرء بما أخذ المال، أمن حلال ام من حرام)) واتە: **((سەردەمێک بەسەر خەڵکی دادێت، مرۆڤ گوێ پێنادات پارەکەی لەکوێوە پەیدادەکات، ئایا لەحەڵاڵە یان لەحەرامە))** بوخاری ریوایەتی کردووە.



ئەگەر ئەمرۆ لێی ووردبێنەوە دەبینین کەوازۆربەی خەڵک هەڵپەیانە لەسەر کۆکردنەوەی پارە لەهەموو روویەک، حەڵاڵ یان حەرام.

لەم پێناوەشدا بەڵێنەکان هەڵدەوشێتەوەو، خەلکیش ئاسانکاری دەکات لەکارەکان و بازرگانیکردنی شتە قەدەغەکراوەکان، وەک بازرگانی دەکات بەفرۆشتنی جگەرە، یان عارەق یان جل و بەرگی ئافرەتان کەتەنک و ڕووتن یان مامەڵە کردن بە سووخۆری یان بەکرێ گرتنی شوێنەکان بۆ ئەوانەی ئەم بازرگانیە قەدەغەکراونە دەکەن.

خودای گەورە دەفەرمویت ﴿كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ المؤمنون /٥١ **واتە// ((بخۆن لەرزق و رۆزیە چاک و پاکەکان))**

خودای گەورەش پاک وبێگەردە و تەنها پاک و بێگەردیشی دەوێت، و هەرگۆشتێک لەکاری نارەوا گەشەی کرد ئەوا حەرامەو ئاگریش جێگای ئەوە.

وەخۆپاراستن و ترسان لەشتە گوماناویەکان بووەتە نامۆ لەو خەڵکدا، نموونەکانیش زیاترە

لەپێداویستیەکان، بەڵکو لەوانەیە لەپایەو وەزیفەکەی بەردەوام نەبێت ئەگەر بەرتیل وەرنەگرێت.
پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((فمن اتقى الشبهات فقد استبرأ لدينه وعرضه ومن وقع في الشبهات وقع في الحرام )) واتە: **((هەرکەسێک لەترسی خودا خۆی پاراست لەشتی شوبهەو گوماناویەکان ئەوا بێتاوان و سەمەلات دەبێت بۆ دین و ئابڕووەکەی وەرهەکەسێک بکەوێتە ناوشتی شوبهەو گوماناوی ئاوا دەکەوێتە ناوحەرام))** بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە، لەخودای گەورە دەپاڕێینەوە هیدایەتمان بدات و ڕاگیراومان بکات لە سەر ئەم دینە.

# ٣٦
# وەرگرتنی دەستکەوت و غەنیمەکان لەنێوان خۆیاندا

بریتیە لەو دەستکەوتانەی کە موجاهیدەکان بەدەستیان دەکەوێت لەپارەوشتی دیکە، بەبێ شەڕکردن، یان بەهەڵاتنی دوژمن، یان بەخۆتەسلیم کردنەوەی، ئەمەش دابەش دەکرێت هەروەک خودای گەورەو میهرەبان فەرمانی داوە دەفەرموێت

﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ﴾ (الحشر/٧١)

**واتە// (ئەو دەستکەوتانەی، خوا بەخشی بەپێغەمبەرەکەی لەخەڵکی دێهات و شارەکانی جوولەکە، ئەوا بڕیاری لەسەر داوە کە بۆ پێغەمبەرو خزمانیەتی، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانیشە، بۆ ئەوەی ئەم سامانە تەنها لەنێوان دەوڵەمەندەکانی ئێوە دانەبێت)**

وە خوای گەورە فەرمانی پێداوە بەدابەشکردنی کەوا ڕوونی کردۆتەوە، تاوەکو دەوڵەمەندەکان دەستی بەسەردا نەگرن کە زۆربەی هی هەژارەکانە.

لەکۆتایی زەماندا خەڵکی پێچەوانەو ناکۆکی دەکات لەدابەشکردنی خودای گەورە عزوجل و دەوڵەمەندو سەرکردەکان دەستکەوتەکان لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن.

وەک لەحەدیسێکدا ئەبوهورەیرە ڕەزا خوای لەسەر بێت دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((إذا اتخذ الفيء دولاً والأمانة مغرماً .. )) واتە: **((ئەگەر دەستکەوتەکان لەنێوان دەوڵەمەندەکان دابەشکرا، ئەمانەتیش لەناو دەچێت))** ترمزی ریوایەتی کردووە ئەمەش بەتەواوەتی هاتۆتە جێ، سەیری نیشانەی ژمارە (٤٥) بکە لەنیشانە بچووکەکان.

## ٣٧
# ئەو کاتەی سپاردە دەبێتە دەستکەوت و غەنیمەت

خودای گەورە فەرمانی داوە بەپاراستنی ئەمانەت و گەڕانەوەی بۆ خاوەنەکەی وەک ئەم ئایەتەپیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموویت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾ (النساء/٥٨)

**واتە// ((بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە هەموو ئەمانەت و سپاردەکان بگەڕێننەوە دەست خاوەنەکانیان))**

الامارة

لەکۆتایی ئەم سەردەمە کاتێک ئەمانەت دەدرێتە پیاوێک بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکات بەڵام ئەو وای دادەنێت کە غەنیمەو دەستکەوتەو دەستی بەسەرردادەگرێت و خاوەنەکەی بەدرۆدەخاتەوە ونکۆڵی لێدەکات و بۆی ناگەڕێنێتەوە.

## ٣٨
# ئەوانەی دەروونی خۆیان پاک ناکەنەوە بە دەرهێنانی زەکاتەکانیان (وادەزانن قەرزو غەرامەیە)

بنچینەکەی وایە کە دەبێت دەروون پاک بکرێتەوە بەدرەهێنان و پێدانی زەکات لەپارەو زێرو شتی لەم بابەتە، چونکە پاک کەرەوەیە بۆماڵ و سامان و نزیک بوونەوەشە لەخودای گەورە و دلۆڤان، ئەمە نە (باجە) و نە(سەرانە)شە.

لەکۆتایی زەماندا کەسانی وا هیچ و پووچ و ڕەزیل بڵاودەبێتەوە، هەندێ دەوڵەمەند واهەستدەکات کاتێک زەکات دەدەن وەک غەرامەلێیان وەدرەگیرێت، ئەمانە نەدەروونیان پاک دەبێتەوەو نەپاداشتی چاکەش وەردەگرن چونکە بەنیەت و مەبەستێکی پاک نایدەن.

## ٣٩

# فێربوونی زانست بۆ غەیری خوا



ئەسڵەکەی وایە کەمرۆڤ خۆی تەرخانبکات بەفێربوونی زانستی شەرعی و بڵاو کردنەوەو فێرکردنی خەڵکی.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((إن الله وملائكته وأهل السموات والأرض حتى النملة في حجرها وحتى الحوت في البحر ليصلون على معلم الناس الخير))

واتە: ((**بێگومان خوداو فریشتەکانی ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی تەنانەت مێروو لەکونەکەیداو تەنانەت نەهەنگیش لەناو دەریادا سەلاوات دەنێرن بۆ چاکترین مامۆستای خەڵک**)) ترمذی ریوایەتی کردووە، لەکۆتایی سەردەمدا گەل و نەتەوەکان فێری زانستی قورئان و سوننەت و فیقهو، تێگەیشتوو دەبن بۆ غەیری خودا بەلکو بۆ ناوبانگ و دەرکەوتن و شتی دیکە.

وەک لەحەدیسێکدا هاتووە ئەبو هویرەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((ئەگەر دەستکەوت و غەنیمە لەنێوان کەسانی تایبەت دابەش کرا،... وە فێربوونی زانست بۆ غەیری دین...)) ترمذی ریوایەتی کردووە. ئەمەش بەتەواوەتی هاتۆتە جێ.

## ٤٠

# ملکەچی بۆ خێزان و ڕەنجاندنی دڵی دایک



ئەمەش لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە، کەوا پیاوێک دڵی دایکی بڕەنجێنێ و مافی پێشێل بکات وە لەخێزانی نزیک بکەوێتەوەو گوێڕایەڵی بێت لەدڵ ڕەنجاندن و تاوانکردن بەرامبەر دایکی یان باوکی زۆر جاران شتی ئاواش ڕوویداوە.



ئەمەش دیاردەیەکی ئەمڕۆیە، دەبینیت زۆر جاران دایک بەتەنها لەماڵێک ژیان بەسەردەبات و منداڵەکانیشی سەردانی ناکەن یان زۆرکەم، بەڵام ژن و منداڵەکانی لەخۆشی و پێکەنین و ڕابواردن و سەرداندان.

ئەگەر دایک و باوک لەگەڵ منداڵەکان ژیان و هیچ گرنگی و شکۆمەندیان پێنەدرا تەنها بۆ خەڵکی و غەیری ئەوان.

ئـەوا پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت ((إذا اُتخذ الفيء دولاً..وأطـاع الرجل امرأته وعقّ أمه، وأدنى صديقة وأقصى أباه..)) واتە: **((ئەگەر دەسکەوت لەنێوان دەولەمەندەکان دابەشکرا،....و پیاوێک گوێڕایەلی ژنەکەی بێت و مافی دایکی پێشێل کردو لەگەڵ برادەرەکانی دانیشت و لێیان نزیک بووەوە بەڵام لەگەڵ دایکی و باوکی دانەنیشێ و پشت گوێیان بخات،...))** ترمذی ریوایەتی کردووە، ئەمەش بەتەواوەتی هاتۆتە جێ، سەیری نیشانەی ژمارە (٤٥) بکە لەنیشانە بچووکەکان.

## ٤١

# دانیشتن لەگەڵ برادەران و پشت گوێ خستنی دایک و باوک



ئەمەش لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە و لەدڵ ڕەنجاندنە، کاتێک لەگەڵ برادەران و هاوڕێیان دادەنیشێت و ڕادەبوێرێ وقسەی خۆش و پێکەنین بۆ هاوڕێیانی و برادەرەکانی دەکات و، دایک و باوکیشی پشتگوێ دەخات.

و لەوانەیە لەزەت وەرگرتنی گەنجان و ڕابوردن بەدانیشتن لەگەڵ هاوڕێکانی زیاتر خۆشتربێت لەڕابواردن و دانیشتن

لەگەڵ باوکی، ئەگەر هاتوو باوکیشی بەتەمەن و گەورە بێت، لەوانە زۆر لۆمەو رەخنەی ئاڕاستەبکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەبێت کوڕەکانی بزانێت کەهەقێکی شەرعی لەسەری هەیە.

وەک خودای گەورە دەفەرموویێت ﴿ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾ واتە// ((چاکە لەگەڵ

## ٤٢

# دەنگ بەرزکردنەوە لەناو مزگەوتەکان

لەبنچینەدا مزگەوتەکان ڕێزو دڵنیایی و شکۆمەندی دەپۆشن، وە لەنیشانەکانی رۆژی دوایی دەنگ بەرزکردنەوەو، دەمەقاڵەو مشتومڕە لەناو مزگەوتەکان.



## ٤٣

# دەسەڵات گرتنە دەستی کەسانی بێ نرخ بەسەر گەلانی موسڵمان

لەڕاستیدا لەویلایەتەکان و خاوەن دەسەڵاتەکاندا چاکەکاران و زانایان و دادپەروەران، فەرمانڕەوایەتیان دەکرد، بەڵام زەمانێک دێت کەسانی خراپ و بێنرخ دەبێتە فەرمانڕەواو سەرکردایەتی نەتەوەکەی دەکات، یان لەبەر زۆری سەروەت و سامانە کەهەیەتی یان پەیوەندارە، یاخود بۆ خۆهەڵکێشانەکەیەتی، یاخود بەتوانایە، یان لە بنەمایەکی ناسراوە.



## ٤٤

# سووک و ڕیسواترین کەس دەبێتە پێشەوای نەتەوەکەی

ئەمە وەک ئەوەی پێشوو کەباسمان کرد، ئەمە پێشەواو سەرداری قەومەکەی دەکات وەک ئەوەوایە لەسەردان دابێت، یان لەکاروبارێک کۆبێتەوە، یان لەکێشەیەکدا، ئەمانە چاکەکاران و دادپەروەران پێشەوایان ناکەن، بەڵکو سووک و ڕیسواترینیانن.

ئەمەش لەبنچینەدا یان زەمانەکە خۆی فەسادە، یان زاڵبوونی سووک و ڕیسواکانە.



## ٤٥

# ڕێگرتنی پیاوێک لەترسی شەڕو ستەمەکەی

ئەمەش بۆ دەسەلاتگرنە دەستی ئاژاوەگێڕان و دەرکەتنیانە، تاوەکو ناچار دەکرێت بۆ ڕێزگرتنی پیاوەکە و لەوانەیە ڕێزگرتن و ماچکردنی سەریشی لەترسی ئەزیەتدان و شەڕەکەی بێت، بۆ تووندو ڕەقی ستەمەکەی و دەستدرێژیەکەی .

وە هەموومان شایەدی ئەوە دەدەین کە لەوەی لەئەبو هوریرە ڕەزای خوای لەسەر بێت دا هاتووە، کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت((إذا اتخذ الفيء دولا ، والأمانة مغنما ، والزكاة مغرما ، وتعلم لغير الدين ، وأطاع الرجل امرأته ، وعق أمه ، وأدنى صديقه ، وأقصى أباه، وظهرت الأصوات في المساجد ، وساد القبيلة فاسقهم ، وكان زعيم القوم أرذلهم ، وأكرم الرجل مخافة شره ، وظهرت القينات والمعازف ، وشربت الخمور ، ولعن آخر هذه الأمة أولها، فليرتقبوا عند ذلك ريحا حمراء ، وزلزلة وخسفا ومسخا وقذفا وآيات تتابع كنظام بال قطع سلكه فتتابع)) واتە: **((ئەگەر دەسکەوت لەنێوان دەوڵەمەندەکان دابەشکراو، ئەمانەتیش بووە دەسکەوت، وەزەکات دانیش بووە زەرەرو غەرامەو، فێربوونیش بۆ غەیری دین بوو، وە پیاوێک ملکەچی ژنەکەی بکات و مافی دایکی پێشێل بکات و، لەگەڵ برادەرەکانی نزیک بێتەوەو، دایک و باوکیشی پشتگوێ بخات، وەدەرکەوتنی دەنگە دەنگ لەناومزگەوتەکان، گەورەی قەبیلەیەک خراپترین کەس بێت، وەڕێزگرتنی پیاوێک لەترسی ستەم و شەڕەکەی و، دەرکەوتنی گۆرانی بێژو سەماکەرو مۆسیقا، وەعارەق بەئاشکرا بخورێتەوە، ئاخیرین ئوممەت نەفرەت لەئوممەتی پێش خۆی بکات، بالەو کاتەدا چاوەڕێی بایەکی سووربکەن و، بوومەلەرزەو زەوی روو چوون، چۆن تەسبێحێک داوەکەی بپسێت و دەنکەکانی بەدوای یەکدا دێن))** ترمذی ریوایەتی کردووە.



٤٩ ٤٨ ٤٧ ٤٦

# حەڵاڵکردنی داوێن پیسی و ئاوریشم بۆ پیاوان و خواردنەوەی عەرەق و گۆرانی گوتن و مۆسیقا

لەوشتە قەدەغەکراوە ئاشکرایانەی کە موسڵمان ڕێزو حورمەتی ناگرێت وەک: داوێن پیسی و، خواردنەوەی عەرەق و، ئامێری مۆسیقا بێئابڕووەکان و، پۆشاکی ئاوریشم بۆ پیاوان، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت، هەواڵی داوە لەکۆتایی زەماندا تیپێک بەئوممەتەکەی ئەو قەدەغەکراوانە حەڵاڵ دەکەن، وە نیشانەکانی نزیک بوونەوەی قیامەتی ژمارد.



حەڵاڵ کردنی ئاوریشم بۆ پیاوان

**مانای حەڵاڵکردنیان بۆ ئەو قەدەغەکراوانە، یەکێک لەم دووشتانەیە:**

١. بڕوایان وایە حەڵاڵکردنی ئەو کاروبارانە، ئەمانە حەرام نین.

٢. یان بەئاسانی ئەو کارانە دەکەن و بڵاو دەبێتەوە لەنێو خەڵک تاوەکو وای لێدێت نە زوبانەکان و نەدڵەکان نکوولی لێ ناکەن، وەخەڵکەکە هەست ناکات ئەم شتە حەرامە لەکاتی پێ هەڵسانیان بەم کارە.

لە ئەبی عامر یان ئەبی مالیکی ئەشعەری ڕەزای خوایان لەسەر بێت دەڵێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((ليكونن من أمتي أقوام ، يستحلون الحر والحرير ، والخمر والمعازف ، ولينزلنَّ أقوام إلى جنب علم ، يروح عليهم بسارحة لهم ، يأتيهم - يعني الفقير - لحاجة فيقولون : ارجع إلينا غدا ، فيبيتهم الله ، ويضع العلم ، ويمسخ آخرين قردة وخنازير إلى يوم القيامة))

**واتە: ((لەئوممەتی مندا کۆمەڵێک پەیدا دەبن کەوا داوێن پیسی و ئاوریشم بۆ پیاوان و**

**عەرەق و مۆسیقا حەلاڵ دەکەن، وە کۆمەڵێک دادەبەزن لەلای شاخێک بۆ رابواردن و شەوبەسەربردن بەگۆرانی گوتن و داوێن پیسی جاکاتێک هەژارێ دێ داوای یارمەتی دەکات لێیان ئەواپێی دەڵێن: بەیانی وەرەوە جا خوای گەورە شەو لەناویان دەبات و شاخەکەیان بەسەردا کاول دەکات و زۆریان لەناو دەچێت و ئەوانی تریش دەبنە مەیمون و بەراز تارۆژی دوایی))** بوخاری ریوایەتی کردووە.



بڵاوبوونەوەی بازرگانی عەرەق لەووڵاتە ئیسلامیەکان

ئەمرۆ ژمارەیەک لەوڵاتانی موسڵمانان ئاسانکاریان کردووە بەداوێن پیسی و عەرەق خواردنەوە، وە ڕۆڵی داوێن پیسی و بێئابڕوویی پارێزراوە لەژێر ناوی یاسا، بۆ خراپەکاری و داوێن پیسی پڵیتی ڕەسمی دەردەکات.

بەڵام عەرەق ئێستا بووەتە کارێکی ئاشکراو رۆژانەو سەقامگیری هەندێ دەوڵەتی عەرەبی بۆ بازرگانی کردن لەبازاڕەکاندا.

ئەبومالیکی ئەشعەری رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لیشربن ناس من أمتي الخمر يسمونها بغير اسمها يَعْزِفُ على رؤسهم بالمعارف والمغنيات يخسف الله بهم الأرض ويجعل منهم القردة والخنازير)) **واتە: ((هەندێ خەڵک لەئومەتی مندا عەرەق دەخۆنەوەو ناوی دیکەی لێدەنێن وەلەسەر سەریان ئامێری مۆسیقا دەژەندرێ و گۆرانی دەووترێ، خوای گەورە بەزەویدا دەیانباتە خوارەوە وە هەندێکیشیان دەکات بەمەیموون وبەراز))** ابن ماجە ڕیوایەتی کردووە

وە لەترسناکترین یاخی بوون لەخودا ئەمرۆ زۆربەی خەڵک هۆشیان لەگوێگرتنی گۆرانی و ئامێرەکانی مۆسیقایە و ئەمەش گەورەترین هۆکارە لەنەخۆشیەکانی دڵ و ڕێگرە لەیادوزیکری خودای گەورە و لەنوێژکردن، وە لەگوێگرتن لەقورئانی پیرۆزو سوود وەرگرتن لێی.

وەک خودای گەورە دەفەرمووێت ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾ ﴾ لقمان/٦

**واتە// (( هەندێک لەخەڵکی هەن قسەی خێرو بێ مانا دەکڕن (وەک**

**گۆرانیە ناپوختەکان، کتێب و شریتە بێ خێرەکان...هتد)) تاخۆی و کەسانی تریش لەرێبازی خوا وێل بکات، بێ ئەوەی هەست بکات بەمەترسی کارەکەی، بزانێت چ کەتنێک دەکات بەخۆی و خەڵکی و بۆیە ئەوشتە بێ نرخ و خێرانە دەکرێت تاگاڵتە بەپەیام و رێبازی خوا بکات، ئا ئەوانە سزاو تۆڵەیەکی ریسواکەرو ئابرووبەر چاوەرێیانە))**



وەخاوەن زانست و زانیاریەکان ئایەتی لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ تەفسیر دەکەنەوە کە ئەمە گۆرانی گووتن و ئامێرەکانی رابواردنە.

پێغەمبەریش ﷺ ئامێرەکانی مۆسیقای بەداوێن پیسی و عەرەق خواردنەوە بەراورد کردووە، وەک دەفەرموێت ((ليكونن من أمتي أقوام يستحِلُّون الحِرَّ والحرير والخمر والمعازف)) واتە: **((لەئوممەتی مندا کۆمەڵێک پەیدادەبن کەداوێن پیسی و ئاوریشم بۆ پیاوان و عەرەق خواردنەوەو گۆرانی و مۆسیقا حەڵاڵ دەکەن))**



لەبەر توندی بڵاوبوونەوەی ئامێری مۆسیقاژەن ئەمرۆ لەکەناڵەئاسمانیەکانیان دامەزراندووە تایبەت بەپێشکەش کردنی گۆرانی بێئابرووەکان، هەروەها ئێستگەی رادیۆش تایبەتکراوە بەگۆرانی و مۆسیقا، بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر لەرۆژێکدا، هیچ ناوبری نیە، نە بۆ هەواڵەکان، نەبۆ قورئانی پیرۆز، ئەمەش لەنیشانەکانی رۆژی دواییە، وە لەبەڵگە راستیەکانی پێغەمبەرﷺ کە هەواڵی پێداوە، پێویستە لەسەر موسلمان زۆر ئاگاداری ئەمە بێت..

عەبدڵلای کوری مەسعود رەزای خوای لێ بێت دەفەرموێت (بێگومان گۆرانی گوتن دوو روویی لەدڵدا دەچێنێت هەروەک ئاو کشت و کاڵ دەچێنێت.

## ٥٠

# خەڵک مردن بەئاوات دەخوازێت



پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەهاتنی زەمانێک دەدات کە تێیدا ستەم و فیتنەو بەڵاو موسیبەت زۆر دەبێت تاوای لێدێت پیاوێک بەلای گۆڕی برادەرەکەی دا تێدەپەڕێت ئاواتە خوازە ئەو خاوەنی ئەو گۆڕە بوایە لەجیاتی برادەرەکەی کەوا تێیدایە، لەو کاتەی تووشی بەڵاو موسیبەتێک دەبێت و بۆ رزگار بوون لەو واقیعە تالە کە لە مردن ناخۆشترە بۆی .

لە ئەبوهورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل فيقول: يا ليتني مكانه)) واتە: **((قیامەت هەڵناستی تاوەکو وای لێدێت پیاوێک بەلای قەبرێکدا تێدەپەڕێت و دەڵێت: خۆزگە من لەجێگەی ئەو بوومایە))** متفق عليه

**ئیبن مسعود** رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت: **(زەمانێک بەسەرتاندا دێت ئەگەر یەکێکتان مردن بدۆزێتەوە بەپارە دەیکرێت)**

ئەم حەدیسەش دژایەتی ناکات لەگەڵ حەدیسەکانی تر کەمردن بەئاوات دەخوازێت وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لايتمنين أحدكم الموت لضُرٍّنزل به..)) واتە: **((هیچ یەکێکتان داوای مردن نەکات جگە لەو بەڵاو موسیبەتانەی بۆ دابەزیون))** موسلیم ریوایەتی کردووە

ئەمەش مەرج نیە ئەم هەستە بکەوێتە ناو دڵی هەموو موسڵمانێک لەکۆتایی زەماندا، بەڵکو دەبێت لەووڵاتیک هەبێت لەو وڵاتێک نەبێت و، بارو زوروفێک هەبێت لەبارو زروفێکی دیکە نەبێت، خەڵکیش هەمە جۆرن لەئیمانەکانیان و هێزی خۆڕاگریان لەبەڵاو موسیبەت، وە ئارام گرتنیان لەسەر خراپەکاران هەبێت.

# ٥١

# زەمانێک دێت پیاوێک بەیانی دەکاتەوە ئیماندارە وە ئێوارە دەکاتەوە کافرە

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بە گۆڕین و وەرگەڕانی باری خەڵک و ڕاڕایی و دوو دڵیان و جیاوازیان بەزۆربوونی فیتنەو ئـاژاوەو، بڵاو بوونەوەی ئارەزووەکان و هۆکارەکانی ڕابواردن، کەم بوونی خەڵکی چاکەکار بۆیە دەبینیت پیاو بەیانی دەکاتەوە ئیماندارە، وەئێوارەی بەسەردا دێت کافرە.



ئەبوو هوریرە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((بادروا بالأعمال فتنا كقطع الليل المظلم ، يصبح الرجل مؤمنا ويمسي كافرا ، أو يمسي مؤمنا ويصبح كافرا ، يبيع دينه بعرض من الدنيا))

واتە : **((پەلە بکەن لەو کارو کردەوەی چاکە لەفیتنەیەک وەک پارچە شەوێکی تاریک وایە پیاو بەیانی دەکاتەوە ئیماندارەو، ئێوارە کافرە، ئێوارە دەکاتەوە ئیماندارە بەیانی دەکاتەوە کافرە، دینەکەی خۆیان دەفرۆشن بەشتێکی بێ نرخی دونیا))** بوخاری ریوایەتی کردووە.

مەبەست لە حەدیسەکە پێداگریە لەسەر پەلەکردن بۆ کاری چاکە پێش ئەوەی پەشیمان ببیتەوەو، خەریک بوون پێوە بەوەی فتنەو ئاژاوەیەکی زۆر ڕووت تێبکات و کۆببیتەوە سەریەک وەک پارچە شەوێکی تاریک بەبێ مانگە شەو.

پێغەمبەر ﷺ بەجۆرێک وەسفی کردووە ناخۆشی و تەنگە تاوی ئەو فیتنەیە کە ئەمە پیاوێک ئێوارە دەکاتەوە ئیماندارە بەیانی دەکاتەوە کافرە، ئەمەش بۆ گەوریی فیتنەکە دەگەڕێتەوە، کەوا ئادەمیزاد لەیەک ڕۆژدا بەجۆرەوە دەگەڕێت.

ئەمە وەسفی زەمانێکە کەدینی مرۆڤ تێدا لاوازەو، شتە شوبهەو گوماناویەکان بەسەریدا زاڵ دەبێت و دینەکەی واز لێ دەهێنێت، یان ڕاڕا دەبێت و دینەکەی خۆی بۆ هەندێک بەرژەوەندی کەسایەتی لەکیس دەچێت و ئەم حەدیسەکەش بۆ واقیعی ئەم سەردەمە ڕاست و دروستە.

## ٥٢

# رازندنەوەی مزگەوتەکان و شانازی پێوەکردنی



لەبنچینەدا مزگەوتەکان رۆلیان هەیە بۆ پەرستنی خودای عزوجل، مرۆڤی موسلمان دروستی دەکات بۆ ئەوەی چاکەو پاداشتی دەستکەوێت.

بەڵام لەکۆتایی زەمان ژمارەیەک لەخەڵکی مزگەوت دروست دەکات و دەڕازێنێتەوە، وە هەموو کەسێک شانازی بەجوانی و رازاندەوەی مزگەوتەکەی دەکات کەوا دروستی کردووە، لەگەڵ ئەوەش لەوانەیە لەهۆکارەکانی ڕاگەیاندن دەریبخات و دڵەکانی نوێژکەر لە خواپەرستیەوە خەریک دەکات بۆ سەیرکردنی نەخشەکان.

لەئەنەس رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى يتباهي الناس في المساجد)) واتە: **((قیامەت هەڵناستێ تاوەکو خەڵک شانازی دەکات بەمزگەوتەکان))** ابو داودو نسائی و ابن ماجه ریوایەتیان کردووە.

ژمارەیەک لەسەحابیەکان خەڵکیان ئاگادار کردۆتەوە بەخۆ خەریک کردن بەجوانکاردنی مزگەوتەکان و لەجیاتی خۆت خەریک کەی بەبینایەکە واباشترە خەریک بیت بەخواپەرستی و زیکرو گوێرایەلی، ئبنو عەباس رەزای خوای لەسەر بێت دەفەرموێت (مزگەوتەکان دەرازێننەوە وەک چۆن جولەکەو دیانەکان مەعبەدەکانی خۆیان دەڕازێننەوە) امام احمدو ابو داود ریوایەتیان کردووە.

بەغەوی دەڵێت (دروستکردنی بەرزی بینایەکەو درێژە پێدانی و لەڕاستیدا یەهودو دیانەکانیش مەعبەدەکانی خۆیان دەرازانــدەوە لـەوکاتـەدا لەکتێبەکانی خۆیان لایانداو گۆڕیان) سەیری (فتح الباری) ٢/١٧٥ بکە



وە خەتتابی دەڵێت (لەڕاستیدا یەهودو دیانەکان کەنیسەکانی خۆیان دەرازندەوە پاشان دەیانفرۆشت لەکاتێکدا لەکتێبەکە لایانداو گۆڕیان و دینەکەیان بزرکردو روویان کردە نەخشاندن و جوانکردن.

### جوانکردنی مزگەتەکان ئەمڕۆ چەند وێنەیەکیان هەیە لەمانە :

نەخشاندنی دیوارەکان بەڕەنگاو ڕەنگ و بۆیەکردنی جۆراو جۆرو، دانانی وێنەو جۆرەها بەرماڵ و نەخش و گلۆپی جوان و گرانبەها، بەدەرجەیەک ئەگەر نرخی نەخشەکان و تێچووەکانی ئەو کریستالە گرانبەهایە کۆبکەیتەوە ئەوە بەس بوو بۆ دروست کردنی چەند مزگەوتێکی تر.



ئەمەش مانای ئەوەنیە مزگەوتەکان پشتگوێ بخـەیت یـاخـود بـەلاوازی دروسـتـی بـکـەیت، بـەلـکو تەنها مەبەستەکە زیادەڕەویە لەجوانکاری، ابی داود ڕەزای خـوای لـەسـەر بێت دەڵێت (ئەگـەر ئێوە مزگەوتەکانتان رازاندەوەو، قورئانەکانتان ڕەنگاو ڕەنگ کرد، ئەوا تێکچوون و بەهیلاک چوون لەسەرتانە) ابن ابی داود لە(المصاحف) ریوایەتی کردووە.

## ٥٣

# رازاندەوەی ماڵەکان و جوانکردنی

زۆر بوونی رابواردن و زیادە مەسرەفی و شانازی کردن و خۆبەگەورەزانین کارو کردەوەیەکی گوناهە، ﴿وَلَا تُسْرِفُوٓاْ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾﴾ (الانعام /١٤١)



**(زیادەرەوی مەکەن، چونکە خوا لەسنووردەرچوان و زیادە رەووی خۆش ناوێت)** وە لەکۆتایی زەماندا خەڵک شانازی دەکات بەپەردەگرانبەها نەخشاوەکان کەوا کۆکراوەتەوەو بەستراوە بەدیواری ماڵەکانیان.

لەئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێت، کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى يبني الناس بيوتاً يُوشونها وشْيَ المراحيل)) واتە: **((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو خەڵک خانوو دروست دەکات و دەینەخشێنێت وەک جل و بەرگە هێلداریەکان))** بوخاری ریوایەتی کردووە.



مانای حەدیسەکە: هێلکاری دەکەن و دیرازێننەوە وەک چۆن جل وبەرگ هێلکاری دەکەن و دەینەخشێنن.

ئەمە مانای ئەوەنیە کەدانانی پەردە یان جوانکردنی ماڵ و خانوبەرە حەرام بێت، بەڵکو حەرامەکە ئەوەیە زیادە رەوی لەمەسرەفی کردن و بەفیرۆدانی پارەو پوولە.

# ٥٤
# زۆر بوونی هەورە تریشقە لەکاتی نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی

هەروەها لەنیشانەکانی رۆژی دواییە، زۆر لەخەڵکی بەلێدانی هەورەتریشقە دەمرن.
لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت



((تكثر الصواعق عند اقتراب الساعة حتى يأتي الرجل القوم فيقول من صُعِق قِبَلكم الغداة فيقولون: صعق فلان وفلان وفلان)) واتە: **((لەکاتی نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی هەورە تریشقە زۆر دەبێت تاوەکو وای لێدێت پیاوێک لەقەومێک بەئەوانی تر دەڵێن کێ لەئێوە بەهەورەتریشقە مردووە، ئەوانیش دەڵێن: فلان و فلان و فلان ئەمڕۆ بەهەورە ترشیقە مردوون))**
احمد ریوایەتی کردووە

هەورەتریشقە بارگەیەکی کارەبایی گەورەیە لەئاسمانەوە دەردەچێت لەگەڵ بروسکەو گرمەگرمی هەور.

خودای گەورە عزوجل قەومی سەموودی بەهەورە تریشقە لەناوبردو دەفەرموویت ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ فصلت/١٧ **واتە// (هۆزی (ثەموود)یشمان رینمایی کرد بۆ ئیمان و چاکە، کەچی حەزیان بەکوێری کرد، تاچاو ساغی و هیدایەت و ئیمان، هەر بۆیە ئەوانیش سزای سەر شۆڕکەرو سەردانگەر یەخەی پێگرتن بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کەدەیانکرد)**

هەروەها دەفەرموێت ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾

فصلت/١٣ **واتە// (جا ئەگەر لەگەڵ ئەو هەموو باسی توانایی و دەسەڵات و زانایی خوای گەورەدا پشتیان هەڵکردو گوێیان نەگرت، پێیان بڵێ: من ئاگادارتان دەکەم لەوەی کە شریخەو بروسکەو کارەساتێکتان بەسەر بێت، وەک ئەوەی بەسەر عادو سەموود هات)**

لەبەر بەهێزی ئەو هەورە تریشقانە خودای گەورە ناوی لێناوە سامناک و تۆقێنەرو، خودای گەورە دەفەرمووێت ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ۝٥﴾ الحاقه/٥ **واتە// (ئینجا گەلی سەموودمان بەدەنگێکی سامناکی گەورەی تۆقێنەر لەناوبرد)**

٥٥

# زۆربوونی نووسین و بڵاوبوونەوەی

جاران نووسین و کتێب ئەوەندە بڵاونەدەکرانەوە، بەڵکو نەنووسین دیاردەیەک بوو لەنێو خەڵک، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەوا لەنیشانەکانی رۆژی دوایی دەرکەوتنی قەڵەم بلاوکردنەوەی کتێب و نووسینە.

لەئیبن مەسعود رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((إن بين يدي الساعة تسليم الخاصة، وفشوا التجارة حتى تعين المرأة زوجها على التجارة، وقطع الأرحام، وشهادة الزور، وكتمان شهادة الحق، وظهور القلم )) **واتە: ((لەپێش هاتنی قیامەتدا سەلام کردن تایبەت دەبێت لەکەسی ناسیاو، وەبڵاوبوونەوەوەی بازرگانی تاوەکو ئافرەتیش یارمەتی مێردەکەی دەدات لەبازرگانی کردندا، وە پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی و شایەت دانی بەدرۆو بەناهەق، و دەرکەوتنی قەڵەم))** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.



لەوانەیە مانای (وظهور القلم)

لەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ واتای دەرکەتنی نووسین و زۆر کێبە بڵاوکراوەکان و چاپکردنیانە، تاوەکو بووەتە خۆدەوڵەمەندکردن لەناو زۆربەی خەڵکی، بەهۆی زۆر بوونی هۆکارەکانی چاپکردن و وێنەگرتن و بڵاوکراوە نوێیەکان و لەگەڵ هەموو ئەمانە دەبینیت نەزانی بڵاوبۆتەوە لەناو خەڵکدا بەکاروبارەکانی شەرعیەکەیان و دینەکەیان.

هەروەها لەحەدیسێکدا ئەنەس ڕەزای خوای لەسەر بێت دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((إن من أشراط الساعة أن يُرفع العلم، ويظهر الجهل، ويفشو الزنا، ويشرب الخمر، ويذهب الرجل ويبقى النساء حتى يكون لخمسين امرأة قيِّم واحد)) **واتە: ((بێگومان لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە زانست و زانیاری بەرزدەکرێتەوەو نامێنێت، وەنەزانین دەردەکەوێت و، داوێن پیسی بڵاودەبێتەوە، وەعەرەق بەئاشکرا دەخورێتەوەو، پیاوان کەم دەبن و ئافرەتان زۆر دەبێت، تاوەکو بۆ پەنجا ئافرەت یەک پیاو کاروباریان رادەپەڕێنێ))**
متفق عليه

ئەم نیشانەیە دیاردەیەکە بۆ هەموو کەسێک کەحەزدەکات لەباری خەڵک و زانینی کاروباری دینەکەی شارەزابێت، لەخودا داواکرین کەهەمووومان لەزانستی دین شارەزا بکات.



# ٥٦

# پەیداکردنی سەروەت و سامان بەزوبان و خۆهەڵکێشان بەقسە

شوورەیی نیە ئەگەر یەکێک پارەو پوول پەیدا بکات و لەدونیا رەنج بکێشێ بەڕێگایەکی شەرعی و ڕێگەپێدراو، و لەگەڵ ئەوەشا پەیداکردنێکی دروست لەڕێگای ئاشکرا کردن و قسەکردن و بەڵگە هێنانەوە، کەوا چۆن پارێزەرو مامۆستاکان دەیکەن، وەهەموو پشت بەستنێکیان لەسەر ئەمەیە، بەڵام ئەوەی تاوانە ئەمەیە کە مرۆڤ دونیا بەزوبانەکەی بخوات، یان بەزۆری پێداهەڵگوتن و ستایش کرد بەناهەق بۆ ئەو کەسەی مافی ئەوەی نیە، یان بەسوێندخواردنی درۆ بەکڕین و فرۆشتندا، یان درۆکردن. وەشتی لەو بابەتە.



عەمری کوڕی سعد کوڕی ئەبی وەقاس چووە لای باوکی بۆ پێداویستیەک، باوکیشی بەقسەیەک پێداویستیەکەی جێ بەجێ کرد، ئەمەبوو، زیادە ڕەوی و دواندن و ستایشی کردن لەناو خەڵک بەو کەپێداویستیەکانی خۆیان بۆ یەکتر جێ بەجێ دەکەن، بەجۆرێک سەعد ئەم جۆرە قسانەی پێشتر گوێ لێ نەبوو، وەکاتێک کارەکەی تەواو بوو، سەعد ووتی، کوڕەکەم، تۆ ئیشەکەی خۆت تەواو کرد لەقسەکانت؟ ووتی : بەڵێ، ووتی: بەڵێ هێشتا لەپێداویستیەکانت دوورنەکەوتوویتەوە، وەلەتۆش خوا ناترسێنم لەو کاتەی قسەکانتم بیست، من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو((سیكون قوم يأكلون بألسنتهم كما تأكلون البقرة من الأرض)) واتە: **((قەومێک پەیدا دەبێت بەزوبانەکانیان دنیا دەخۆن وەک چۆن مانگا بەزوبانەکەی لەزەوی دەخوات))** ئەحمەد ڕوایەتی کردووە.

لەعەبدوڵلای کوڕی عەمرو ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((من اقتراب الساعة ان ترفع الأشرار ويوضع الأختيار ويقبح القول ويحسن العمل وتفري في القوم المساءة، قلت: وما المساءة؟ قال: ما كتب سوى كتاب الله )) **واتە: ((لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی خراپەکارەکان بەرز دەکرێتەوە، وەچاکەکار دادەنرێت، وە قسەی ناشیرین دەکرێت و، کاروباری چاک دەکرێت و رادەکەیت لە (المساءة)، ووتم : (مساءە) چیە؟ فەرمووی : ئەوەی نووسراوە جگە لەقورئان))** تەبەرانی ریوایەتی کردووە.

# ٥٧
# بڵاوبوونەوەی کتێب جگە لەقورئان

هەروەها ئەمەش لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە کەوا پێشوازی خەلک لەسەر کتێبەکان زیاد دەکات و دەیکڕێت و چاپی دەکات و دەینێرێت بۆ پەرتووکخانەکان، زیاتر لەکتێبەکانی خودا کە قورئانە.



ئەم حەدیسەی رابردوو شایەدی دەدات کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((من اقتراب الساعة .. وتفري في القوم المساءة، قلت: وما المساءة؟ قال: ما كتب سوى كتاب الله )) **واتە: (لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی ...وەرادەکەیت لەقەومی (المساءة) ووتم: المساءە چیە؟ فەرمووی ((ئەوەی نوسراوە جگە لەکتێبەکانی خودا کەقورئانە))**

## ٥٨

# زەمانێک دێت خوێنەر تێیدا زۆر دەبێت و تێگەیشتوو لەئایین و زانایان کەم دەبێت

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەوا لەنیشانەکانی رۆژی دوایی خوێندنەوەو خوێنەر زۆر دەبێت و زانایانیش کەم دەبێت.

لەئەبوهورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت ((سيأتي زمان تكثر فيه القراء ويقل الفقهاء ويقبض العلم ويكثر الهرج، قالوا : وما الهرج؟ قال: القتل بينكم، ثم يأتي بعد ذلك زمان يقرأ القرآن رجال لايجاوز تراقيهم، ثم يأتي بعد ذلك زمان يجادل المنافق الكافر المشرك بالله المؤمن بمثل ما يقول)) **واته: ((زەمانێک دێت تێدا خوێندنەوەو خوێنەر زۆر دەبێت و زانایان کەم دەبێت و زانست هەڵدەگیرێت، و (الهرج) زۆر دەبێت)) ووتیان: هەرج چیە؟ فەرمووی ((کوشت و کوشتار لەنێوانتانا، پاش ئەمەش زەمانێک دێت پیاوان قورئان دەخوێنن کەچی لەگەروەکانیان ناچنە خوارەوە، لەدوای ئەمە زەمانێک دێت مونافیقێکی کافری هاوبەش پەیداکەر بۆ خودا گفت و گۆو مشتومڕ لەگەڵ ئیماندارێک دەکات بەوەی کە قورئان فەرموویەتی ))** حاکم ریوایەتی کردووە.

کاروبارەکانیش خراپتر دەبێت ئەگەر زانست هەڵبگیرێت بەنەمانی زانایان تاوەکو ئەگەر زانا نەما – ئیتر خەڵک کەسانی نەزان دەکەن بەگەورەی خۆیان و پرسیاری لێ دەکەن، ئەوانیش بەنەزانی و توانایان و سەر لەخۆیان و لەوانیش دەشێوێنن.

لەعبدوللای کوڕی عەمرو رەزای خوای کەوا پێغەمبەر ﷺ بێت دەفەرموێت (( إن الله لا يقبض العلم انتزاعا ينتزعه من العباد ، ولكن يقبض العلم بقبض العلماء ، حتى إذا لم يبق عالما اتخذ الناس رءوسا جهالا ، فسئلوا فأفتوا بغير علم ، فضلوا وأضلوا)) **واته: ((خودای گەورە کاتێک زانیاری هەڵدەگرێت و دەیباتەوە بەشێوەی هەڵکێشان لەخەڵکیەوە هەڵناکێشێت، بەڵکو ئەم زانیارییە هەڵدەگرێت و بەرزی دەکاتەوە بەمردنی زانایان هەتاکو هیچ زانایەک نامێنێت، خەڵکی چەند کەسێکی نەفام دەکەنە پێشەوای خۆیان و پرسیاریان لێ دەکەن و ئەوانیش فەتوا دەدەن بەبێ زانیاری، جا خۆیان گومرا دەکەن و خەڵکیش گومرا دەکەن))** متفق عليه.

وەمەبەستیش لەهەڵگری زانست لەحەدیسەکانی پێشوودا ئەوەنیە کە زانستەکە لەسنگی

ئەو کەسەی لەبەری کردووە ڕەشیکردبێتەوە، بەڵام ماناکەی ئەوەیە ئەوەی زانستەکەی هەڵگرتووە دەمرێت، وە خەڵکیش کەسانی نەزان دەکەنە گەورەی خۆیان و بە نەزانینی خۆیان حوکم دەکەن و خۆیان و خەڵکیش گومڕا دەکەن. لەماوەی دە ساڵی رابردوو ئوممەتی ئیسلام رووبەڕووی کارەساتێکی گەورە بووەوە، بەمردنی ژمارەیەک لەزانایانیان کەوا کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو فێرکردنی خەڵک لەزانست و زانیاری.

لەساڵی (١٤٢٠ک - ٢٠٠٠ز) شێخی پێشەوا عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی باز سەرۆکی دەستەی گەورەی زانایان لەشانشینی عەرەبی سعودیە کۆچی دوایی کرد.

لەساڵی (١٤٢١ک - ٢٠٠٠ز) شێخی بەناوبانگ محمد کوڕی صالح العثیمین کۆچی دوایی کرد، وە لەساڵی (١٤٢٠ک - ١٩٩٩ز) شێخی ووتار بێژ محمد ناصرالدین الالبانی کۆچی دوایی کرد، وەزۆری دیکە کەخاوەنی زانست و زانیارین.

ئەمڕۆ ژمارەیەک لەخەڵکی و گەنجان بەرەبەرەکانی و پێشبڕکێ دەکەن لەچاککردنی دەنگیان بەخوێندنەوەی قورئان و بەشێوەی تەجوید و بەجۆرەها ئاواز وە بەخۆشترین دەنگ.

بەڵام غافلن لەداواکردنی زانستی شەرعی و ووردەکاری حوکمەکانی شەرع، وەئەگەر لەیەکێکیانت پرسیار کرد دەربارەی تەهارەت و پاکی یان سوجدەی سەهو دەبینیت هیچی زانستێکی وای لانیە.


شێخ بن باز


شێخ بن عثیمین


شێخ الالبانی



٥٩

# زانست بکەوێتە دەست منداڵان

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەو خەڵکانەی داوای زانست و زانیاریان دەکرد لەگەورە زانایان و تێگەیشتوودان بوون، بەڵام زەمانێک دێت منداڵان دەردەچن دەست لەزانست و زانیاری دەدەن هێشتا تێگەیشتنیان لاوازە، و کەم لە زانستی ئایین و زانیاری دەگەن، وە فەتوا بۆ خەڵک دەدەن، و ڕاوێژیان پێدەکەن، لەحەدیسەکانی رابردوو باسکراوە لەوانە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی خوێندنەوە زۆر دەبێت و زانایان کەم دەبن تاوەکو وای لێدێت زانست دەکەوێتە دەست بچووک و منداڵە نەزانەکان و فەتوا بۆ خەڵک دەدەن و خۆیان و خەڵکیش گومڕا دەکەن.

لەئەبی ئومیەی الجمحی ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((ان من أشراط الساعة أن يُلتمس العلم عند الأصاغر)) **واتە: ((لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەمەیە زانست بکەوێتە دەست بچووک و منداڵان)) ئەوکەسانەن پرسیاریان لەپێشەوا عبدالله بن المبارک کرد دەربارەی بچووک و منداڵان ووتی: (ئەو کەسانەن کە بەڕای خۆیان قسە دەکەن))**، واتە لەزانستەکانیان چەسپاونین و وردەکاری ناکەن لەفەتواکانیان و بەڵگە ناهێننەوە بەبەڵگەیەکی شەرعیانە، وەدەڵێن منداڵان ئەهلی بیدعەن.

لەلایەن **عبدوللای کوڕی مەسعودەوە** ڕەزای خوای لەسەر بێت ریوایەت کراوە دەڵێت: **(هێشتا خەڵک لەخێرو چاکەدان مادام زانست و زانیاری لەسەحابەکانی موحەممەد ﷺ وەلەگەورەکانیان وەدەگرن، بەڵام ئەگەر زانستەکانیان لەلایەن منداڵانەوە وەرگرت ئەوا حەزو ئارەزووەکانیان پەرت و بڵاو دەبێت و بەهیلاک دەچن)**

بەڵام لەسەر دەمی ئێمەدا سوپاس بۆ خودا هێشتا زانست و ئەهلەکەی لەخێرو سەرفرازی دان، وەئەگەر حەزدەکەیت ببینیت لەراگەیاندنەکاندا ژمارەیەک لەقوتابی زانستی بچووک و منداڵ دەردەکەون و لەگشتگیریەکانی ئیسلام دەزانن وە ووردەکاری دەکەن لەمەسەلە گرنگەکان، بەڵام هێشتا زاناو تێگەیشتوونین لەزانستی ئاییندا بەڵام لەناو خەڵکدا دەرکەوتوون، خەڵک پێشوازیان لێ دەکەن و ڕاوێژیان پێدەکرێ و زانست و زانیاریان لێ وەردەگرن، هەرچەندە زاناگەورەکان لەهۆکارەکانی راگەیاندن لەکەناڵەئاسمانیەکان و ئێستگەکان و پێگەی ئەنتەرنێت بۆ خەڵکی دەردەکەون بۆ ئەوەی خەڵک بیانناسێت و راوێژیان پێبکرێت و

پێشوازیان لێبکەن.

وەئەمەش لەسەر زۆرترینیانە، وەک چۆن گەورەو بەساڵداچووان نیشانەنین لەسەر زانست و زانیاری، ئاواش بچووکی و منداڵی نیشانەنین لەسەر نەزانین.

**پێشەوا ئەحمەدی کوری حەنبەل** دەڵێت: **(بێگوان زانست و زانیاری بەتەمەن نیە)** لە **عومەری کوری خەتتاب** رەزای خوای لێبێت ریوایەت کراوەو دەڵێت: **(زانست و زانیاری بە گەورەیی و بچووکی تەمەن نیە، بەڵکو خوای گەورە دەیخاتە دڵی ئەو کەسەی کەوا دەیەوێت)**

بۆیە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی پێشەنگی خەلک دەکات و ناوبانگ دەردەکات کەوا کۆشش بکات بۆ گۆڕینی دەروونی خۆی لەبچووکی و منداڵی بۆ گەورەیی بەداوا کردنی زانست و ووردەکاری و تێگەیشتنی و خۆبەستنەوە بەزانا گەورەکان.



# ٦٠
# مردنی کتوپڕ و لەناکاو


یاریزانێک مردووە لە کاتی یەکێک لە یاریکردنەکاندا

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا لەسەردەمی ئێمەدا دەرکەوتووە زۆربوونی مردنی لە ناکاو بریتیە لەمردنێکی کتوپڕو لەناکاو بەوەستانی دڵ یان بەمەیینی خوێن، یان بەکارەساتی ئۆتۆمبیل، یان بەکەوتنە خوارەوەی فرۆکە.

لەئەنەسی کوڕی مالیک رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((إن من أمارات الساعة ان يظهر موت الفجأة)) واتە: ((لەنیشانەکانی رۆژی دوایی دەرکەوتنی مردنی کتوپڕو لەناکاوە)) تەبرانی ریوایەتی کردووە.

بێگومان لەڕابردوودا پیاو هەستی بەپێشەکیەکانی مردن دەکرد، وەچەند رۆژێک بە نەخۆشی دەمایەوە، دەیزانی کە ئەمەنەخۆشی مردنە، جا وەسیەتەکانی خۆی دەنووسی، خواحافیزی لەخانەوادەکەی دەکردو، منداڵەکانی وەسیەت دەکرد، و دەگەڕایەوە لای خودای خۆی و تەوبەی دەکرد لەوەی کەکردوویەتی و، دەستی دەکرد بە شەهادەت هێنان، بۆ ئەوەی کۆتایی قسەکانی شەهادەت بێت. بەڵام ئێستا، دەبینی کابرایەک تەندروستی زۆر باشە، هیچ گومانی مردنی لێناکرێت، پاشان گوێت لەهەواڵی مردنی دەبێت بەوەستانی دڵ، یان بەلێدانی دڵ بەکتوپڕی، وە زۆر کارەساتی لەناکاوی وەک ئەمە، کەوا خەڵک بەکتوپڕی لەناو دەچێت، بۆیە لەسەر ئاقلمەند پێویستە بەردەوام لە هەستان و ئامادە باشیدابێت بۆ مردن و گەیشتن بەخودای عزوجل.

اغتنم في الفراغ فضل ركوع
كم من صحيح رأيت من غير سقم

فعسى ان يكون موتك بغتة
ذهبت نفسه الصحيحة فلتة

## ٦١

# فەرمانڕاوەیەتی گەمژەو کاڵفامەکان



سوودو ڕاستی خەڵک بەگشتی بەسوودو ڕاستێتی دەسەڵاتدارەکانیانن، وە خراپیشیان بەخراپ بوونی دەسەڵاتدارەکانیانن، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی داوە کەوا لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی کاروبارەکان دەدرێتە دەست فەرەمانڕەوا گەمژەکان کەلەسەر ڕێگای قورئان و سوننەت ناڕۆن، وە گوێ لەئامۆژگاریەکان ناگرن.

لەجابری کوڕی عەبدوللا ڕەزای خوای لێ بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ بەکەعبی کوڕی عەجرەی فەرمووە: (( أعاذك الله يا كعب من إمارة السفهاء قال : وما إمارة السفهاء ؟ قال : أمراء يكونون بعدي لا يهتدون بهديي ولا يستنون بسنتي فمن صدقهم بكذبهم وأعانهم على ظلمهم فأولئك ليسوا مني ولست منهم ولا يردون على حوضي، ومن لم يصدقهم على كذبهم ولم يعنهم على ظلمهم فأولئك مني وأنا منهم وسيردون على حوضي . يا كعب بن عجرة إنه لا يدخل الجنة لحم نبت من سحت ، النار أولى به . يا كعب بن عجرة ، الصوم جنة والصدقة تطفئ الخطيئة والصلاة قربان - أو قال : برهان - ياكعب بن عجزة لا يدخل الجنة لحم نبت على سحت أبدا النار أولى به، يا كعب بن عجزة الناس غاديان فمبتاع نفسه فمعتقها - او قال موبقها)) **واتە: ((ئەی کەعب خودا بتپارێزێ لەفەرمانڕەوایی گەمژەکان)) ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا فەرمانڕەوایی گەمژەکان چیە؟ فەرمووی ((ئەو فەرمانڕەوایانە دەبن لەدوایی من لەسەرکارو بەرنامەی من ناڕۆن و دەست بەسوننەتەکانی منەو ناگرن، وە هەرکەسێک باوەڕ بەدرۆکانیان بکات و هاوکاریان بکات لەسەر ستەمەکەیان ئەوا لەمن نین و منیش لەوان نیم وەنایەتە سەر حەوزی من و هەرکەسێک باوەڕ بەدرۆکانیان نەکات و هاوکاریان نەکات لەسەر زولم و ستەمەکەیان ئەوا ئەوانە لەمنن وە منیش لەوانم وە دێتە سەر حەوزەکەم (کەحەوزی ئاوی کەوسەرە) .**

**ئەی کەعبی کوڕی عەجرەم، ڕۆژوو قەڵغانە، وە خێرو سەدەقەش گوناهو تاوان دەکوژێنێتەوە،**

**وەنوێژیش قوربانی و کردەوەی چاکەیە، - یان بورهان دەڵێت – ئەی کەعبی کوڕی عەجرەم، ناچێتە بەهەشت گۆشتێک بەپارەی حەرام گەشەی کردبێت تەنها ئاگر جێگایەتی، ئەی کەعبی کوڕی عەجرەم، گەمژەکان ئەوانەن عەقڵیان سووکەو کەم کاروبارەکان ڕێک دەخەن وەگەمژەش لە زمانەوانیدا واتە سووک و لاسار**، وە لەحەدیسێکی تردا ((لاتقوم الساعة حتى يسود كل قبيلة منافقوها)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێ تاوەکو هەموو قەبیلەیەک مونافیق و خراپەکانیان کاروبارەکان بەڕێوەدەبەن))** تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە.

مونافیق و دوو ڕووەکانیش ئیمانیان کەمە، لەخوانەترسن، زۆر درۆزنن، زۆر نەزانن...ئەگەر بوونە سەرداری خەڵک و بوونە گەورەیان لەسەر ئەو حاڵەتە، ئەوا هەموو بارەکان پێچەوانە دەبێتەوە، وباوەڕبەدرۆزن دەکرێت، ڕاستگۆش دەبێتە درۆزن، ناپاک بەپاک دادەنرێت و، دەستپاکیش بەناپاک دادەنرێت، نەزان قسەدەکات و زاناش بێدەنگ دەبێت.

شەعبی دەڵێت (قیامەت هەڵناسێت تاوەکو زانین دەبێتە نەزانین و، نەزانینیش دەبێتە زانین) ئەمانە هەمووی لەوەرگەڕانی ڕاستیەکانە لەکۆتایی زەماندا و کاروبارەکانیش پێچەوانە دەبێتەوە و لەعەبدوڵلای کوڕی عەمرو ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویت ((إن من أشراط الساعة أن يوضع الأخيار، ويرفع الأشرار )) **واتە: ((لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی چاکەکار نزم دەبێتەوەو زوڵم و ستەمکاریش بەرزدەبێتەوە))** حاکم ڕیوایەتی کردووە.

## ٦٢
## لێک نزیکبوونەوەی کات و ڕۆژگارەکان

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی داوە کەوا لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی کاتەکان لێک نزیک دەبێتەوە.

لەئەبی هوریرە ڕەزای خوای لەسەر بێت، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویت ((يتقارب الزمان، وينقص العلم، وتظهر الفتن، ويلقى الشح، ويكثر الهرج، قيل: يارسول الله وما الهرج؟ قال : القتل القتل)) **واتە: ((کاتەکان لێک نزیک دەبێتەوە، وە زانست و زانیاری کەم دەبێت و فیتنەو ئاژاوە دەردەکەوێت، و ڕەزیلی و پیسکەیی زۆر دەبێت، وە (الهرج) زۆر دەبێت)) ووتیان ئەی پێغەمبەری خودا (الهرج) چیە؟ فەرمووی ((کوشت و کوشتار)** متفق عليه.

## زانایان دەربارەی فەرموودەکەی پێغەمبەر  سەبارەت بە (نزیک بوونەوەی کاتەکان) چەند ووتەیەک هەیە، لەمانە:



**١. مەبەست لێی لەم زەمانەدا بەرەکەت کەم دەبێت بەجۆرێک ئەوانەی پێش ئێمە ئەو کارو پێداویستیانەی خۆیان کەبە کاتژمێرێک تەواو دەکرد، ئەمانەی دوای ئەوان بەچەند کاتژمێرێک ناتوانن بەئەنجامی بگەیەنن.**

**٢. ئیبن حجر دەڵێت (ئەوەی ئێستا لەم سەردەمەی ئێمەدا دەیبینین ڕۆژەکان بە خێرایی تێدەپەڕن، ئێمە لەسەردەمی پێشوودا وەک ئەم سەردەمە نەمانبینیووە)**

**٣. لێک نزیک بوونەوەی خەڵکی ئەم ڕۆژگارە بەهۆی دابینکردنی گەیاندنەکان وەک سواربووەکانی زەوی و ئاسمان کەوا دووری نزیک کردۆتەوە .**

تێپەڕبوونی کات و خێرایی ڕۆیشتنی کەخێراییەکی ڕاستەقینەیەو، ئەمەش لەکۆتایی سەردەمدا دەبێت، چونکە خودای گەورە ڕۆژەکان درێژدەکاتەوە چۆن حەزبکات و کورتی دەکاتەوە چۆن حەزبکات، و خودای مەزن و دلۆڤانیش شەوو ڕۆژەکان وەردەگێڕێت.
ئەمەش ڕۆژەکانی دەجال تەئکید دەکاتەوە بەجۆرێک درێژ دەبێت ڕۆژێک وەک ساڵێک و مانگێک و حەفتەیەک دەبێت لەدرێژییدا، وەک چۆن درێژ دەبێت، ئەوهاش کورت دەبێت، ئەمەیان هێشتا ڕووینە داوە.
لەئەبی هورەیرە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرموویەتی ((لاتقوم الساعة حتى يتقارب الزمان فتكون السنة كالشهر والشهر كالجمعة والجمعة كاليوم،ويكون اليوم كالساعة، والساعة كالضرمة من النار)) **واتە:**
**((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو کاتەکان لێک نزیک دەبێتەوە ساڵێک وەک مانگێک دەبێت وە مانگێک وەک هەفتەیەک و هەفتەیەکیش وەک ڕۆژێک و ڕۆژێکیش وەک کاتژمێرێک دەبێت، وەکاتژمێرێکیش وەک پڕۆلە ئاگرێک دەبێت))** ئەحمەد و ترمذی ریوایەتیان کردووە.
مانای کە کاتژمێرێک لەسەردەمی ئەو کاتەدا وەک لکەدار خورمایەک دەبێت و بەخێرایی گڕدەگرێت و کۆتایی پێدێت.

**٤. هەورەها دەڵێن لەبارەی نزیک بوونەوەی کاتەکان تەمەنەکانیش کورت دەبێتەوە.**

# ٦٣

# کەسانی نەفام و گەمژە لەکاروباری گشتیدا قسە دەکەن

لەبنچینەدا قسەکەر دەبێت لەناو خەڵکدا هەڵقوڵابێت و مرۆڤێکی عاقل و ژیرو داناو زمان پاراو بێت، زەمانێک دێت خەڵک خراپ دەبێت و، قسەکەر بەناوی خەڵک و لەناو ناوا هەڵقوڵاوبێت ئەوانەکەسانی هیچ و پووچن، و بریتیە لەپیاوێکی هیچ و پووچ و گەمژە.

لەئەبوو هورەیرە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (( إنها ستأتي على الناس سنون خداعة ، يصدق فيها الكاذب ، ويكذب فيها الصادق ، ويؤتمن فيها الخائن ، ويخون فيها الأمين ، وينطق فيها الرويبضة قيل : وما الرويبضة ؟ يا رسول الله قال : السفيه يتكلم في أمر العامة)) **واتە:** **(( ساڵانێکی هەڵخەتێنەر بەسەر خەڵکدا دێت مرۆڤی درۆزن بەڕاستگۆدادەنرێت و، مرۆڤی ڕاستگۆش بەدرۆزن دادەنرێت، وە مرۆڤی ناپاک بەدەستپاک دادەنرێت و دەستپاکیش بەناپاک دادەنرێت، وە (الرويبضة) قسەی تێدا دەکات)) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (الرويبضة) چیە؟ فەرمووی ((کەسانی گەمژەو بێنرخ قسەلەکاروباری گشتیدا دەکەن))** تەبەرانی ریوایەتی کردووە.

لەنیشانەکانی ئەم سەردەمە بەرزبوونەوەی کەسانی نزم وگەمژەن لەناوخەڵکداو کاروباری خەڵکی دەکەوێتە بەردەستی ناکەس بەچەو هیچ و پووچەکان، ئەمەش لە سەردەمی ئێمەکارێکی بەربڵاوە.

پێویستە خاوەن زانست و عەقل وشارەزایی ئەم پێشەنگی کاروبارەکانی خەڵک بن ئێستاش دەبینیت خەڵکی بەدوای ئارەزووی هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون و بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانیان ئەگەر لەسەر حیسابی دینەکەشیان بێت، بۆ هیچ و پووچ و گەمژەکان بوونەتە سەردارو گەورەمان.

# ٦٤
# بەختەوەرترین کەس لەدنیا هیچ و پووچی کوڕی هیچ و پووچ دەبێت

لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی زەمانێک دێت درۆزن ڕاستگۆ دەبێت و ڕاستگۆش درۆزن دەبێت، وەناپاک بەدەستپاک دادەنرێت و دەستپاکیش بەناپاک دادەنرێت، و کاروباری خەڵکیش کەسانی گەمژە دەیگرێتە دەست و، کاروبارەکە دەدرێتە دەست کەسێکی تر جگە لەخاوەنەکەی.

لەئەنەسەوە ڕەزای خوای لێبێت کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتذهب الأيام والليالي حتى يكون أسعد الناس بالدنيا لُكَع ابن لُكَع)) **واتە: ((ڕۆژەکان و شەوەکان ناڕوات تاوەکو بەختەوەرترین کەس لەدونیادا هیچ و پوچی کوڕی هیچ و پووچ دەبێت))** تەبرانی ڕیوایەتی کردووە.

وقـــال ﷺ (( يوشك ان يغلب على الدنيا لُكَع ابن لُكَع)) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە

وقـــال ﷺ (( يوشك الدنيا حتى تصير للُكَع ابن لُكَع)) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە

وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت **((خەریکە هیچ و پووچی کوڕی هیچ و پووچ دەسەڵات بەسەر خەڵکیدا بکات))** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.

وەهەروەها پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((دونیا ناڕوات و کۆتایی پێ نایەت تاوەکو کەسانی هیچ و پووچ و کوڕی هیچ و پووچ دەسەلات بەسەر خەڵکیدا بکات)) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە

وە (لكع بن لكع) مرۆڤێکی خراپە کەوا ستایشکارو سوپاسگوزاری ناکات لەسەر ئەو شتانەی خەڵق کراوەو، لەلای عەرەبیش بریتیە لە بەندەیەکی خراپ بەکارهێنانی (اللكع) بەڵگەیە لەسەر گەمژەیی و نەزانین، بۆیە بۆپیاو دەڵێن (لكع) وە بۆ ئافرەتیش (لكاع) بەکاردێت.

ئەمەش لەدنیادا دەبێتە بەختەوەرتین کەس لەسەروەت و سامان و دەسەڵات و ئۆتۆمبیل و سواربووە گرانبەهاکان و ماڵ و خانووی فراوان چونکە (لكع)ە گەمژەو هیچ و پووچە.

وەپارەو پوول بەهەموو ڕێگایەک پەیدا دەکات، و بەئارەزووی خۆی مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات و دونیاش بەدەست دەهێنێت.

٦٥

# بەکارهێنانی مزگەوتەکان بۆ حەوانەوە جگە لەنوێژکردن

ماناکەشی کاتێک پیاوێک بەلای مزگەوتێکدا تێدەپەڕێت بۆ بەجێ گەیاندنی کارێکی تایبەت بەخۆی بێ ئەوەی پیاوێکی نوێژکەر بێت، ئەمەش تەنها مزگەوتەکان بەکار دەهێنێت بۆ حەوانەوەو کاری تایبەتی خۆی زیاتر لەوەی بەکاری بهێنێت بۆ نوێژکردن.

مزگەوتەکان بەکاردەهێندرێت بۆ گەشت و گوزاری ناوخوو دەرەوە زیاتر لەوەی نوێژی تیادا بکرێت





٦٧ ٦٦

# بەرزبوونەوەی نرخی مارەیی ئافرەت پاشان دابەزینی - بەرزبوونەوەی نرخی ئەسپ و وولاخەبەرزە پاشان دابەزینی

خارجەی کوری الصلت البرجمی دەڵێت ((لەگەڵ عەبدوللا لەماڵەکەی دەرچووین و پێش نوێژیش لەکرنووش دابوو جا ئێمەش کرنووشمان برد پاشان رۆیشتین تاوەکو گەیشتین بەریزەکە ئینجا پیاوێک بەوێدا تێپەری و ووتی : سەلامت لێبێ ئەی باوکی عەبدولرەحمان، ئینجا ووتی: الله اکبر خوداو پێغەمبەرەکەی راستیان فەرمووە کاتێک نوێژەکەمان تەواو کرد ووتمان: ئەی باوکی عەبدولرەحمان وەک ئەوەی ئەو پیاوە بیناسیت سەڵام کردنەکەی تایبەت بوو بەتۆ؟ ووتی: بەڵێ پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت دەیفەرموو: لەنیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە مزگەوتەکان ببنە جێگای حەوانەوەوکاری تایبەتی، وە پیاو تەنها سەلام لەپیاوێک دەکات کە بیناسێت، ئافرەت و پیاو پێکەوە، بازرگانی دەکات، وە هەروەها نرخی مارەیی ئافرەت و نرخی ئەسپ و وولاخە بەرزە بەرز دەبێتەوە پاشان دادەبەزێت و چیتر بەرز نابێتەوە)) حاکم ریوایەتی کردووە



## ٦٨

# لێک نزیک بوونەوەی بازاڕەکان

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بەو سەردەمەی ئێمە کەوا دووریەکان لێک نزیک دەبێتەوە ڕۆیشتن لەبازاڕێکەوە بۆ بازاڕێکی دیکە ئاسان دەبێت بەماوەیەکی کورت مرۆڤ دەتوانێ لەبازاڕە جیهانیەکاندا بسووڕێتەوەو، بزانێت چی ڕوویداوە لەزیاد بوون و کورتهێنان، هەموو ئەمەش بەهۆی نزیک بوونەوەی خەڵکی زەویە وە پێشکەوتنی هۆکارەکانی گواستنەوە لەنێوان شارەکان بەفرۆکە یان بەئۆتۆمبیل یان بەشتی دیکە.



پێشکەوتنی هۆکارەکانی گەیاندن لەتەلەفۆنەکان و ئێستگەکانی هەوایی و بینراو دەنگی و ئەنتەرنێت.

لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى تظهر الفتن ويكثر الكذب وتتقارب الأسواق)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو فیتنەو ئاژاوە دەردەکەوێت و درۆ زۆر دەبێت و بازاڕەکان لێک نزیک دەبێتەوە))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە

### لەسێ ڕوودا بازاڕەکان لێک نزیک بوونەتەوە

- **یەکەم //** خێرایی زانست و زانیاری ئەمەش زیاد کردنی نرخ و کەمکردنی تێدا دەبێت.
- **دووەم //** خێرایی ڕۆیشتن لەبازاڕێکەوە بۆ بازاڕێکی تر، ئەگەر هاتوو ماوەی ڕێگاکەش زۆر دووربێت.
- **سێیەم//** نزیک کەوتنەوەی هەندێک لەهەندێکی دیکەدا لەنرخەکان، وە چاولێکەری هەندێک خەڵک لەهەندێکی تر لەزیادکردن و کەمکردن، وەخودای گەورەش زاناترە.

شێخ عەبدول عەزیز بن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – لەحەدیسێکدا کەئەبوهورەیرە ڕیوایەتی کردووە لەبارەی نزیک بوونەوەی بازاڕەکان تەفسیر دەکات و دەڵێت (( نزیک بوونەوە لەتەفسیرکردنی ئەو نزیک بوونەوەی باسکراوە لەحەدیسەکەدا کەوا لەو سەردەمەدا

ڕوویداوە لەنزیک بوونەوەی نێوان شارەکان و هەرێمەکان و کورت بوونەوەی کاتی دووری نێوانیان بەهۆی داهێنانی فرۆکەکان و ئۆتۆمبیلەکان و ئێستگەکانە و زۆرشتی دیکەش خودای گەورەش لەهەمووکەس زاناترە))

٦٩

# چاوتێبڕین و پەلاماردانی گەلان بەسەر گەلانی ئیسلام

لەنیشانەکان کەوا لەکۆتایی زەماندا ڕوودەدات و نزیکیشە لەرۆژی دوایی پەلاماردانی گەلانە لەسەر گەلی ئیسلام بەڵام خودای گەورە ئەم گەلەی پاراستووە .

ئەوەی لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبداتەوە دەبینێت کەوا گەلی ئیسلام چەندها جەنگی گەورەی تێدا بەرپابووە، موسیبەت و ناخۆشی زۆری تووش بووە، وەخوای گەورەش پاراستوویەتی و پشت و پەنای بووە، لەجەنگی خاچ پەرستەکان دیانەکان کۆبوونەوەو، خودای گەورەش موسلمانەکانی سەرخست بەسەریاندا، وە تەتەرەکانیش هێرشیان کردە سەر وڵاتە ئیسلامیەکان وخودای گەورە بەرپەرچی فرت و فێڵەکانی ئەوانی دایەوە، لەم سەردەمەی ئێمەشدا خاچ پەرستەکان و جوولەکەکان پشتگیری یەکتر دەکەن، و پشت و پەنا بەخوای گەورە لەگەڕانەوەی موسڵمانەکان و بۆ ئایینەکەیان بۆ ئەوەی سەرکەوتن بۆ ئەوان بێت.

﴿ وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ (٤٠) ﴾ الحج/٤٠

**واتە// (سوێند بێت بێگومان خوا ئەوەکەسە سەردەخات کەپشتگیری ئایین و بەرنامەکەی دەکات و هەوڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خوا زۆر بەهێزو باڵادەستە)**

﴿ كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ (٢١) ﴾ المجادله / ٢١

**واتە// (خوا بڕیاریداوەکە : بێگومان هەر خۆم و پێغەمبەرەکانم سەرکەوتوو دەبین، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی بەهێزو باڵادەستە)**

لەثەوبان ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت: (( يوشك الأمم أن تداعى عليكم كما تداعى الأكلة إلى قصعتها ، فقال قائل : ومن قلة نحن يومئذ ؟ قال : بل أنتم يومئذ كثير ، ولكنكم غثاء كغثاء السيل ، ولينزعن الله من صدور عدوكم المهابة منكم ، وليقذفن الله في قلوبكم الوهن، قيل : وما الوهن يا رسول الله ؟ قال :

حب الدنيا ، وكراهية الموت)) **واتە: ((پێدەچێت گەلانی ناموسلمان پەلامارتان بدات وەک چۆن گیانلەبەرێک پەلاماری خواردنەکەی دەدات، جا یەکێک ووتی : ئایا لەبەر کەمی ئێمەیە ئەم ڕۆژە وامان بەسەر دێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر بەڵکو ئێوە لەو ڕۆژەدا گەلێک زۆرن، وەک کەف و پووشی سەر ئاو وان، خوای گەورە ترس لەدڵی دوژمنەکانتان دەردەهێنێت لەبەرامبەر ئێوەدا، وە (وهن) دەخاتە دڵتانەوە ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (وهن) چیە؟ فەرمووی: خۆشەویستی دونیاو ڕق لێبوونەوە لەمردن ))** ابوداود ریوایەتی کردووە.

**القصعة :** دەفرێکە خواردنی تێدادەخورێت، وەزۆربەی جار لەدار دروست دەکرێت.

**الغثـــاء :** ئەوەی لەگەڵ ڕووباردا دێت کەپووش و پەلاش و پیسی هەڵدەگرێت.

**الوهـــن :** پێغەمبەر ﷺ تەفسیری کردووە خۆشەویستی دوونیاو ڕق لێبوونەوە لەمردن.

ئەم حەدیسەش لەبەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیە وەنیشانەیەکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، بێگومان گەلە کافرەکان هێرش و پەلاماردەکەنە سەر گەلە موسلمانەکان وەک چۆن گیانلەبەر هێرش دەکاتە سەر دەفری خۆراک، وەبەهۆی ئەو شکستی و نەنگیە لەبەر کەمی موسلمانان نیە، بەڵکو زۆرن، بەڵام ئەوان وەک پووش و پەلاشی سەر ئاو وان کە زێ و ڕووبار هەڵیان دەگرێت، کەهیچ کێشیان نیە، ئەمەش ئەمڕۆ باری میللەتی ئێمەیە، کەژمارەیان زیاتر لەهەزار ملیۆنە، بەڵام زۆریەکە (چەند)ە یە (چۆن)یەکە نیە.

ترس و دڵەراوکێ لەدڵی دوژمنەکانیان نامێنێت، ئەوان ترس دەخەنە ناو دڵی موسڵمانەکان، وە لەگەڵیاندا دەجەنگن و داگیریان دەرکەن، ئەمەش لەکاتێکدا بە کە (وهن) بەسەریاندا دەبارێت ئەویش خۆشەویستی دونیاو ڕق لێبوونەوە لەمردن.




میژووی داگیرکەری ڕۆژئاوا بۆ وولاتە عەرەبیەکان

# ٧٠

# خەڵک یەکتری پاڵدەدەن بۆ پێش نوێژی کردن



لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی دەرکەوتنی نەزانیەو بڵاوبوونەوەیە لەنێو خەڵکدا تاوەکو وای لێدێت کەسێک نادۆزیتەوە پێش نوێژی بۆ خەڵک بکات جالەکاتی نوێژی بەکۆمەڵدا هەندێک یەکتر پاڵدەدەن بۆ پێش نوێژی ئەوانیش ناچن لەبەر نەزانین بەحوکمەکانی شەرع و، کەمی ووردەکاریان لەخوێندنەوەدا.

لەسەلامەی کچی حور رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((إنَّ مِن أشراط الساعة: أن يتدافع أهل المسجد الإمامة، فلا يجدون إمامة يصلّي بهم)) واتە: ((**لەنیشانەکانی رۆژی دوایی خەڵکانی ناومزگەوت یەکترپاڵ پێوەدەنین بۆ پێش نوێژی کردن، جا پێش نوێژو ئیمامێک نابیننەوە نوێژیان بۆ بکات**)) ابو داود ریوایەتی کردووە.

لەعەبدوللای کوڕی عەمرو رەزای خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((زەمانێک بەسەر ئەو خەڵکەی دادێت لێی کۆدەبنەوەو، نوێژ لەمزگەوتەکان دەکەن، لەناویاندا ئیمانداریێک نیە)) حاکم ریوایەتی کردووە.

لەوانەیە ئەم سەردەمە هێشتا نەهاتبێت سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە، هێشتا بازنەکانی زانست و زانایان لەهەموو جێگایەک هەن، وەمزگەوتەکان پڕ دەبن لە زانایان و قوتابی زانست و خوێنەرە رێک و پێکەکان.

٧١

# راست دەرچوونی خەونی ئیماندار



خەون و خەوبینینەکان لەخەودا واتاو یاسای هەیە، لەوانەیە راست بێت وەک ڕووناکی بەیانیان، وە لەوانەیە درۆبێت، لەوانەشە لێکدانەوەی خەونەکان و حەدیسەکان دیاری بکات، پێغەمبەرش ﷺ هەواڵی داوە لەبارەی خەوبینین کە پەیوەندی هەیە بەنیشانەکانی رۆژی دوایی و ئاماژە پێکردنی.

خەونی پیاوچاکانیش بەشێکە لەچل و شەش بەش لەپێغەمبەرایەتی لەعائیشەوە رەزی خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( لا یبقى بعدي من النبوة شيء إلا المبشرات قالوا : یا رسول الله وما المبشرات ؟ قال : الرؤيا الصالحة يراها الرجل أو تُرَى له)) **واتە: ((لەدوای من هیچ شتێک نامێنێتەوە لەپێغەمبەرایەتی جگە لەمۆژدە بەخشەکان)) وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا مژدە بەخشەکان چیە؟ فەرمووی ((خەوبینینی پیاوچاکان کە دەیبینێت یان پێی نیشان دەدرێت))** بوخاری و ئەحمەد ریوایەتیان کردووە.

ڕاستە دەرچوونی خەون مزگێنی دەرە بۆ ئیماندار وە نیشانەیە لەسەر نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی و کۆتایی جیهان بەجۆرێک خەون و ڕاستی زیاترە و دەگونجێت بۆ واقیعی ئەمڕۆ ئیمانداریش پاکترین کەسن لەناو خەڵکدا، وەک ئەوەی خەون هاوڕێ و هۆگری ئەو بێت وەکاتێک نامۆو غەریب دەبێت لەنێو خەڵکدا کەمجار خەونەکەی بەدرۆ دەردەچێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( إذا اقترب الزمان لم تكد رؤيا المسلم تكذب، وأصدقكم رؤيا أصدقكم حديثا ، ورؤيا المسلم جزء من خمس وأربعين جزءا من النبوة ، والرؤيا ثلاثة: فرؤيا الصالحة بشرى من الله ، ورؤيا تحزين من الشيطان ، ورؤيا مما يحدث المرء نفسه،

فإن رأى أحدكم ما يكره فليقم فليصل ، ولا يحدث بها الناس قال : وأحب القيد وأكره الغل والقيد ثبات في الدين)) **واتە: ((کاتێک قیامەت نزیک دەبێتەوە خەونی بڕوادار بەدرۆ دەرناچێت و ڕاستترینی خەونەکانتان لای ڕاست ترینی قسەکەرتانە، وە خەونی موسڵمانیش بەشێکە لەچل و پێنج بەش لەپێغەمبەرایەتیدا، وە خەونیش سێ بەشە، خەونی پیاوچاک و بڕوادار مزگێنیە لەلای خوداوە، خەونیش هەیە خەم و خەفەتە لەشەیتانەوە، و خەونیش هەیە کەسەکە خۆی کارەساتەکەی بەسەر دێت، جا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی ناخۆشی دیت باهەڵسێت و تفێک بهاوێت بەلای چەپیدا ولای کەس باسی نەکات، وەکات و ماوەم خۆ ش دەوێت لەنوسیندا وە ڕقم لەڕق و کینەیە، وە ماوەش بەڵگەیە لەئاییندا))** ئەحمەدو موسلیم و ئەبوداودو ترمژی ڕیوایەتیان کردووە

**حافظ بن حجر** دەڵێت **((مانای خەوبینینی ئیماندار، لەکۆتایی سەردەمدا بەدرۆ دەرناچێت، کەوا زۆر بەسیفەتی ڕوون تێیدا ڕوودەدات بەمانای پێویستی بە لێکدانەوە ناکات وە درۆی تێناچێت، بەڵکو ڕاست دەردەچێت و درۆدەرناچێت چونکە لەگەڵ واقیعەکە گونجاوە، بە جیاوازی خەونەکانی دیکە ئەمە لێکدانەوەکان شاراوەن وەبەئارەزووی خۆیان شی دەکەنەوە لەگەڵ واقیعدا کۆک نین ئەمەش دەبێتە درۆو ڕاست دەرناچێت.**

**حیکمەتیش لەتایبەتمەندیەتی ئەمەیە کۆتایی سەردەم کەوا ئیماندار لەو کاتەدا دەبێتە غەریب و نامۆ کەوا لە حەدیسێکدا هاتووەو ((لەسەرەتادا ئیسلام بەغەریبی هاتووەو وەبەغەریبیش دەگەڕێتەوە)) وەدەڵێن ئەنیس و هۆگری ئیماندارەو هاوکاریەتی وەخودای گەورەش ڕێز لەئیماندار دەگرێت بەخەونی چاک کەوا چەسپاوی دەکات لەسەر هەق وە بەم خەونەش مزگێنی پێدەدات))**

***لێرەدا دوو ڕێ تێچوون هەیە بۆ دیاریکردنی کات کەوا ڕاست دەرچوونی خەونی ئیماندار تێیدا ڕوودەدات :***

١. ئەمە ڕوودەدات ئەگەر هاتوو زانست و زانیاری نەمێنێت و نیشانە شەرعیەکان دیارنەمان بەهۆی فیتنەو کوشت و کوشتار ئەوا ئیماندار غەریب و نامۆ دەبێت ئەوا بەخەونە ڕاستەکانیان جێیان دەگرێتەوە، هەر بۆیەش ئیبن و حەجەر باسیکردوە لەقەولەکەی سەرەوە.

٢. ئەمەش سەردەمی پێغەمبەری خوا عیسی علیه السلام ڕوویداوە چونکە خەڵکی ئەو سەردەمە چاکترین سەردەم بوون لەو ئوممەتەدا لەدوای سەحابە بەڕێزەکان وە ووتەکانیان و خەونەکانیان ڕاسترینیان بوو کە درۆ دەرنەدەچوون.

# ٧٢
# زۆر بوونی درۆ

درۆ دەردێکی ترسناک و کوشندەیەو هێشتاش پیاو هەیە بەدوای درۆدا دەگەڕێت تاوای لێدێت لەلای خوای گەورە بەدرۆزن دەنوسرێت.

وە لەحەدیسێکدا ((يطبع المؤمن على الخصال كلها إلا الخيانة والكذب)) **واتە:** **((پیاوی ئیماندار لەسەر هەموو ئاکارەکانی ڕادێت جگە لەناپاکی و درۆ))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

وە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچووبایە لای یەکێک لەخانەوادەکانی درۆی بکردایە، ئەوا هیچ قسەی لەگەڵدا نەدەکرد تاوەکو تەوبەی دەکرد.

وەلەنیشانەکانی رۆژی دوایی درۆبڵاودەبێتەوە لەنێوخەڵکداو پیاو خۆی لەدرۆ ناپارێزێت لەقسەکردنداو لەکاتی گواستنەوەی هەواڵەکاندا لەنێوخەڵک لەهەواڵەکەی دڵنیا نابێتەوە، ئەمەش لەگەڵ ناشیرینی درۆکردن و خراپی کاریگەریەکەی و زۆربوونی لەناو خەڵکدا.

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەربێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (( يكون في آخر الزمان دجالون كذابون ، يأتونكم من الأحاديث بما لم تسمعوا أنتم ، ولا آباؤكم ، فإياكم وإياهم ، لا يضلونكم ، ولا يفتنونكم)) **واتە:** **((لەکۆتایی زەماندا هەندێک دەجالی درۆزن پەیدادەبن و دێتەلاتان فەرموودەتان بۆ دەخوێنێتەوە کە هیچ گوێتان لێ نەبووە نەئێوە نەباووباپیرتان جائاگاداری خۆتان بن لێیان گومڕاتان نەکەن و تووشی فیتنەتان نەکەن))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەجابری کوڕی سەمرەوە رەزای خوای لەسەر بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((إن بين يدي الساعة كذابين فاحذروهم)) **واتە:** **((لەنزیکی قیامەتدا چەندان درۆزن پەیدا دەبن جا ئاگاداری خۆتانبن))** موسلیم رایوایەتی کردووە

لەو سەردەمەدا ووتارو هەواڵ و چیرۆکی غەریب گەلێک زۆر هەنە لەبەر کەمی خۆپاراستنی خەڵک لەدرۆ وەلەبەر ئەمەش پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردۆتەوە کەهەموو شتێک بسەلمێندرێ ئینجا بگوازرێتەوە، هەروەها لەدڵنیابوون لە هەواڵەکان کاتێک دیانگوازینەوە تاوەکو نەکەوینە ناوکۆمەڵەی درۆزنان و هەروەها تاوەکو هەڵنەخلیسکێین و یاخی نەبین.

# ٧٣
# پەیدا بوونی ڕق و کینە و یەکتر نەدواندن لەنێو خەڵکدا



لەکاتی زۆر بوونی ناخۆشی و و میحنەت و فیتنەو ئاژاوەدا پەیوەندی نێوان خەڵک دادەبەزێت تاوەکو دەگاتە پچڕانی پەیوەندی و ناکۆکی نێوان دڵەکان وەخەڵکی یەکتر ناناسن ویەکتر نادوێنن جگەلە بەرژەوەندیەکانی دنیایی.

لەحوزەیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پرسیار کرا لە پێغەمبەرﷺ دەربارەی ڕۆژی دوایی جا فەرمووی ((علمها عند ربي لا يجليها لوقتها إلا هو، ولكن أخبركم بمشاريطها وما يكون بين يديها، إن بين يديها فتنة وهرجا، قالوا: يا رسول الله، الفتنة قد عرفناها فالهرج ما هو؟ قال بلسان الحبشة: القتل، ويلقى بين الناس التناكر فلا يكاد أحد أن يعرف أحدا)) **واته: ((زانیاری هاتنی قیامەت و کاتی دیاریکراوی کەس نایزانێت جگە لەخوای گەورە نەبێت، بەڵام هەواڵتان پێدەدەم بەنیشانەکانی ئەوەی پێش قیامەت ڕوودەدات بێگومان بەرلەهاتنی قیامەت فیتنەو ئاژاوە پەیدا دەبێت لەگەڵ (هرجا) )) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوا فیتنەمان زانی، بەڵام (هرج) چیە؟ فەرمووی ((بەزوبانی حەبەشە، کوشت و کوشتارە، وەرق و کینەو قسە نەکردن لەگەڵ یەکتر دەکەوێتە ناوخەڵک، تاوای لێدێت کەس کەس ناناسێت))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

ئەم حەدیسەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ واقیعی خەڵکی ئێستادا زۆر کەس هەیە خزم و نزیکی خۆی ناناسێت، تاوای لی هاتووە منداڵەکانیان لەشوێنێکی گشتیدا دەگەنە یەکتر نازانن کەئەمە خزمی یەکترو لەیەک بنەماڵەن، چونکە زۆربەی پەیوەندیەکانی خەڵک لەسەر بەر ژەوەندی تایبەتی دامەزراوە، وەزۆربەی پەیوەندیەکان دامەزراوە لە بەرژەوەندی دنیایی کەبەخێرایی دروست دەبێت و بەخێرایش تێک دەچێت و دەپچڕێت لەبەر ئەوەی لەسەر هەواو هەوەسی خەڵک دامەزراوە لەبەر بەرژەوەندیەکانیان، بەڵام دانەمەزراوە لەسەر ئیمان بەخواو بەبرایەتی.

دەبینێت پیاوێک لەبەر بەرژەوەندی دنیایی خۆی زوو پەیوەندی لەگەڵ کەسێک دروست دەکات وە زۆر خێراشە بۆ پچڕاندنی.

# ٧٤
# زۆر بوونی بوومەلەرزە





مەبەست لەزۆربوونی زەوی لەرزین پێش هاتنی ڕۆژی دوایی بەتەواوی و بەردەوامی، ئەمەش یان ڕەحمەتێکە بەو ئوممەتەو تەکفیرکردنە بۆ خراپەکان، کەوا لەئەبوموسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت هاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((أمتي أمة مرحومة لا عذاب عليها في الآخرة جعل الله عذابها في الدنيا القتل والزلازل والفتن)) **واتە: ((ئوممەتی من ئوممەتێکی ڕەحم پێکراوە لەقیامەتدا سزاو عەزابی لەسەر نیە، خودای گەورە لەسەر دونیا عەزابی بۆ داناوە لەکوشتن و بوومەلەرزەو فیتنەو ئاژاوە))** ئەحمەد و حاکم ڕیوایەتی کردووە

یان سزادانی بەندەکان بەجۆرێک فەسادو خراپە زۆر دەکات وە بوومەلەرزەش سزاو عەزابێکە بۆ خەڵکی ئەم زەمانە.

لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لا تقوم الساعة حتى يقبض العلم، وتكثر الزلازل)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو زانست و زانیاری هەڵدەگیرێت وبوومەلەرزەش زۆر دەبێت))** بوخاری ڕایوایەتی کردووە

لەعەبدوڵلای کوڕی حەواڵەی ئەزەدی ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت((يا ابن حوالة إذا رأيت الخلافة قد نزلت الأرض المقدسة فقد دنت الزلازل والبلابل و الأمور العظام والساعة يومئذ أقرب من الناس من يدي هذه من رأسك)) **واتە: ((ئەی کوڕی حەواڵە گەر بینیت جیاوازی و ناکۆکی لەخاکی پیرۆز پەیدابوو ئەوابیگومان زەوی لەرزین و بەڵاکان نزیک دەبێت کارگەلێکی گەورە ڕوودەدات وەهاتنی قیامەت لەو ڕۆژەدا نزیک ترە لە خەڵک لەنزیکی دەستی من لەسەری تۆ))** ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە

# ٧٥ ٧٦ زۆربوونی ئافرەت - کەم بوونی پیاو



لەنیشانەکانی رۆژی دوایی ئافرەت لەئاخری زەمان زۆر دەبێت و پیاویش کەم دەبێت وە دەڵێن هۆی زۆر بوونی ئافرەت ئەو فیتنەو ئاژاوەیە کەوا کوشتن تێیدا زۆر دەبێت لەناو پیاواندا چونکە پیاو خاوەنی شەڕو شۆڕن جگە لەئافرەت.

**ئیبنو حجر** دەڵێت **((دیاردەکە بۆ هیچ هۆکارێک ناگەڕێتەوە تەنها نیشانەیەکی ئارەزوو مەندانەیە کەوا قەدەری خوای گەورەیە لەکۆتایی سەردەمدا منداڵی نێرینە کەم لەدایک دەبێت و منداڵی مێینە زیاتر لەدایک دەبن))**

لەئەنەس کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لەسەر بێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لاتقوم الساعة -أو قال- من أشراط الساعة : أن يرفع العلم، ويظهر الجهل، ويشرب الخمر، ويفشو الزنا، ويذهب الرجال، ويبقى النساءَ، حتى يكون لخمسين أمرأة قيّم واحد)) **واتە:** **((قیامەت هەڵناسێت یان دەفەرمووێت ((لەنیشانەکانی رۆژی دوایی زانست بەرزدەکرێتەوەو نەزانین دەردەکەوێت و عەرەق بەئاشکرا دەخورێتەوە و داوێن پیسی بڵاودەبێتەوە وەپیاوان دەڕۆن و نامێنن، تەنها ئافرەت دەمێنێتەوە، تاوەکو وای لێدێت یەک پیاو کاروباری پەنجا ئافرەت رادەپەڕێنێت))** موسلیم و بوخاری ریوایەتیان کردووە، وە لەریوایەتێکی دیکەدا ((يظهر الزنا، ويقل الرجل، ويكثر النساء)) **واتە:** **((داوێن پیسی دەردەکەوێت، وەپیاو کەم دەبێت، وەئافرەت زیاد دەبێت))**

لەهەڵسەنگاندنی ئەمڕۆدا لەڕەگەزی لەدایک بووەکانی نێرینەو مێینەدا لەجیهان بەگشتی وەلەلێکۆڵینەوەی ئامارە جۆراو جۆرەکانی وڵاتاندا لەژمارەی پیاوان بەرامبەر ئافرەتان بەدیار کەوتووە، کەوا ئەونیشانەیە لەزەمانی ئێمەدا دەرکەوتووەو هاتۆتەدی.

# ٧٧
# دەركەوتنی داوێن پیسی و ئاشكراكردنی

لەگەڵ زۆر بوونی شتی خراپەكان و بڵاوبوونەوەی هیواو ئارەزووەكان لەكۆتایی زەماندا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە كەوا لەنیشانەكانی رۆژی دوایی بڵاوبوونەوەی داوێن پیسیە تاوەكو وای لێدێت پیاو تووشی ئافرەت دەبێت لەسەر رێگادا بەئاشكرایی.

لێرەدا دوونیشانە هەیە: دەركەوتنی داوێن پیسی، و بڵاوكردنەوەی، وە ئاشكراكردنی داوێن پیسیەكەو نەشارد نەوەی.

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت كەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( لا تقوم الساعة حتى لا يبقى على وجه الأرض أحد لله فيه حاجة ، وحتى توجد المرأة نهارا جهارا تنكح وسط الطريق ، لا ينكر ذلك أحد ولا يغيره ، فيكون أمثلهم يومئذ الذي يقول : لو نحيتها عن الطريق قليلا ، فذاك فيهم مثل أبي بكر وعمر فيكم)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت هەتا: یەكێك لەسەر زەوی نامێنێت كە ترسی لەخوا هەبێت، تاوەكو بەرۆژی رووناك ئافرەت دەبینیت داوێن پیسی دەكات لەناوەراستی رێگادا هیچ كەسێك ئینكاری ئەوە ناكات وە نایگۆرێت باشترین كەسیش لەم رۆژەدا ئەو كەسەیە كە دەڵێت خۆزگە لە ناوەراستی رێگاكە لاتدەدا، وە ئەم كەسەش لەناو ئەوان وەك ئەبوبەكرو عومەرە لەناو ئێوەدا))** حاكم ریوایەتی كردووە، وەئەلبانی دەڵێت لەزنجیرەی لاوازەكانە، زۆر لاوازە.

وە پێغەمبەر درוودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((إن أشراط الساعة : أن يرفع العلم، ويظهر الجهل، ويشرب الخمر، ويفشو الزنا)) **واتە: ((لەنیشانەكانی رۆژی دوایی زانست و زانیاری بەرزدەبێتەوە، و نەزانین بەدیار دەكەوێت و عەرەق بەئاشكرا دەخورێتەوەو داوێن پیسیش بڵاودەبێتەوە))** متفق عليه

لەریوایەتێكی دیكەدا ((يظهر الزنا، ويقل الرجال، ويكثر النساء)) **واتە: ((داوێن پیسی دەردەكەوێت، وە پیاوكەم دەبێتەوە، وە ئافرەت زۆر دەبێت))** متفق عليه.

ئەم دوونیشانانە دەركەوتوون لەزەمانی ئێمەدا، لەكاتی نیشاندانی هەندێك كەناڵی ئاسمانی لەو كارە بەدرەوشتانە، وە وێنەی رووت، یان لەئەنتەرنێت وێنەو گرتەی ڤیدیۆیی بڵاودەبێتەوە كەوا چاوی ئیماندار لەبینینی شەرم دەكات.

پێویستە لەسەر ئیمانداری پیاوو ئافرەت چاكسازی دەروونی خۆیان بكەن و چاویان بنوقێنن و داوێنی خۆیان بپارێزن، زۆر ووریابن لەگەڵ تێكەڵبوونی خراپەكاران و داوێن پیسان، لەگەڵ بەردەوامی پارانەوە لەخودای مەزن و دلۆڤان لەخۆراگری و داوێن پاكی.

## ٧٨

# وەرگرتنی کرێ لەسەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز



خوێندنەوەی قورئان خواپەرستی و نزیک بوونەوەیە لەخودای گەورە، وە لەبنچینەدا کە خواپەرستی ناچێتە ناوبواری بەدەست هێنانی دونیا، بەڵکو بۆ دوارۆژە بەمەبەستی گەیشتن بۆلای خودای گەورە و میهرەبان.

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا هەندێک خەڵک پەیدادەبن قورئان دەخوێنن و دەنگی خۆیان خۆش دەکەن، لەکۆڕەکانی پرسەو بۆنەکان بۆ ئەوەی لەسەر ئەم قورئان خوێندنە پارە وەربگرن.

**لەعیمرانی کوری حصین رەزای خوای لەسەر بێت کەبەلای پیاوێکدا تێدەپەڕێت کە ئەو پیاوە قورئانی دەخوێند لەسەر قەومێک و کاتێک کۆتایی پێهێنا داوای پارەی لێکردن.. عیمران ووتی (ان لله وانا اليه راجعون من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو** ((مَن قرأ القرآن فليسأل الله تبارك وتعالى بِهِ فإنهُ سيجيء قوم يقرؤن القرآن يسألون الناس به)) **واتە: (هەر کەسێک قورئان دەخوێنێت باداوای لەخودای گەورەو میرەبان بکات؛ بەڵام قەومێک دێت قورئان دەخوێنن داوای حەقەکە لەخەڵک دەکەن))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە

لەجابری کوری عەبدوللا رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پێغەمبەر ﷺ هاتەلامان و ئێمەش قورئانمان دەخوێندەوە لەناو ئێمەدا دەشتەکیو غەیرە عەرەبی لێبوو، فەرمووی ((أقرءوا، فكل حسن، وسيجيء أقوام يقيمونه كما يقام القدح، يتعجلونه ولا يتأجلونه))

**واتە: ((بیخوێنن، بەرێک و پێکی، وە قەومێک دێت قورئان دەخوێنن لەبەر خاتری ناوودەنگ و ناوبانگی خۆیان، وە پەلەدەکەن لەوەرگرتنی پارەی خوێندنەوەکە کەچی دوای ناخەن بۆ پاداشت وەرگرتن لەدوارۆژدا))** ابوداود ریوایەتی کردووە

٧٩

# لەناو خەڵکدا قەڵەوی زۆر پەیدا دەبێت

لەعیمرانی کوڕی حصین ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( خير أمتي قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم إن بعدهم قوماً يشهدون ولايستشهدون ويخونون ولا يؤتمنون ، وينذرون ولا يوفون ، ويظهر فيهم السمن)) **واتە: ((چاکترینی ئوممەت لەسەردەمی منە پاشان ئەوانەی لەدوای ئەوانەوە دێن پاشان ئەوانەی لە دوای ئەوانەوە دێن، ئینجا لەدوای ئەوان قەومێک دێت زولم و تاوان دەبینن بەڵام شایەتی نادەن وە ناپاکی دەکەن بەڵام دەستپاکی ناکەن، وە ماڵی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ بەخشین بەڵام ڕاستگۆنین بەرامبەر نەزرەکەیان، وە قەڵەوی تیایاندا دەردەکەوێت))** متفق عليه.

وەلەوانەیە زۆر بوونی قەڵەوی لەئاخیری زەماندا هۆکارەکەی بڵاوبوونەوەی ڕابواردن و خۆشی بێت وە چێشتخانەو شوێنی خواردنەوەکان هەمەڕەنگ دەبن، زۆربوونی خواردەمەنی و شیرنەمەنی، وەکەمی جوولەی خەڵک بەلاشەکانی، و ئامێرەکان هەموویان لەخزمەتی خەڵکدا دەبێت و کەم کەس بەپێ دەڕوات و ناجولێت تەنها کەمێکیان نەبێت، بۆیە لاشەو بەدەن لەلایەن گەورەو بچووکەوە، زیاد دەکات، تاوەکو ئامارەکان ئەوەیان دەرخستووە کە شەشیەکی دانیشتوانی جیهان بەدەست زیاد بوونی کێشیان ئازار دەکێشن.

هەر لەبەر ئەمەیشە ئەمڕۆ داوو دەرمان زۆر بووە کەوا چاودێری دەکات لەسەر کەمبوونەوەی کێش، و قەڵاچۆکردنی قەڵەوی، و نەشتەرگەری بەستانی گەدە، وە زۆر نموونەی وەک ئەمانە.



٨١ ٨٠

# دەرکەوتنی قەومێک دەبینن بەڵام شایەدی بەهەق نادەن - وەدەرکەوتنی قەومێک ماڵی خۆیان نەزر دەکەن بەڵام دڵسۆزنین

ئەم دوو نیشانەیە لەحەدیسەکەی پیشووتر هاتووە ((..ثم إن بعدهم قوماً يشهدون ولايستشهدون ويخونون ولايؤتمنون وينذرون ولا يفون.. )) **واتە: ((.....پاشان دوای ئەوان قەومێک دێت زولم و ستەم و تاوان دەبینن بەڵام شایەدی بەهەق نادەن، وە ناپاکی دەکەن بەڵام دەست پاک نابن، بەرامبەر ئەمانەتەکان، ماڵی خۆیان نەزر دەکەن، بەڵام ڕاستگۆنین بەرامبەر نەزرکردنەکەیان))**



# ٨٢

# بەهێز لاواز دەخوات

((عن عائشة رضي الله عنها قالت : دخل عليَّ رسول الله ﷺ ، وهو يقول: يا عائشة، قومك أسرع أمتي بي لحاقا ، قالت : فلما جلس ، قلت : يا رسول الله، جعلني الله فداءك، لقد دخلت وأنت تقول كلاما ذعرني ، قال : وما هو ؟ قالت : تزعم أن قومك أسرع أمتك بك لحاقا ، قال : نعم ، قالت: ومم ذاك؟ قال: تستحليهم المنايا ، وتنفس عليهم أمتهم، قالت: فكيف الناس بعد ذلك، أو عند ذلك؟ قال: دبى ، يأكل شداده ضعافه ، حتى تقوم عليهم الساعة )) واتە: ((لەعائیشەوە رەزای خوای لێ بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ هاتەلام، دەیفەرموو ((ئەی عائیشە قەومەکەی تۆ خێراترین ئوممەتی منن کەبەمن دەگەن)) ووتی کاتێک پێغەمبەر دانیشت ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خودا منت بەفیدا بکات کە هاتیتە ژوورەوە قسەیەکت کرد منت ترساند، فەرمووی ((کامەیان؟)) عائیشەووتی: تۆ دەفەرموویت قەومەکەی




من خێراترین ئوممەتی تۆن دەگەن بەتۆ، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی ((بەڵێ)) ووتی، جا بۆ چی وایە؟ فەرمووی ((مردن زوو راویان دەکات و هێرشیان بۆ دێنێ وە ئوممەتەکانیان لەسەریان خۆیان گێف دەکەنەوە)) وتی: وتم ئەی خەڵکی دوای ئەوان چۆن دەبێت؟ فەرمووی ((کوللە بەهێزەکان لاوازەکان دە خوات تاوەکو قیامەت لەسەریاندا هەڵدەستێت)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە

ئەبو عەبدولرەحمان دەڵێت: فسره رجل هو الجنادب التي لم تنبت أجنحتها: واتە: (پیاو وەک ئەم کوڵلانەن کەهێشتا باڵیان نەرواوە)

(الدّبي) ئەو کوللەیەیە پێش ئەوەی بفڕێت.

(الجنادب) کۆی (جندب)ە، ئەویش کولله یە.

لەو حەدیسەدا ئاماژە لەسەر ڕوودانی زوڵم و ستەمێکی مەزن و شەڕێکی گەورە دەکات تاوەکو وای لێدێت بەهێز لاواز دەخوات.

# ٨٣

# وازهێنان لەحوکمی قورئان کە خودای گەورە دایبەزاندووە

حوکم کردن بەوەی خودای مەزن و دلۆڤان دایبەزاندووە، یەکێکە لەئەرکە هەرە پیرۆزەکان

﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ المائدە/٤٤

**واتە// (جائەوەی حوکم و دادوەری بەو بەرنامەیەنەکات کەخودا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە بێباوەڕن)**



لەکۆتایی زەماندا پالپشتی ئیسلام بەرە بەرە نامێنێت، وەیەکەمین شت کە نامێنێت حوکم کردنە بەوەی کە خودا دایبەزاندووە.

لەئومامە الباهلی رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت : ((لينتقضن عرى الإسلام عروة عروة، فكلما انتقضت عروة تشبث الناس بالتي تليها ، فأولهن نقضا الحكم ، وآخرهن الصلاة )) ئەحمەدو تەبرانی ریوایەتی کردووە. **واتە: ((ئەوانەی پالپشتی ئیسلام دەکەن هێدی هێدی نامێنێت و دەپوکێنەوە وەهەرکاتێک پالپشت و ڕوکنێک نەما خەڵکی تەشەبووس بەوەی دوای ئەوان دەکات، یەکەم شت کە نامێنێت حوکم کردنە وەکۆتاییەکەشیان نوێژکردنە))**

بەداخەوە لەزۆربەی وولاتەئیسلامیەکان ئەو نیشانەیە دەرکەوتووە و حوکم بەئیسلام ناکەن تەنها ئەوانەی پەیوەندیان بەهاوسەرگیری و کاروبارەکانی تەڵاق و میراتەوە هەیە، بەڵام مامەڵەکردنی بازرگانەکان سزادانی تاوانەکان و سنوورە شەرعیەکان وە زۆربەیان حوکم بەیاساکانی فەرەنسی و بەریتانی دەکەن.

ئەو حوکمەش پێچەوانەی ئەو حوکمەیە کەخودای گەورە دایبەزاندووە.

﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾ المائدە/٥٠ **واتە// (کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەووردی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە))**

# ٨٤

# زۆربوونی رۆمەکان و کەم بوونەوەی عەرەب

رۆمەکان ئەمرۆ بەئەوروپییەکان و ئەمەریکیەکان ناوزەد دەکرێن، بۆیەش ناونراون رۆم چونکە بەلای زەردیدا دەچن (الاصفر بن الروم بن عیصو بن اسحاق بن ابراهیم)، لەبەر ئەوەشە بەهۆزی الاصفر ناونراون. (التذكرة للقرطبي ٦٨٩/٢)

لە المستورد الفهرییەوە کە بەعەمری کوری عاصمی گووت، گویم لەپێغەمبەربوو ﷺ کەدەیفەرموو ((تقوم الساعة والروم أكثر الناس، فقال له عمرو بن العاص: أبصر ما تقول. ، قال: أقول لك ما سمعت من رسول الله فقال عمرو بن العاص : ان تكن قلت ذالك ان فيهم لخصالاً أربعاً

- انهم لأسرع الناس كرّة بعد فرّة.
- وأنهم لخير الناس لمسكين وفقير وضعيف.
- وإنهم لأحلم الناس عند فتنة.
- والرابعة حسنة جميلة وأنهم لأمنع الناس من ظلم اللموك .

**واتە: ((قیامەت هەڵدەستێت و رۆمەکان لەهەموو خەڵک زیاترن)) عەمروی کوری عاص پێی ووت : جوان سەیرکە کەچی دەڵێیت، ووتی ئەوە دەڵێم کە گوێم لەپێغەمبەری خوای بووە دروودی خوای لەسەر بێت، جا عەمری کوری عاص ووتی: کەئەمەشت ووت ئەوانە چوار خەسلەتیان هەیە.**

- **ئەوان لەهەموو کەس خێراترن لەئارەزوومەندیتی شەرکردن پاش هەلاتنیان زوو خۆیان رێکە دەخەنەوە.**
- **وە ئەوانە لەهەموو خەڵک چاکترن بۆ هەژارو نەدارو لاوازان.**
- **ئەوانە لەهەموو کەس نەرمترن لەکاتی ئاژاوەو فیتنەدا.**
- **وەچوارەمیان شتێکی چاکە، ئەوانە لەهەموو کەس زیاتر نایەڵن پاشاو سەرکردەکانیان زوڵم و ستەم بکەن.** موسلیم ریوایەتی کردووە

لە ام شریک کەوا گوێی لە پێغەمبەر بووە ﷺ دەفەرموویێت ((ليفرّن الناس من الدجال في الجبال، قالت أم شريك : يارسول الله فأين العرب يومئذ؟ قال: هم قليل)) **واتە: ((خەڵکی لەبەر دەجال بەرەو چیاکان رادەکەن)) ام شریک ووتی (ئەی پێغەمبەری خوا ئەی لەم رۆژەدا عەرەب لەکوێن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((ئەوان کەمن))** موسلیم ریوایەتی کردوە

وە دەڵێن مانای ((رۆمەکان لەهەموو کەس زیاترن)) هێمایەکە بۆ بڵاوبوونەوەی زمانی ئەوروپی (ئینگلیزی) وە سەرەتای کۆچ کردنی زمانی عەرەبی.
هەندێک لەخاوەنی زانست و زانیای دەڵێن ((عەرەبەکان ئەوانەن بەعەرەبی قسەدەکەن وە ئەعرابی لەدانیشتوانی بیابانن ئەمانە غەیرە عەرەبن))

# ٨٥
# زیادبوونی سەروەت و سامان و زۆر بوونی لەناوخەڵکدا

موسلمانەکان چەند ساڵێکی یەک لەدوای یەک لەگەڵ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت ژیان، وە چەند ساڵێکیش دوای ئەو، ئەوانە هەردەم لەلێواری کەمگوزەرانی ژیان و پێداویستیەکی توونددا بوون، جاری واهەبوو مانگ دەڕۆیشت و مانگ دەهات لەماڵی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت ئاگر هەڵنەدەکرا، بەڵکو خواردنیان تەنها نان و خورما بووە.



پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت قسەی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد کەوا ئەم حاڵەتە دەگۆڕێت، وەلەنیشانەکانی رۆژی دوایی ئەوەیە کەوا سەروەت و سامان زۆر دەبێت، تاوەکو وای لێدێت پیاو یەک مانگ دەگەڕێت بۆ ئەوەی زەکاتی خۆی بدات کەسێک نادرۆزێتەوە لێیوەربگرێت لەبەر زۆری دەوڵەمەندی خەڵک.
لەئەبوهوریرەوە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت ((لاتقوم الساعة حتى يكثر فيكم المال فيفيض حتى يُهِمَ ربَّ المال من يقبله منه صدقة ويُدَعى إليه الرجل فيقول لا إرب لي فيه)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو سەروەت و سامان لەنێوانتان زۆر دەبێت تاوەکو خاوەن سامان دڵی بەخەمە کەکەس نیە زەکاتی لێوەربگرێت، وبانگی**

**پیاوێ دەکات بەڵام دەڵێت پیویستیم پێی نیە))** متفق علیه

لەمووسای ئەشعەریەوە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرموویێت ((ليأتين على الناس زمان يطوف الرجل فيه بالصدقة من الذهب ثم لايجد أحداً ياخذها))

واتە: **((رۆژگارێ بەسەر خەڵکدا دێت پیاو زەکاتی زێری دەکەوێت تاکو بیدات بەڵام کەس نادۆزێتەوە کەلێی وەربگرێت ))** موسلیم ریوایەتی کردووە

## خاوەن عیلم و زانستەکان هاوڕانین لەسەر ئەوەی ئایا ئەو نیشانە ڕوویداوە یان نا؟

دەڵێن ئەمە لەسەردەمی سەحابەکان هاتۆتەدی بەهۆی رزگارکردنی خاکی موسلمانان و دەست کەوتنی سەروەت و سامانی فارس و رۆمەکان.

پاشان پارە لەزەمانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز زۆر بووە پیاو هەبووە وویستوویەتی سەدەقەیەک بکات کەچی کەسێکی نەدۆزیووەتەوە وەریبگرێت، یاخود پارەی هەبووە بۆ ئەوەی ببەخشێت بەیەکێک، پێی ووتوە پێویستیم پێی نیە.



دەڵێن ئەمەش لەکۆتایی زەماندا روودەداتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێکردووە کە پارەوپوول لەزەمانی مەهدیدا ئەوەندە زۆ دەبێت کە بەهەردوو دەست زێڕو زیوو کۆدەکرێتەوە و بەبێ ژماردن دەدرێت بەخەڵک لەبەر زۆری و فراوانی پارەو پوول ناژمێردرێ، وە زەویش بەرەکەت و خەزێنەی خۆی فڕێ دەداتە دەرەوە خەڵکیش بەو هەموو بەرەکەت و چاکەیەوە دەوڵەمەند دەبێت تاوەکو وای لێدێت زەوی لەناوسکی خۆی ستوونی زێڕو زیو فڕێدەداتە دەرەوە.

لەسەعیدی جەریریەوە ئەویش لەئەبی نەزرەوە ووتی: ئێمە هەموومان لای جابر رەزای خوای لەسەر بێت دانیشتبووین ووتی : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت (( يكون في آخر أمتي خليفة يحثي المال حثيا لا يعده عدد، قلت - أي سعيد الجريري - لأبي نضرة وأبى العلاء، أتريان أنه عمر بن عبدالعزيز؟ قال : لا ))

واتە: **((لەکۆتایی ئوممەتەکەمدا خەلیفەیەک پەیدا دەبێت بەهەردوو دەستەکانی زێڕو زیو دەداتە خەڵک بێ ئەوەی بیژمێرێت)) ئەبی سەعیدی جەریری ووتی بەئەبی نەزر، و ئەبی عەلاء : ئایا وانابینن کە ئەم خەلیفەیە عومەری کوڕی عەبدول عەزیز بێت؟ ووتیان : نەخێر)).** موسلیم ریوایەتی کردووە.

# ٨٦
# دەرهێنانی زەوی خەزینەکانی

لەبەر زۆربوونی پارەوپوول و فراوانبوونی لەئاخیری زەماندا، کەوا زەوی هەرچی خەزێنەو زێڕوزیو هەیە کەلەناو هەناویدا هەبووە فرێی دەداتە دەرەوە، وەخەڵکیش لەبەر زۆری سەروەت و سامانەکەی خێرو چاکە دەکەن.

لەئەبوو هورەیرەوەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( تقيء الأرض أفلاذ كبدها ، أمثال الأسطوان من الذهب والفضة ، فيجيء القاتل فيقول : في هذا قتلت ، ويجيء القاطع فيقول : في هذا قطعت رحمي ، ويجيء السارق فيقول : في هذا قطعت يدي ، ثم يدعونه فلا يأخذون منه شيئا)) **واتە: ((زەوی لەناوسکی خۆی هەرچی پارچە هەیە وەک ئەستوونی لەزێڕو زیوو دەریدەکات، جا یەکێکی پیاوکوژ دێت و دەڵێت: لەبەر ئەمە کووشتم، وە یەکێکی تر دێت و دەڵێت : لەبەر ئەمە پەیوەندی خزمایەتیم پچڕاند، وە دزێک دێت و دەڵێت : لەبەر ئەمە دەستم بڕا، پاشان داوایان لێدەکرێت کەپارە ببەن بەڵام هیچی لێی وەرناگرن))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

نەوەوەی رەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت (مانای ئەم حەدیسە لێکچووە، واتە زەوی ئەوەی لەهەناویدا هەیە لەپارچە شاردراوەکان دەریدەکات.

وە (الاسطوان) – بەزەممەی هەمزەو پیتی طاء – کە کۆی (اسطوانة)یە بریتیە لە کۆڵەگەو ستوونیەکان – کە بەستوونەکان دەچێت لەبەر گەورەیی و زۆرییەکەی.




نموونەی چەند ستوون و کۆڵەکەیەکی کۆن

# ٨٧ ٨٨ ٨٩
# دەرکەوتنی شێوەگۆڕین - وەڕووچوونی زەوی - وە بەردباران

ئەمەش لەسزاکانە کەوا لەسەر هەندێک خەڵک ڕوودەدات لەئاخیری زەماندا، وە بریتیە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، لە عمرانی کوڕی حصین ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت ((في هذه الأمة خسف، ومسخ، وقذف، فقال رجل من المسلمين: يارسول الله ومتى ذلك؟ قال: إذا ظهرت القِيان والمعازف)) **واتە: ((لەو ئوممەتەدا زەوی ڕووچوون، و شێوەگۆڕین، و بەرد بارانکردن هەیە)) یەکێک لەموسلمانەکان ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا چاکەی ئەمە دەبێت؟ فەرمووی ((ئەگەر گۆرانی بێژوو ئافرەتی سەماکەرو مۆسیقا لێدان دەرکەوت))** ترمذی ریوایەتی کردووە



وە (القيان) کۆی (قنية)یە بریتیە لەئافرەتی گۆرانیبێژ.

وە (المعازف) کۆی (معزف)، بریتیە لەئامێرەکانی رابواردن و گۆرانی گوتن.

هەرکاتێک خەڵک بێدەنگ بێت لەفەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە، ئەوا تاوان و سزادەردەکەوێت، بڵاو دەبێتەوە، ئینجا سزاکان نزیک دەبیتەوە.

لەعائیشەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((يكون في آخر هذه الأمة خسف، ومسخ، وقذف قلت: يارسول الله، أنهلك وفينا الصالحون؟ قال: نعم، إذا ظهر الخبث)) **واتە: ((لەکۆتایی ئەم ئوممەتەدا ڕووچونی زەوی، و شێوە گۆڕین، و بەردبارانکردن ڕوو دەدات)) وتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئێمە بەهیلاک دەچین لەکاتێکدا پیاو چاکانمان تێدایە؟ فەرمووی ((بەڵێ ئەگەر خراپەکان بەتەواوی دەرکەوتن))** ترمذی ریوایەتی کردووە


ماڵێك لەشەودا بەزەویدا رووچووە، بەقووڵایی ٣٠٠ پێ بۆناو سکی زەوی

پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی داوە لەڕوودانی زەوی رووچوون و شێوە گۆڕین و بەرد بارانکردن وە هەروەها لەجۆرەکانی ئەهلی بیدعە کەوا جیاوازن لەعەقیدەو بیروباوەڕ وەک زەندیقەکان، وە ئەوانە گەورەترین ئەهلی دووڕوویی و بێباوەڕن.

لەنافیعەوە دەڵێت (کاتێک ئێمە لای عەبدوللای کوڕی عومەر دانیشتبووین، لەوکاتەدا پیاوێک هات، ووتی: پیاوێک لەئەهلی شام کەفلانە سڵاوت بۆ دەنێرێت جاعەبدوللا ووتی : پێم بلێ شتێک ڕوویداوە ئەگەر ئەمەوایە، ئەوان سڵاو بۆمن نانێرن، چونکە گوێم لەپێغەمبەری خوا بووە دروودی خوای لەسەر بێت دەیفەرموو ((لەئوممەتی مندا رووخسارگۆڕین وەبەردبارانکردن روودەدات بۆ هەردوو تاقمی زەندیقەکان و قەدەریەکان)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

لەحەدیسەکانی دیکەدا هاتووە کەوازەوی ڕووچوون لەئاخیری زەماندا روودەدات بەسوپایەک کە دەیەوێت کە عبە داگیربکات، جا خودای گەورە سوپاکە لەسەرەتاوە تاکۆتایی لەزەویدا دەباتە خوارەوە.

لەبەقیرە ژنی القعقاع کوڕی ئەبی حەدەرد بوو دەیگووت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ لەسەر مینبەر دەیفەرموو((إذا سمعتم بجيش قد خسف به قريباً فقد أظلّت الساعة))

**واتە: ((ئەگەر گوێ بیست بوون بەسوپایەک لەزەویدا چووەتە خوارەوە لەم نزیکانەدا ئەوا بەڕاستی ڕۆژی دوایی نزیک بووەتەوە))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە

واتە بەم نزیکانە لەمەدینەدا ئەم سوپایە لەزەویدا روودەچێت، و لەدواییدا بەدرێژی باسی حاڵی ئەم سوپایە دەکەین. سەیری نیشانەی ژمارە (١٢٢) بکە لەنیشانە بچووکەکان لەکۆتاییدا..بێگومان ئەم سزایانە نەلەسەر خەڵکی گوناهبار و ئەوانەی تاوان دەبین و بێدەنگ بوون روودەدات، بۆیە باموسلمان لەم کارانەدا ئاگادار بێت.

## ٩٠

# بارانێک ئەو ماڵانەی لەقوڕو بەرد دروستکراوە لێی دەرباز نابێت

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە، بەباران بارینێک لەئاسماندا، هیچ ماڵێک کەلەقوڕولیتەو بەرد دروستکرابێت لەبەرامبەریدا خۆی ڕاناگرێت، بەڵام ئەو خێوەتانەی لەمووی ووشتر دروستکرابێت لەبەرامبەریدا خۆی ڕادەگرێت.

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت ((لاتقوم الساعة حتى تمطر السماء مطرا، لايكن منه بيوت المدر، ولايكن منه إلا بيوت الشعر))

**واتە:** ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو بارانێک لەئاسماندا دەبارێت، کەهیچ ماڵێک لەقوڕو لیتە و بەرد دروست کرابێت لێی دەرباز نابێت تەنها ئەو ماڵانەی لەموو دروست کراون)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە.



# ٩١

# بارانێک لەئاسماندا دەبارێت کەچی هیچ شتێک لەزەویدا شین نابێت

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە دابەزینی بارانێکی گشتی لەئاسماندا کەچی هیچ شتێک لەزەویدا شین نابێت لەڕووەک و بەروو بوومەکانی.

لەئەنەسەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((لاتقوم الساعة حتى يمطر الناس مطراً عاماً، ولا تُنبت الارض شيئاً)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو بارانێکی گشتی بۆ خەڵک دەبارێت کەچی هیچ شتێک لەزەویدا شین نابێت))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە

بێگومان ئەمە لەڕۆیشتنی بەرەکەتی زەویە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((ان السنة ليس بأن لايكون فيها مطر، ولكن السنة أن يمطر الناس ولا تنبت الأرض)) **((ووشکە ساڵی و قاتوقڕی ئەوەنیە کەوا باران نابارێت، بەڵکو ووشکە ساڵی و قاتو قڕی ئەوەیە کەوا باران زۆر دەبارێت بۆ خەڵک بەڵام هیچ شتێک لەزەویدا شین ناکات))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.



# ٩٢
# فیتنەیەک هەموو عەرەب دەگرێتەوە



لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە، ڕوودانی فیتنەو ئاژاوەیەکی گەورە تووشی عەرەب دەبێت، کە زۆربەیان تیایدا دەکوژرێن و لەناودەچن.

لەعەبدوڵلای کوڕی عەمرو ڕەزای خوای لێبێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((تكون فتنة تستنظف العرب قتلاها في النار، اللسان فيها أشد من وقع السيف)) واتە: **((فیتنیەک بەرپا دەبێت هەموو عەرەب دەگرێتەوەو کوژراوەکانیان بۆ ناو ئاگرە، وەزوبان و هەڕەشەکان توندترن لەشمشێر))** ئەحمەد و ابوداود و ترمذی ابن ماجه ڕیوایەتیان کردووە.

((تستنظف العرب)) واتە هەرهەموو عەرەب دەیانگرێتەوەو بەهیلاک دەچن.

وە ((قتلاها في النار)) واتە شەڕو کوشتاریان لەسەر دونیایە، و بەدوای هەواو هەوەسی شەیتاندا دەکەون، کەئەمانە لەسەر ئەم جۆرە شەڕدەکەن واجبە لەسەر یان سزا بدرێن.

وەئەگەر هاتوو بەموسڵمانی ویەکگرتووی بمرن ئەوا لەناو ئاگردا بەزیندوویی نامێننەوە هەتا ئەو کاتەی سزایەکە وەردەگرن.

مەبەستیش لەکووشتنیان: هەرکەسێک لەوفیتنەدا بکوژرێ ئەوا ڕووبەڕووی جێگایەکی توند دەبێتەوە چونکە ئەوان مەبەستیان لەو شەڕەدا ڕاگەیاندنی دینەکەیان نین. یان لەناو بردنی زوڵم و ستەم، یان چاودێری کردنی هەقخوازەکان، بەڵام تەنها مەبەستیان خراپەکاری شەڕو شۆڕە لەسەر چاوتێبڕین لەسەروەت و سامان و کورسی دەسەڵات.

وە ((اللسان)) واتە خۆخستنە ناو شەڕەکە و پەلاماردان و هەڕەشە کردنەلەیەکتر، ئەمەش لەدەمی شمشیر توندو تیژ ترە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕیوایەتی دەسەڵاتکردنی زمان واتە دەربڕین و دەرێژەدانە بەشەڕو کوشتار ((فيها اشد من وقع السيف))

٩٥ ٩٤ ٩٣

# قسەکردنی دارو درەخت - قسەکردنی بەرد سەرکەوتنە بۆ موسلمانان - شەڕکردنی موسڵمانان لەگەڵ جوولەکەکان

ئەم شــەڕە لەکۆتایی زەماندا روودەدات، موسـلمانەکان سـەردەکەون، وەدارودرەخت وبەرد بەزوبان دێن دەڵێن، ئەی موسلمان، ئەی بەندەی خوا، ئەمە جوولەکەیە لەپشتم خۆی شاردۆتەوە وەرە بیکـوژە، داروبـەرد لەگـەڵ موسـلمانەکان هاوسـۆزن، و پشتیان دەگرن، و سەرکەوتنیش لەخواوەیە.



دارى الغرقد کە لەحەدیسەکەدا باسکراوە

لەئیبنو عومەر رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت ((تقاتلكـم اليهـود، فتسـلطون عليهم، حتى يقول الحجر، يامسلم هـذا يهودي ورائـي فاقتله )) **واتە: ((جوولەکەکان شەڕتان لەگەڵدا دەکەن ئینجا بەسـەر ئەواندا زاڵدەبن، تاوەکو بـەرد دەڵێـت: ئـەی موسـلمان ئەوە جوولەکەیە لەپشتم خۆی شاردۆتەوە وەرە بیکوژە))** متفق عليه.

وە قسەکردنی دارو بەرد لەنیشانەکانی رۆژی دواییە، تەنها داری (الغرقد) نەبێت کە دارێکی یەهودیە قسەناکات.

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى يقاتل المسلمون اليهود، فيقتلهم المسلمون، حتى يختيء اليهودي من وراء الحجر والشجر، فيقول الحجر: يامسلم، ياعبدالله، هذا يهودي خلفي، تعال فاقتله إلا الغرقد، فإنه من شجر اليهود )) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو موسلمانەکان شەڕی جوولەکە دەکەن، وەموسلمانەکان شەڕیان لەگەڵ دەکەن و دەیانکوژن تاوەکو جوولە کە لەپشت دارو بەردەکان خۆی دەشارێتەوە، دارەکە یان بەردەکە دەڵێت: ئەی موسلمان ئەی بەندەی خوا: ئەمە جولەکەیە لەپشتم خۆی حەشارداوە، وەرە بیکوژە جگە لەداری (الغرقد) نەبێت قسەناکات، چونکە لەدارەکانی**

**جولەكەیە))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەڕیوایەتێکی تردا ((لاتقوم الساعة حتى تقاتلوا اليهود، حتى يقول الحجر وراءة اليهودي، يامسلم هذا يهودي ورائي، فاقتلە)) **واتە:** ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو شەڕ لەگەڵ جولەکەکان دەکەن، تاکو بەرد کە جولەکەیەک خۆی لەپشتی حەشارداوە دەڵێت، ئەی موسلمان ئەوە جوولەکەیە لەپشتم وەرە بیکوژە)) بوخاری ریوایەتی کردووە.

قسەکردنی دارو بەردیش راستەوگومانی تێدانیە، چونکە خوای گەورە بەتوانایە لەسەر بەدەنگ هێنانی بێ گیانەکان وەئەمەش لەنیشانەکانی رۆژی دواییە، لەنهیک بن صریم رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت ((لتقاتلن المشركين، حتى يقاتل بقيتكم الدجال على نهر الأردن، أنتم شرقية وهم غربية)) **واتە: ((شەڕ لەگەڵ کافرەکان دەکەن، تاوەکو هەندێکتان کەماون شەڕ لەگەڵ دەجاڵ دەکەن لەسەر ڕووباری ئوردون، ئێوە لەڕۆژهەلاتن و ئەوانیش لەڕۆژئاوان))**

نهیک بن صریم دەڵێت (( ئەو رۆژە نەمدەزانی رووباری ئوردن دەکەوێتە کوێ)) تەبەرانی وبزار ریوایەتیان کردووە

مەبەست لێی : ئەو دەریایە کە فەلەستنی داگیرکراوو ئوردن لێک جیادەکەنەوە.



وێنەیەکی دیکە لە داری الغرقد



لێوارێکی دەریای مردوو (عین زغر) لەرۆژ هەلاتی وولاتی ئوردنە، لەرۆژ ئاواکەشی فەلەستینی داگیرکراوی ئێستایە لە جوولەکە، هەندێك لەتوێژینەوە زانستەکان دەڵێن ئاوەکەی ئێستا لە کەم بوونەوە دایە، پێشبینی دەکرێت لەسالی (١٤٧٠کۆچی - ٢٠٥٠زاینی) ووشك بێت - خوای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە



# ٩٦
# ڕووباری فورات چیایەک لەئاڵتوون دەردەخات




ڕووباری فرات

ڕووباری فورات زانراوەو بەناوبانگە، کەئاوێکی زۆری تێدایە، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی داوە کە ڕووباری فورات چیایەک لەژێر ئاشکرا دەکات و ڕێرەوی خۆی دەگۆڕێت، و ئەم چیایەش بۆ خەڵکی بەدیار دەکەوێت، ئینجا شەڕی لەسەر دەکەن، وخەڵکێکی زۆریش دەکوژرێت.

پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردۆتەوە لەوەی کەس ئامادە نەبێت لەو شەڕە بۆوەرگرتنی ئەو ئاڵتوونە، لەترسی فیتنەو ئاژاوە، یان ڕوودانی شەڕو کوشتار بەهۆیەوە.

لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لاتقوم الساعة حتى يحسر الفرات على جبل من ذهب يقتتل الناس عليه، فيقتل من كل مائة تسعة وتسعون، ويقول كل رجل منهم لعلى أكون أنا الذي أنجو)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو فورات کێوێکی ئاڵتوون دەردەخات، خەڵکی یەکتر لەسەری دەکوژن، لەهەر سەدکەسێک نەوەدو نۆکەس دەکوژرێت، هەریەک لەوانەش بەر لەکوشتنی دەڵێت: بەڵکو من ئەو تاکە کەسەبم کەرزگارم دەبێت))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

وە لەڕیوایەتێکی دیکەدا ((فمن حضره فلا يأخذ منه شيئاً)) **واتە: ((جا هەر کەس ئامادەی ئەو شەڕە بوو باهیچ شتێ لێی هەڵنەگرێ و نەیبا))** متفق عليه.

وە لەئەبی بن کەعب ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت ((هێشتا کەخەڵکی لەداواکردنی دونیا بەپەلەن، من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو ((يوشك أن يحسر الفرات عن جبل من ذهب، فإذا سمع به الناس ساروا إليه، فيقول من عنده، لئن تركنا الناس يأخذون منه ليذهبن به كله، قال: فيقتتلون عليه، فيُقتل من كل مائة تسعة وتسعون)) **واتە: ((خەریکە ئاوی فورات چیایەک لە ئاڵتوون دەردەخات، وە هەرکاتێک خەڵکی گوێ بیستی**

**بوون دەڕۆن بۆلای، و هەرکەسەو بەوەی لای خۆی دەڵێت، ئەگەر بەجێی بهێڵین خەڵک دێن هەمووی دەبەن، وە فەرمووی : جا شەڕی لەسەر دەکەن، لەهەر سەد کەسێک نەوەدو نۆی دەکوژرێت))** موسلیم ریوایەتی کردووە.




مانای (انحسارە)، واتە دەرکەوتنی، کەئەویش کێوێکە لەئاڵتونێکی ڕاستەقینە.

ئەمەش ئەو کاتە دەبێت بەهۆی گۆڕینی ڕێرەڕەوی ئاوەکە، و ئەو گەنجینەیەش، یان ئەو چیایە لەژێرە داپۆشراوە بەقوڕو لیتە، وەنەزراوەو دیارنیە، و هەرکاتێک ڕێرەوی ئاوەکە گۆڕا بەهەر هۆکارێک بێت خوای گەورە ئاشکرای دەکات.




لەو کاتەدا هەر کەسێک لەویَ ئامادە بێت پێویستە هیچی لێنەبات، لەترسی فیتنەو خوێن ڕشتن، ئەوفیتنەیەش هێشتا دەرنەکەوتووە، خودای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە کەی ئەمە ڕوودەدات.

ئەمڕۆ وولاتی تورکیاو سووریا بەربەستی گەورە لەسەر ڕووباری فورات دروست دەکەن، و لەو بەربەستانەدا کارگەی گەورە لەسەر دروست دەکەن، ئەمەش دەبێتە کەمبوونەوەی پێدارۆیشتنی ئاو تێیدا، ئەمەش دەبێتە پێشەکیەکان بۆ دەرکەوتنی ئەو چیایە.



# ٩٧

# زەمانێک دێت پیاو دادەمێنێت لەنێوان کردن و نەکردنی داوێن پیسی




لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی کەوا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوە، پیاو دادەمێنێت لەهەڵبژاردنی نێوان کردەوەی ناشیرین و داوێن پیسی دا کەبیکات، یان وازی لێبهێنێت، جا تاوانبار دەکرێت بەبێدەسەلات و کۆنەپەرست، وە زۆری تر لەووشە ناپێشکەوتووەکان لەداب و نەریتی و ئەخلاقی خراپەکاران، پێغەمبەر ﷺ خەڵکی ئاگادار کردۆتەوە، ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکات لەسەر هەڵبژاردنی نەکردنی تاوان، و دوورکەوتنەوە لەبێ ئابڕوویی.

لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((يأتي على الناس زمان يخير فيه الرجل بين العجز والفجور ، فمن أدرك ذلك الزمان فليختر العجز على الفجور )) واتە: **((زەمانێک بەسەر خەڵکی دا دێت کە لەنێوان هەڵبژاردنی کردن و نەکردنی داوپیسیدا دادەمێنێت، جا هەرکەسێک درکی بەم زەمانەکرد، با نەکردنەکە هەڵبژێرێت لەسەر کردنی داوێن پیسی))** ئەحمەدو ابو يعلى ریوایەتیان کردووە

ئەم کارە دیاردەیەکە لەزەمانی ئێمەدا، بەجۆرێک هەر کەسێک پابەند بێت بە سەرپۆش کردنی ئافرەتان بۆ نموونە، تاوانبار دەکرێت بەوەی کەوا بێدەسەلاتێکی کۆنەپەرستە، یان هەر کەسێک واز لەسوو خۆری بهێنێت، یان پێدان و وەرگرتنی بەرتیل، یان سەیرکردنی کەناڵە ئاسمانیە بەد ڕەوشتەکان، وەسف دەکرێت بەکەسێکی کۆنەپەرست و بێدەسەلات و بێ توانا، ئادەمیزادیش لەکۆمەڵگادا ئازادە لەهەڵبژاردنی نێوان خراپەیەک کەبیکات یان نەیکات.

# ٩٨

# گەڕانەوەی دوورگەی عەرەب بەسەوزایی و ڕووبار



ئەگەر تاماشای جەزیرەی عەرەب بکەیت دەبینیت کە بیابانە ڕووتەنی و ووشک و بێ ئاویەکەی ٧٠٪ ڕووبەرەکەیەتی، جا پێغەمبەرمان دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی پێداوین کەوا لە نیشانەو هێماکانی ڕۆژی دوایی جەزیرەی عەرەب بەگژو گیاو سەوزای و ڕووبار دەگەڕێتەوە لەکاتێکدا کە ئەو بیابانە ووشک و بێ ئاوە هیچی لێ شین نابێت.

لە ئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لا تقوم الساعة حتى تعود أرض العرب مروجا وأنهارا ، وحتى يسير الراكب بين العراق ومكة ، لا يخاف إلا ضلال الطريق - أي يخاف أن يضيّع الطريق - وحتى يكثر الهرج ، قالوا : وما الهرج ؟ يا رسول الله ، قال : القتل)) **واتە: ((قیامەت دانایەت تاوەکو خاکی عەرەب بەگژوگیاو ڕووبارەکانی دەگەڕێتەوە، تاوەکو سوار لەنێوان عێراق و مەککەدا دەڕوات لەهیچ ناترسێت تەنها لەوونکردنی ڕێگادا نەبێت - واتە دەترسێت ڕێگاکەی لێ وون بێت - تاوەکو (هرج) زۆر دەبێت)) ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا هرج چیە؟ فەرمووی ((کوشت و کوشتار))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

دیسان ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (( لا تقوم الساعة حتى يكثر المال ويفيض ، حتى يخرج الرجل بزكاة ماله فلا يجد أحدا يقبلها منه ، وحتى تعود أرض العرب مروجا وأنهارا)) **واتە: ((قیامەت هەڵناسێت تاکو سەروەت و سامان زۆر دەبێت و زیاد دەکات، تاوەکو پیاو دەیەوێت زەکات دەربکات لەماڵەکەی کەسێک نادۆزێتەوە لێیوەر بگرێت، تاوەکو خاکی عەرەب بەشینایی و گژوگیا و ڕووبار دەگەڕێتەوە))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

لە مەعازی کوڕی جبل ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت ((لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ساڵێک دەرچووین بۆ جەنگی تەبووک، کە نوێژەکانی کۆدەکردەوە، نوێژی نیوەڕۆ و عەسری پێکەوەکرد، وەمەغرب و عیشاش پێکەوە، تاوەکو ڕۆژێک نوێژەکەی دواخست، پاشان دەرچوو نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆکردەوە، پاش ئەمە دیسان نوێژی مەغریب و عیشای پێکەوەکرد، پاشان فەرمووی ((إنكم ستأتون غدا إن شاء الله عين تبوك ، وإنكم لن تأتوها حتى يضحى النهار ، فمن جاءها فلا يمس من مائها شيئا حتى آتي « ، فجئناها وقد سبق إليها رجلان ، والعين مثل الشراك تبض بشيء من ماء ، فسألهما رسول الله صلى الله عليه وسلم : « هل مسستما من مائها ؟ « قالا : نعم ، فسبهما ، وقال لهما ما شاء الله أن يقول ، ثم غرفوا من العين بأيديهم قليلا قليلا ، حتى اجتمع في شيء ثم غسل رسول الله صلى الله عليه وسلم فيه وجهه ويديه ، ثم أعاده فيها ، فجرت العين بماء كثير ، فاستقى الناس ، ثم قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : « يوشك بك يا معاذ إن طالت بك حياة أن ترى ما هاهنا قد ملئ جنانا)) واتە: ((انشاء الله ئێوە بەیانی دەگەنە کانیاوی تەبووک، ئێوە ناگەن بەم کانیاوە تاوەکو چێشتەنگاو، جاهەر کەسێ لەئێوە گەیشتە ئاوەکە بادەست لەئاوەکە نەدات تاکو من دێم)) دەڵێت: جاگەیشتینە سەر ئاوەکە، بەڵام پێش ئێمە دووپیاو گەیشتبوونە سەر ئاوەکە، کانیەکە وەکو شانەی مێش هەنگوێن وابوو ئاوەکەشی زۆر کەم بوو، پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکردن: ((ئایا دەستتان لەئاوەکەداوە)) ووتیان : بەڵێ، جا پێغەمبەر ﷺ ئەوەی خوای گەورە ویستی لەسەر بوو پێیگووتن، و دەڵێت : جا بەدەست کەم کەمە ئاویان لێ کۆدەکردەوە، جا پێغەمبەر ﷺ دەستی و ڕووخساری خۆی شووشت، پاشان ڕووی کردە ناو کانیاوەکە: جاکانیەکە تەقیەوە بەئاوێکی زۆر تاکو خەڵک گشتیان ئاویان لێ خواردەوە: پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((انزیکە ئەی معاز گەر تەمەنت درێژ بێت ئا ئەلێرەدا کەپر دەبێت لەباغ و باغات و شینایی)) موسلیم ڕیوایەتی کردووە.




هەندێک لەزانایان ئاماژە بەوە دەدەن کەوا کشانی بەستەڵەک ئێستابەرەو جەزیرەی عەرەب

پێشرەوی دەکات، کەوا لەگەڵیدا بەفروباران هەڵدەگرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی چاندنی کشت و کاڵ و خێرو بێرێکی زۆر، وە خودای مەزن و بەتواناش بەتوانایە لەسەر ئەوەی بیابانی عەرەب بگۆڕێت بۆ بەهەشت و سەوزایی رووباری زۆر، وە خۆشگوزەرانی و فراوانی، ئەم نیشانەیە هێشتا دەرنەکەوتووە، بەڵام هەموو پێشهاتێک نزیکە.

ئەوەی کەلەتەبووکدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی **((یوشـك یـا معاذ إن طالت بك حياة ان ترى ما ههنا قد مُلىء جناناً)) واتە: ((نزیکە ئەی معاز کە تەمەنت درێژ بێت ئالێرەدا دەبینیت پربـووە لـە ئاوو باغ و باغات و سـەوزایی))** ئەمەش ئەمرۆ روویـداوە لەماوەی ئەو پرۆژە کشتوکالیە گەورانەی لەتەبووکدا لەسەر رووبەرێکی فراوان لەسەر زەویەکەی دەکرێت.





(تەبووك)ی ئەمرۆ





وێنەیەك پرۆژە كشتوكاڵ و بێستانەكان دەردەخات كە دروست كراوە لە (تەبووك)ی ئەمرۆ

# ٩٩ ١٠٠ ١٠١

# دەرکەوتنی فیتنەی الاخلاص
# دەرکەوتنی فیتنەی السراء
# دەرکەوتنی فیتنەی الدهیماء

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەوا قیامەت هەڵناستێت تاوەکو سێ فیتنەی پێش نەکەوێت .

لەعەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت: ((كنا قعودا عند رسول الله ، فذكر الفتن فأكثر في ذكرها حتى ذكر فتنة الأحلاس ، فقال قائل : يا رسول الله وما فتنة الأحلاس ؟ قال : هي هرب وحرب ، ثم فتنة السراء ، دخنها من تحت قدمي رجل من أهل بيتي يزعم أنه مني ، وليس مني ، وإنما أولياَئي المتقون ، ثم يصطلح الناس على رجل كورك عليّ ضلع ، ثم فتنة الدهيماء ، لا تدع أحدا من هذه الأمة إلا لطمته لطمة ، فإذا قيل: انقضت ، تمادت يصبح الرجل فيها مؤمنا ، ويمسي كافرا ، حتى يصير الناس إلى فسطاطين، فسطاط إيمان لا نفاق فيه ، وفسطاط نفاق لا إيمان فيه ، فإذا كان ذاكم فانتظروا الدجال، من يومه ، أو من غده)) واتە: **((ئێمە لەلای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین باسی فیتنەکانی دەکرد، زۆر باسی کرد، تاکو باسی فیتنەی (احلاس)ی کرد، یەکێک ووتی ئەی پێغەمبەری خوا، فیتنەی احلاس چیە؟ فەرمووی ((بریتیە لەهەڵاتن و ئاوارەبوون وە تیاچوونی سەروماڵ، پاشان فیتنەی خۆشی، کەپیاوێک لەئال وبەیتی منە ئەو فیتنە دەخاتە ژێر پێم، لافی ئەوە لێدەدات کە لەبنەماڵەی منە، بەڵام لە من نیە، بەلکو دەچێتەوە سەرپیاوچاکێک، پاشان خەڵکی کۆدەبنەوە لەچوار دەوری پیاوێک وەک پەڕۆی لووس لەسەر پەراسوو وایە، پاشان فیتنەی ڕەشی پڕ لە لەناخۆشی و سەغڵەتی پەیدابدەبێت کەوا کەس لە ئوممەتەکەم لێی دەرباز نابێت هەرتووشی دەبێت، وە ئەگەر گوتیان فیتنە کۆتایی پێهات ئەوا دیسان دەست پێدەکاتەوە، لەو فیتنەیەدا مرۆڤ بەیانی تێیدا باوەڕدارەو ئێوارە دەبێتە کافر، وەخەڵکیش دەبێتە دو تیپ، تیپی باوەڕداران کە دڵسۆزن و دوو ڕوویيان تێدانیە، وە تیپی دوو ڕووەکان کەباوەڕ لەدڵیاندا نیە، جا ئەگەر ئەم نیشانانە دەرکەتن ئەوا چاوەڕێی دەجاڵ بکەن لە ئەمڕۆ سبەیدا))** ئەبوداود ریوایەتی کردووە

((الاحلاس)) کۆی (حلس)، ئەو سەرجلەیە کەلەسەر پشتی ووشتر دادەنرێت، ئەو سەرجلەش چۆن هەموو کات پێویستە بۆ ووشتر، ئاوهاش ئەو فیتنەیە بەخەڵکیەوە دەنووسێت کەکەس ناتوانێت لێی جودا بێتەوە، کە ئەویش ڕەشە وەک شەوی تاریک وایە.

((هرب)) کە پیتەکانی سەری هەیە (مفتوح) واتە خەڵک لەیەکتر ڕادەکەن، کاتێک لەنێوانیاندا

دەبێتە ناکۆکی و شەڕو ئاژاوە.
((حرب)) کەپیتی (راء) سەری هەبێت (مفتوح) واتە لەدەستدانی ماڵ و سامانی ئادەمیزاد، وەکەس و کارو خێزانیشی تیابچێت، کەهەموو شتێک بەجێ بهێڵێت.
((ثم فتنــة الســراء)) ئـەو نیعمەتانەن کـە خەڵکی دڵخـۆش دەکات لەتەندورسـتی باش و دەسـکەوتنی ماڵ و سـامان و هێـزو توانا، وەهەنـدێ خەڵک بەم فیتنەیە تووشـی تاوان و خراپەکاری دەبێت.
((دخنهــا)) واتە دەرکەوتن و ووروژاندنـی، وەک دوکەڵی ئاگروایە کە بەرزدەبێتەوە، هەر کاتێک داری تەڕ بچێتە سەری، دووکەڵەکەی زیاد دەکات.
((مــن تحت قدمــی رجل من اهل بیتی)) واتــە لەئال و بەیتی پێغەمبــەر دروودی خوای لەسەر بێت، ئاگادار کردنەوەیە لەسەر ئەو کەسەی کە هەوڵدەدات لەو رووژاندنی فیتنەکە.
((یزعــم انــه منی)) واتە کـە لەبنەماڵەی منـە، بەڵام لەمـن نیە و ئەو کردەوە ناشـرینە پیسـەی کەهەیەتی، وە من بێتـاوان و دوورم لەکردەوەکەی، ئەگـەر لەبنەماڵەی منیش بێت ئـەوا لەپیاوچاکەکانـی من نیە، بەڵکو دەچێتە سـەر پیاوچاکێک، وە ئەو پیـاوە دەگەڕێت بۆ هەڵگیرساندنی ئەو فیتنەو ئاژاوەیە.
((ولیس منی)) واتە لەمن نیە چونکە ئەو فیتنەکە دەورووژێنی، وەک خوای گەورە بۆ پێغەمبەر نوح علیه السلام دەفەرموێت ﴿إِنَّ ٱبۡنِي مِنۡ أَهۡلِي﴾ (هود/٤٥)، **واتە// ((ئەی پەروەردگارم کورەکەم لەخێزانی من بوو))** وە خودای گەورە دەفەرموویت ﴿إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖ﴾ هود/٤٦، **واتە// ((بەڕاستی ئەو لەخێزانی تۆ نەبوو، چونکە ئەو بەڕاستی کرداری چاک نەبوو ))**
((ثم یصطلح الناس علی رجل)) واتە کۆدەبنەوە لەسەر بەیعەت دان بەپیاوێک.
((ورك)) ئەو پارچە پەڕۆیەیە کەلەسەر پەراسوو دادەنرێت.
((علی ضلع)) تاکی (ضلوع) و (اضلاع)ە وە (ضلع) ئێسکی سینگە.
وەماناکەی : کارو کردەوە لەگەڵ ئەو پیاوە جێگیرنابێت، چونکە پارچە پەڕۆیەکە قورسە، وەئێسکی سینگ و پەراسووش بچووک و لاوازە، جا خەڵکەکە ناکۆکیان تێدا دروست دەبێت لەسەر پیاوێک کەشایانی گەورەیی نیە، کەمزان و ڕاسووکە، وەنیزامی پێ ڕاناوە ستێت، کاروباریشی پێ جێگیر نابێت.
((فتنة الدهیماء)) واتە فیتنەیەکی ڕەشی پڕ ڕووداوو کارەساتە.
((الالطمته لطمة)) : واتە کەس لێی دەرباز نابێت ئیلا تووشی ئەو کارەست و بەڵایە دەبێت وە (لطم) بریتیە لەلێدان لەسەر دەم و چاو، وەماناکەی کەوا کاریگەری فیتنەی (دهیماء) گشتگیرەو هەموو کەس دەگرێتەوە.

((فاذا قيل انقضت)) واتە گەر خەڵک وا خەیاڵ دەبەن کە ئەو فیتنەیە کۆتایی پێهاتووە.

((تمارن)) واتە زیادە دەکات و دەست پێ دەکاتەوە.

((يصبح الرجل فيها مؤمناً ويمسى كافراً))، واتە : لێی حەرام کراوە، خوێنی براکەی ونابێت دەستدرێژی بکرێتە سەر عەرزوناموس و ماڵ و سامانی، کە ئێوارە دادێت لەخۆی حەڵاڵ دەکات و بۆیە دەستدرێژی دەکاتە سەری، (ئەمە بەدرێژی لەنیشانەکانی ژمارە (٥١) باسکراوە))

((الى فسطاطين)) واتە دوو تیپ، یان دوو بەرە، وە دەڵێن دوو شارە.

((فسطاط الايمان لانفاق فيه)) واتە ئیمانێکی پاک و بێگەرد

((وفسطاط نفاق لا ايمان فيه)) واتە کارو کردەوەکانی دووڕووەکانی تێدایە لەدرۆکردن و ناپاکی و نەمانی بەڵێن و زۆرشتی لەو بابەتە.

((فانتظروا الدجال)) واتە دەرکەوتنی دەجال.

ئەو فیتنانە هێشتا دەرنەکەوتوون و خودای گەورەش لەهەمووکەس زاناترە، لەخودای گەورە دەپارێینەوە لەشەڕو فیتنەکەی بمانپارێزێت.



# ١٠٢
# زەمانێک دێت سوجدەیەک لەهەموو دونیاو ئەوەی تیایەتی باشترە



ئەوەیان لەزەمانی عیسای کوڕی مەریەم دا علیە السلام روودەدات، ئەمە هێشتا روونەداوە دەمێنێتەوە بۆ ئاخیری زەمان، وە زەمانی پێغەمبەر عیسا علیە السلام زەمانێکی چاک و بەخشندەیە، وەخوا پەرستیش تێیدا چاک و بەخشندەیە، وە خواپەرستنەکانی باشترە لەپاداشت و خێرەکەی، بەگوێرەی ئەو زەمان و پێگەیەی کەتێیدایە.

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت ((والذي نفسي بيده ، ليوشكن أن ينزل فيكم ابن مريم حكما عدلا ، فيكسر الصليب ، ويقتل الخنزير ، ويضع الجزية ، ويفيض المال حتى لا يقبله أحد ، حتى تكون السجدة الواحدة خيرا من الدنيا وما فيها )) **واتە: ((سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، عیسای کوڕی مەریەم لەئاسمان دێتە خوارەوە، بەداد پەروەری حوکم دەکات و خاچەکان دەشکێنێ وبەرازەکان دەکوژێ، سەرانە لادەبات، ماڵ و سامان زۆر دەکات تاوەکو کەس وەری ناگرێت و نایەوێت، تاکو دوای لێدێت بردنی سوجدەیەک خێری زیاترە لەدونیاو ئەوەی تیایەتی))** بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە.

پاشان ئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت ووتی ئەگەر حەز دەکەن بیخوێننەوە ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ ﴾ النساء/١٥٩

**واتە// ((هیچ کەسێک نیە لەخاوەنانی کتێب، کەباوەڕ نەهێنێت بەعیسا پێش ئەوەی گیانی دەرچێت، بەڵکو سوێند بەخوا هەر باوەڕ دەهێنێت پێی لەپێش**

مردنیدا (لەسەرە مەرگدا پەردە لەسەر چاویان لادەدرێت و گەلێک ڕاستی دەردەکەوێت بۆیان، یاخود کاتێک عیسی دادەبەزێت گاورو جوولەکەکانی ئەو کاتە باوەڕی دروستی پێدەهێنن) و لەڕۆژی قیامەتیشدا شایەدە بەسەریانەوە کە ئەوانەی گومڕابوون، خۆیان گومڕابوون و ئەم کاتی خۆی هەر ڕێگەی ڕاستی نیشانداون))

وەماناى فەرموودەکەی ((حتى تكون السجدة الواحدة خيراً من الدنيا وما فيها)) کەوا خەڵک ئـارەزووی زۆری هەیە لەنوێژکردن و خواپەرسـتی، بۆ گـوێ پێنەدانیان بەدونیا، وەدڵنیا بوون بەنزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی وەکەمی ئارەزوویان بەدونیاو لەبەر نەبوونی پێویستی پێیان.

قاضی عیاض دەڵێت: (( ماناکەی، پاداشـتەکەی بۆ کەسی نوێژگەر لەخێرو سەدەقەکردن لەدونیاو ئەوەی تیایەتی باشترە، لەبەر زۆری سەروەت و سامان لەو کاتەدا وەکەمی ڕەزیلی، وەکەمی پێویسـتی خەڵک بەنەفەقە بۆ جیهاد کردن، وەسـوجدەش ئەو سـوجدەیەکە ئێستا دەکرێت، یان ئاماژەیە بەنوێژکردن، خوای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە))



# ١٠٣

# كرانەوەو گەورە بوونی مانگ

الأهلة کۆی (هلال)ە، ئەو مانگەیە کەلە یەکەمین سەرەتای مانگ دەردەکەوێت، بەبچووکی دەست پێدەکات لەیەکەم شەو لەمانگی کۆچیدا، پاشان پلەپلە گەورە دەبێت بۆ ناوەڕاستی مانگ (شهر)، وە پاشان جارێکی تر بچووک دەبێتەوە بۆ کۆتایی مانگ.

لە نیشانەکانی رۆژی دوایی، گەورەبوونی مانگە، کەوا خەڵکی لەیەکەم شەودا مانگ بەگەورەیی دەبینن، لەیەکەم شەوی هەڵاتندا مانگ بەدووشەوی دەردەکەوێت.

لەئەبوهویرەوە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت((من اقتراب الساعة انتفاخ الأهلة وأن يرى الهلال لليلة فيقال لليلتين)) واتە: **((لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی گەورە بوونی مانگە لەکاتی هەڵاتنیدا، کە تەماشا دەکەیت وا دەزانی دووشەوەیە لەڕاستیدا یەکشەوەیە)** تەبرانی ریوایەتی کردووە

ئەم نیشانەیە هێشتا دەرنەکەوتووە خوای گەورەش زاناترە




قۆناغەکانی مانگ لەدەستپێکردنی تاکو کۆتایی مانگی عەرەبی

| Sun | Mon | Tue | Wed | Thu | Fri | Sat |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | 1 |
| 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 |
| 9 | 10 | 11 | 12 | 13 | 14 | 15 |
| 16 | 17 | 18 | 19 | 20 | 21 | 22 |
| 23 | 24 | 25 | 26 | 27 | 28 | 29 |
| 30 | | | | | | |

قۆناغەکانی سوڕانەوەی مانگ لەماوەی یەك مانگی ئینگلیزیدا



# ١٠٤

# زەمانێک دێت کەس
# نامێنێت ئیلا دەگات بەشام




شام ناوێکە ئەمڕۆ سوریای پێدەڵێن وە دەورو بەرەکەشی (لوبنان و ئوردون و فەلەستین)یش دەگرێتەوە، وڵاتی شام خاکی دابەزاندنی زۆربەی پەیامەکانە، وەشام خەڵکەکەیان بەتواناو لێهاتوون.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت **((إذا فسد أهل الشام فلا خير فيكم، لا تزال طائفة من أمتي منصورين لا يضرهم من خذلهم حتى تقوم الساعة ))** **واتە: ((ئەگەر خەڵکی شام فاسد وخراپ بوون ئەوا هیچ خێرێک بۆ ئێوەی تێدانیە هێشتا کۆمەڵێک لەئوممەتی من سەرکەوتوون وە هەرکەسێک وازیان لێبهێنێت زەرەریان پێ ناگەیەنن تاوەکو رۆژی دوایی))** ترمذی ریوایەتی کردووە

بۆیە پێغەمبەر ﷺ وەسیەتمان پێ دەکات بەهێمن و ئارام ڕاگرتنی وڵاتی شام، چونکە پێش هەڵسانی قیامەت وڵاتی شام دەبێتە دانیشتگاو خێوەتگایەک بۆ موسلمانان و حەوانەوەیان، وە لەئەبی دەرداء رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت **((إن فسطاط المسلمين يوم الملحمة بالغوطة، الى جانب مدينة يقال لها دمشق من خير مدائن الشام))** **واتە: ((بێگومان بنکەو بارەگەی موسلمانان لەرۆژی داستانە گەورەکە لە(غوطة) دەبێت کەلەتەنیشت شارێکە پێی دەڵێن دیمەشق کە چاکترین شارەکانی شامە))** ئەحمەدو ابودواد ریوایەتیان کردووە

الفسطاط لەبنەڕەتدا خێوەتگایە، وەمەبەست لێی جێگای موسلمانانە، و شوێنی کۆبوونەوەیانە لەرۆژی داستانەکە، واتە جەنگەگەورەکەی نێوان موسلمانان و دیانەکان.

(بالغوطه) ئەمڕۆ پێی دەڵێت (غوطەی دیمەشق)، وە شاری دیمەشقیش شارێکی بەناوبانگە، ئەمڕۆ پایتەختی سوریایە،

ئەو داستانەی باسکراوە لەحەدیسەکەدا دەکەوێتە پێش هاتنی مەهدی، یان لەزەمانی ئەودایە،




یـان لەزەمانێکـی تـرە، پێغەمبـەر دروودی خوای لەســەر بێت پێداگیری دەکات لەسەر ئـارام راگتنـی ولاتی شـام، چونکـە دەبێتە خاکـی کۆبوونـەوەو، هەروەهـا خێوەتـگای موسڵمانانە.

یەکێک لەهاوەڵەکانی ڕاوێژی بەپێغەمبەر ﷺ کـرد کەبچێتە چ وڵاتێک تێیدا نیشـتەجێ بێت، پێغەمبەر دروودی خوای لەسـەر بێت ئاماژەی بەوڵاتی شام کرد.

لەبهـز کـوڕی حکیـم وە لەباوکیـەوە ئەویش لەباپیریـەوە دەڵێـت: ((قلـت یا رسـول الله این تأمرنـي؟ قال: هـا هنا، ونحـا بيده نحو الشـام، وقبل قيام السـاعة، سـيهاجر أغلبية المؤمنين إليها، ولايبقى أحد منهم إلا لحق بالشـام))

**واتـە: ((وتـم ئـەی پێغەمبەری خـوا بۆ کوێ فەرمانـم پێدەکەیت؟ فەرمـووی (ئالێرەدا) بەدەستی ئیشارەتی دا بەوڵاتی شام))** ترمذی ڕیوایەتی کردووە.

وەپێش هەڵسانی قیامەتیش زۆربەی ئیمانداران کۆچ دەکەن بۆ شام و هیچ کەسێک نامێنێتەوە ئیللا دەگاتە شام.

لەعەبدولـلای کـوڕی عەمرو ڕەزای خوای لەسـەر بێت دەڵێت ((يأتـي زمان لايبقى فيه مؤمن إلا لحق بالشـام)) **واتە: ((زەمانێک دێت هیچ ئیمانداریک نامێنێتەوە ئیللا دەبێت بگاتە شام))** ابن ابی شیبە ڕیوایەتی کردووە.





هەندێك وێنەی جۆراو جۆر لە (غوطە)ی دیمەشق

# ١٠٥ ١٠٦

# داستانه گەورەکەی نێوان موسڵمانان و ڕۆمەکان ڕزگار کردنی قسطنطینیه (ئەستەمبۆل)

مێژووی موسڵمانان لەگەڵ ڕۆمەکان پڕیەتی لە ڕووداوو کارەسات، کەوا شەڕو ئاشتی تیایە، وە ڕێکەوتنامەو کوشتار موسڵمانەکانی ئەمڕۆ لەگەڵ ڕۆمەکان حاڵیان جێگیرو دامەزراو نیە، بەڵکو لەنێوان شەڕو ئاشتیدان، وە ئەمەش پێش دەرکەوتنی مەهدیە، کە پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت ناوی لێناوە داستانی گەورە، بەجۆرێک موسڵمانەکان تێیدا سەردەکەون، پاشان ڕوودەکەنە قوستەنتینیە بۆ ڕزگارکردنی و، ڕزگاری دەکەن، لەپاشاندا دەجال دەردەکەوێت.

لەمعازی کوڕی جەبەل ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرموویەتـی ((عمران بيت المقدس خراب يثرب ، وخراب يثرب خروج الملحمة ، وخروج الملحمة فتح قسطنطينية ، وفتح القسطنطينية خروج الدجال)) **واتە: ((ئاوەدانکردنەوەی بيت المقدس کاولبوونی یەسریبی بەدوادادێت، وەکاولبوونی یەسریب داستانەکەی بەدوادێت، وەهاتنی داسـتانەکە ڕزگار کردنی قوسـتەنیتنیەیەی بەدوادێت، وەڕزگارکردنی قوستەنتینیە دەرچوونی دەجالی بەدوادێت))** ابو داود و ترمذی ڕیوایەتیان کردووە.





وێنەیەك لە قوستەنتینیە (ئەستەمبۆل)






وێنەی پردێك کە هەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەورووپا بەیەك دەگەیەنێت کەوا بەستراوە بە هەردوولای شاری قوستەنتینیە

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((ستصالحون الروم صلحا آمنا ، فتغزون أنتم وهم عدوا من ورائكم ، فتنصرون ، وتغنمون ، وتسلمون ، ثم ترجعون حتى تنزلوا بمرج ذي تلول ، فيرفع رجل من أهل النصرانية الصليب ، فيقول : غلب الصليب ، فيغضب رجل من المسلمين ، فيدقه ، فعند ذلك تغدر الروم ، وتجمع للملحمة وزاد بعضهم : « ويثور المسلمون إلى أسلحتهم ، فيقتتلون، فيكرم الله تلك العصابة بالشهادة )) **واتە:** **((ئێوە پەیماننامەیەکی ئاشتی لەگەڵ ڕۆمدا مۆر دەکەن، جا ئێوە دەجەنگن و ئەوان دوژمنتانن لەپشتەوەتانن، وە ئێوە سەردەکەون و دەستکەوتنتان دەست دەکەوێت، و خەڵکی دەکەنە موسڵمان، پاشان دەگەڕێنەوە تاکو لەجێگایەکدا گاور خاچەکەی بەرزدەکاتەوەو دەڵێت، خاچ سەرکەوت، بۆیە پیاوێک لەموسڵمانان تووڕە دەبێت، لەملی دەدات، لەو کاتەدا ڕۆمەکان غەدرتان لێ دەکەن و خۆیان کۆدەکەنەوە بۆ داستانێک))** ابو داود ڕیوایەتی کردووە.

## لەسەحیحی موسلیم دا بەدرێژی باسی ئەو ڕووداوە دەکات:

لەئەبی هوریرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت ((لا تقوم الساعة حتى ينزل الروم بالأعماق أو بدابق (وهذا موضع قرب حلب في بلاد الشام، فيكون هناك موضع الملحمة) ، فيخرج إليهم جيش من المدينة من المسلمين من خيار أهل الأرض يومئذ ، فإذا تصافوا امام بعض، قالت الروم : خلوا بيننا وبين الذين سبوا منا نقاتلهم (وهذا يدل انه وقعت حروب سابقة بين المسلمين والروم، وانتصر المسلمون، وسبوا من الروم، وأسلم السبي وجاء يجاهد)، فيقول المسلمون : لا والله لا نخلي بينكم وبين إخواننا فتقاتلونهم ، فينهزم ثلث (أي من جيش المسلمين) لا يتوب الله عليهم أبدا ، ويقتل ثلث (أي: من المسلمين) أفضل الشهداء عند الله عز وجل ، ويفتتح الثلث (يعني الثلث الأخير يفتح البلاد ويغنم) لا يفتنون أبدا ، فيفتتحون قسطنطينية ، فبينما هم يقتسمون الغنائم قد علقوا سيوفهم بالزيتون إذ صاح فيهم الشيطان : إن المسيح (أي الدجال) قد خلفكم في أهليكم (أي يريد إفزاعهم وتخويفهم)، فيخرجون (أي يتوجهون الى الدجال) ، وذلك باطل (أي يكون كلام الشيطان هذا باطلا) , فإذا جاءوا الشام خرج (أي المسيح الدجال))) **واتە:** **((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو ڕۆمەکان لە (الاعماق)، یان (دابق) دادەبەزن (ئەمە شوێنێکە نزیک حەلەب لەووڵاتی شام، ئەم شوێنەش شوێنی داستانەکەیە) جا سوپایەک لە موسڵمانەکان لەمەدینەوە بۆیان دەردەچێت کەلەچاکترینی خەڵکی سەر زەوین لەو کاتەدا کاتێک بەرامبەر ڕۆمەکان وەستان، ڕۆمەکان دەڵێن، ڕێگەمان بۆ چۆڵکەن با ئەو کەسانەی دستدرێژیان کردۆتە سەرمان و ئێوە داڵدەتان داون لەگەڵیاندا بجەنگین (ئەمەش بەڵگەیە**

کەوا پێشتر شەڕو کوشتار لەنێوان موسـلمانەکان و ڕۆمەکان ڕوویداوە، وەموسڵمانەکان سـەردەکەون و، لەڕۆمەکانیـش بەدیل دەگرن) موسـلمانەکان دەڵێن: نەخێر سـوێند بەخوا ڕێگەتان بۆ چۆڵ ناکەین دەسـتدرێژی بکەنە سەر براکانمان، جا شەڕیان لەگەڵدا دەکەن، جا سێ یەکیان رادەکەن (واتە لەسوپای موسلمانان) خوای گەورە هەرگیز تەوبەیان لێ قەبووڵ ناکات، وەسـێ یەکەکـەی تر دەکوژرێن (واتە: لەموسـڵمانەکان) ئەوانە چاکترین شـەهیدن لەلای خودا، وە سێ یەکەکەی تر سەر دەکەوێت (مانای سێیەکی کۆتایی وڵات رزگار دەکەن و دەسـتەکەوتیان بەدەست دەکەوێت) هەرگیز تووشی فیتنە نابنەوە، جا قوستەنتینیە رزگار دەکـەن، لەکاتێکدا خەریکـی دابەش کردنی دەسـتکەوتەکانی جەنگن شمشـێرەکانیان بەدار زەیتوونەوە هەلواسـیووە کەشـەیتان لەنێوانیاندا هاواردەکات کەوا مەسـیح (واتە دەجال) لە دواوەتانە لەنێو کەسـوکارتاندا (واتە دەیەوێت رایانچلەکێنێ و بیانترسێنێت) جادەردەچن (واتە ڕوودەکەنە دەجال) کە ئەم هەواڵەش درۆیە (واتە قسـەی شـەیتان هەردەم درۆیە) جا کاتێ گەیشتنە شام دەردەچێت (واتە: مەسیحی دەجال)

لەڕیوایەتێکی دیکەدا (( فبينما هم يعدون لقتال الدجال بعد ان قاتلوا الروم، وما استطاعوا ان يقتسـموا الغنائم ويسـوون الصفوف اذا اقيمـت الصلاة فينزل عيسـى بن مريم..))

**واتە:** ((جاکاتێ لەجەنگ دەگەڕێنەوە ڕیزیان بەسـتووە بـۆ نوێژ و قامەت کراوە، لەوکاتەدا یەکسەر عیسای کوڕی مەریەم لەئاسمان دادەبەزێت )) موسلیم ڕیوایەتی کردووە.

## درێژەی داستانەکە لەڕیوایەتێکی تردا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( إن السـاعة لا تقوم حتى لا يقسـم ميراث ولا يفرح بغنيمة , وقال : عدو يجمعون لأهل الإسلام ويجمع لهم أهل الإسلام , ونحى بيده نحو الشام ; قلت : الروم تعني ؟ قال : نعم , فيكون عند ذاكم القتال ردة شديدة , فيشترط المسلمون شرطة للموت لا ترجـع إلا غالبـة , فيقتتلون حتى يحجز بينهم الليل , فيفيء هؤلاء وهؤلاء كل غير غالب , وتفنى الشـرطة ثم يشترط المسلمون شرطة للموت لا ترجع إلا غالبة , فيقتتلون حتى يمسوا فيفيء هؤلاء وهؤلاء كل غير غالب ; وتفنى الشرطة، فإذا كان اليوم الرابع نهد إليهم بقية أهل الإسلام، فيجعل الله الدبرة عليهم فيقتلون مقتلة، إما قال : لا يرى مثله، أو قال: لم يـرى مثلها حتى إن الطير ليمر بجنباتهم فما يخلفهـم حتى يخر ميتا فيتعاد بنو الأب كانوا مائة فلا يجدونه بقي منهم إلا الرجل الواحد , فبأي غنيمة يفرح , أو بأي ميراث يقاسـم؟! فبينما هم كذلك إذ سمعوا ببأس هو أكبر من ذلك إذ جاءهم الصريخ أن الدجال قد خلفكم في ذراريهم , فيرفضوان ما في أيديهم ويقبلون فيبعثون عشرة فوارس طليعة , فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : إني لأعرف أسماءهم وأسماء آبائهم وألوان خيولهم هم خير فوارس على ظهـر الأرض , أو قـال : هم من خير فوارس على ظهر الأرض يؤمئذ)) **واتە:** (( قیامەت

ڕووناداتت تاکو ئەو سەردەمەی میراتی تیادا دابەش ناکرێت وەبەدەستەکەوت دڵخۆش نابن، (ئەمجار بەدەستەکانی ئیشارەتی بۆ شام کردو فەرمووی: دوژمنێک کۆ دەبنەوە بۆ ئەهلی ئیسلام وە ئەهلی ئیسلامیش بۆیان کۆدەبنەوە (ئیبن مەسعود ووتی: مەبەستت ڕۆمەکانە؟ فەرمووی بەڵێ، لەو جەنگەدا هەڵگەڕانەوەیەکی توند ڕوودەدات، کۆمەڵێکیان پەیمانی مردن دەدەن کەتاسەرنەکەون نەگەڕێنەوە، ئەمجار کوشتار دەست پێدەکات تاوەکو شەو لێکیان جودا دەکاتەوە، ئەمانیش و ئەوانیش دەگەڕێنەوە، لەم




ڕۆژەدا سەرکەوتن بۆ هیچ لایەکیان دەستەبەر نابێت، ئەوانەی پەیمانی مردنیان دابوو هەموو لەناو دەچن، ڕۆژی دووەم موسڵمانەکان کۆمەڵێکیان پەیمانی مردن دەدەنەوە کەتاسەرنەکەون نەگەڕێنەوە، دیسان شەڕ دەست پێ دەکاتەوە تاشەو لێکیان جیا دەکاتەوەو هەردوولا کۆمەڵێکیان پەیمانی مردن دەدەنەوە کەتاسەرنەکەون نەگەڕێنەوە، تاشەو لێکیان جیادەکاتەوەو هەردوولا دەکشێنەوە و هیچیان سەرکەوتن بەدەست ناهێنن، وە ئەم کۆمەڵە فیداکارانەش لەناو دەچن، پاشان کەڕۆژی چوارەم هات ئەوەی کەماوە لەموسڵمان هەڵمەتیان بۆ دەبەن وەکوشتارێکی گەورە ڕوودەدات خوای گەورە مردن و بنەبڕکردن لەسەر ڕۆمەکان دادەنێت (یان ووتی: هەرگیز نابینرێت - یان ووتی هەرگیز نەبینراوە) تاوەکو باڵندە بەتەنیشتیانەوە تێپەڕێت بەجێیان ناهێڵێت و بەمردوویی دەکەوێتە خوارەوە، ئینجا نەوەی باوکێک سەد کەس بوون، سەیر دەکات کەسیان نەماوە تەنها یەک پیاو نەبێت، ئیتر بە چ دەستەکەوتێک دڵخۆش دەبێت؟ یان چ میراتێک دابەش بکرێت؟ لەکاتێکدا کە ئەوان دەستکەوت دابەش دەکەن لەناو خۆیاندا کێشەیەکی تر دەبیستن کە ئەوە لەو گەورە ترە، بانگەوازکارێک دێت و بانگ دەکات و دەڵێت مەسیحی دەجال لەدواوە چووەتە سەرکەس و کارو خێزانتان، وە ئەو دەستکەوتانەی لەدەستیان بوو فڕێی دەدەن و دەردەچن، موسڵمانان لەپێش خۆیاندا (دە) سوار دەنێرن، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((من دەزانم ناوی خۆشیان و باوکەکانیشیان چیە، وەرەنگی وولاخەکانیشیان دەزانم، ئەو (دە)

**سـواره باشترین وچاکترین سواری سـەر زەوین لەو کاتەدا))** ئەحمەد و موسلیم ریوایەتی کردووه

ئەو کۆمەڵە سـوپایەی ئیسـلام بۆ ئەو داسـتانە گەورەیە لەو کاتەدا لەشـاری دیمەشقە لە (الغوطة) وە ئەوانە باشترین وچاکترین سوپایە لەسەر ڕووی زەوی ئەو کاتە خودای گەورە سەریان دەخات بەسەر ڕۆمەکاندا.

لەئەبـی درداء رەزای خـوای لەسـەر بێت کـەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێـت **((يوم الملحمة الكبرى فسطاط المسلمين بأرض يقال لها الغوطة الى جانب مدينة يقال لها دمشق من خير مدائن الشـام)) واتە: ((کۆمەڵەو خێوەتگای موسـلمانان لەڕۆژی داسـتانەکە لە (الغوطة)یە لەتەنیشت شارێک پێی دەڵێن دیمەشق - لەباشتین شارەکانی وڵاتی شامە)).**

لەریوایەتێکی دیکەدا دەڵێت گوێم لە پێغەمبەر بوو دروودی خوای لەسـەر بێت دەیفەرموو **((يوم الملحمة الكبرى فسطاط المسلمين بأرض يقال لها الغوطة فيها مدينة يقال لها دمشق خـير منازل المسـلمين يومئذ)) واتـە: ((ڕۆژی داسـتانە گەورەکە خێوەتگای موسـلمانان لەخاکێکە پێی دەڵێن (غوطة) کەوا شـارێکی لێیە پێی دەڵێن دیمەشـق باشـترین دانیشـتگەی موسلمانانە لەو ڕۆژەدا))** ئەحمەد ابو داوود و حاکم ریوایەتیان کردووه .

وە ڕزگارکردنی قسطنطینە بەدەستی موسلمانەکان بەبێ شەڕ کردن دەبێت، وە چەکەکانیان لەو ڕۆژەدا تەکبیر وتەهلیلەیە بەسەر پەرشتی مەهدی.

وە لەحەدیسێکدا لەئەبوهوریرەوە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت **((سمعتم بمدينة جانب منها في البر وجانب منها في البحر ؟ قالوا : نعم ، يا رسـول الله قال: لا تقوم السـاعة حتى يغزوها سـبعون ألفا من بني إسـحاق ، فإذا جاءوها نزلوا ، فلم يقاتلوا بسلاح ولم يرموا بسهم ، قالوا : لا إله إلا الله والله أكبر ، فيسقط أحد جانبيها - قال ثور : لا أعلمه إلا قال - الذي في البحر ، ثم يقولوا الثانية : لا إله إلا الله والله أكبر ، فيسقط جانبها الآخر ، ثم يقولوا الثالثة : لا إله إلا الله والله أكبر ، فيفرج لهم ، فيدخلوها فيغنموا ، فبينما هم يقتسمون المغانم ، إذ جاءهم الصريخ ، فقال : إن الدجال قد خرج ، فيتركون كل شيء ويرجعون )) واتە: ((ئایا گوێتان لەشـارێک بووە، لایەکی لەدەریادایە و وەلایەکی تری لە ووشـکانیدایە؟ ووتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی ((قیامەت هەڵناسـتێت تاوەکو حەفتاهەزار کەس لەنەوەی ئیسـحاق ئەو شارە داگیر نەکەن (مەبەست شاری قوسطنطینەیە ئەستەمبۆلی ئێستا) کاتێک موسڵمانەکان دێنە شارەکەو دادەبەزن، بەڵام بەچەک شەڕناکەن، وەهیـچ تیرێکیـش ناهاوێژن، بەڵکو دەڵێن لا الە الە اللـە، واللە اکبر ئەو کاتە یەکێک لەلایەکی شارەکە دەکەوێتە ژێر دەستی موسلمانەکان، سەور بن زەید دەڵێن: من نازانم تەنها پێغەمبەر دروودی خوای لەسـەر بێـت فەرمووی: ئەوەی لای دەریایەکە، پاشـان دووەم جار دەڵێن: لا الـە الا اللـە، واللە اکبر، وە لایەکەی تریش دەکەوێتە ژێر دەسـتی موسـڵمانەکان پاشـان**

**جاری سێیەم دەڵێن : لااله الا الله، و الله اکبر لەوکاتە ڕێگاو دەرگایان بۆ دەکرێتەوە، دەچنە ناوشــارەکەوەو سەردەکەون و غەنیمەتیان دەست دەکەوێت، لەکاتێکدا ئەوان غەنیمە دابەش دەکەن لەناو خۆیاندا، شــەیتان هاوار دەکات و دەڵێت، دەجاڵەکە دەرکەوت، ئەوانیش هەموو شتێک جێ دەهێڵن و دەگەڕێنەوە))** موسلیم ریوایەتی کردووە.



# ١٠٧ ١٠٨

# کاتێک میرات دابەش ناکرێت
# کاتێک خەڵک دڵخۆش نابێت بەغەنیمەت

ئەو دوو نیشـــانانە لەکۆتایی ســـەردەم ڕوودەدات لەکاتێکدا شـــەڕو کوشتار زۆر دەبێت و، جەنگەکان لەگەڵ ڕۆمەکان توونە دەبێت و پەرە دەستێنێ.

لەعەبدولـــلای کـــوڕی مەســـعود ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبـــەر ﷺ دەفەرموێت (( أن الساعة لاتقوم حتى لايقســـم ميراث ولايفرح بغنيمة)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو وای لێ دێت میرات دابەش ناکرێت، وەکەس دڵخۆش نابێت بە غەنیمەو دەســـکەوت، پاشـــان پێغەمبەر بەدەستی ئیشارەتی کرد بەرەو شام))**

ئەمەیان لەنیشانەکانی پێشووتردا روون کراوەتەوە



# ١٠٩

# گەڕانەوەی خەڵک بۆ چەک و سوار بووە کۆنەکان



ئەم نیشانەیە پێشتر باسکراوە، کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((, فبينما هم كذلك إذ سمعوا ببأس هو أكبر من ذلك إذ جاءهم الصريخ أن الدجال قد خلف في ذراريهم , فرفضوا ما في أيديهم ويقبلون فيبعثون عشرة فوارس طليعة , فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : إني لأعرف أسماءهم وأسماء آبائهم وألوان خيولهم هم خير فوارس على ظهر الأرض , أو قال : هم من خير فوارس على ظهر الأرض يؤمئذ )) **واتە:** **((لەکاتێکدا کە ئەوان دەستکەوت دابەش دەکەن لەناوخۆیاندا کێشەیەکی تر دەبیستن کە ئەوە زۆر لەوی گەورەترە، جا بانگەوازکارێک دێت و هاوار دەکات: مەسیحی دەجال لە دواوە چووەتە سەر کەس و کارو ماڵ و منداڵتان، وە ئەو دەستکەوتانەی لەدەستیان بوو فڕێی دەدەن، وە دەردەچن موسلمانان لەپێش خۆیاندا (دە) سوار دەنێرن، من دەزانم ناوی خۆیان و باوکیشیان چیە، وەڕەنگی ئەسپەکانیشیان دەزانم، ئەو (دە) سوارە باشترین و چاکترین سواری سەر زەوین لەو کاتەدا))** موسلیم ریوایەتی کردووە.



# ١١٠ ١١١

# ئاوەدانکردنەوەی بیت المقدس وە کاول بوونی مەدینە و چۆڵبوونی لەدانیشتووان و گەشتیاران

لەمعازی کوڕی جەبەل ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت (( عمران بيت المقدس خراب يثرب ، وخراب يثرب خروج الملحمة ، وخروج الملحمة فتح قسطنطينية ، وفتح القسطنطينية خروج الدجال))
**واتە: ((ئاوەندانکردنەوەی بیت المقدس کاولبوونی یەسریبی لەدوادێت، وە کاولبوونی یەسریب، دەرکەوتنی داستانەکەی بەدواداد‌ێت، دەرکەوتنی داستانەکەش، رزگارکردنی قوسطنطینەیەی بەدواداد‌ێت، وەرزگار کردنی قوسطنطینیەش دەرکەوتنی دەجالی بەدواداد‌ێت))**
**پاشان معازی کوڕی جبل بەدەستی لەڕانی ئەو کەسەی دا کە قسەی بۆ دەکرد-یان لەشانیدا- پاشان ووتی: ئەمە ڕاستە کەچی تۆ ئالێرەدا دانیشتووی ))** دادود ڕیوایەتی کردووە.
مانای کاول بوونی یەسریب مەبەست مەدینەی پێغەمبەرە ﷺ کەچۆل دەبێت لەدانیشتوان و گەشتیاران.
وە لەریوایەتێکی دیکەهاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((الملحمة الكبرى وفتح القسطنطينة وخروج الدجال، في سبعة أشهر )) **واتە: ((داستانەگەورەکە، وە رزگارکردنی قسطنطینییە، وە دەرکەوتنی دەجال، لەحەوت مانگدا دەبێت))** ترمذی ڕیوایەتی کرووە لەسەنەدێکی لاواز


قودس


مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ

ئەو ڕووداوانەی کەوا پێغەمبەر ﷺ باسیکردووە لەو حەدیسەدا، بەپلەیەک بەدوای یەکدادێت وە ئاوەدانکردنەوەی بیت المقدس بەمانای ئاوەدانکردنەوەی قودسـی پیرۆزو فروانکردنی و زۆر بوونی باڵەخانەکانی وە خەڵکێکی زۆر ڕووی تێدەکەن پاشان کاول بوونی یەسریب واتە مەدینـەی پێغەمبەری ﷺ بەدوادێـت و ئارەزووکردنی خەڵک تێیـدا نامێنێت و فراوانبوونی لەباڵەخانەکان دەوەستێت، ئەمەش واقیعی ئەمڕۆیە لەمەدینەی پێغەمبەر ﷺ کەوا خەڵک تێیدا کەمدەکات و زیاد ناکات و زۆربەیان بۆ شوێنی دیکە دەگوازنەوە.

لەحەدیسـیکدا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێـت (( لتتركن المدينة على أحسـن ما كانت، حتى يدخـل الكلـب أو ذئب فيغـذي -أي يبول- على بعض سـواري المسـجد ، أو على المنبر، **فقالوا :** يا رسـول الله ، فلمن تكون الثمار ذلك الزمان ؟ **قال :** للعوافي : الطير والسـباع))

**واتە: ((شـاری مەدینە بەجێ دەهێڵن لەسـەر چاکترین ڕەوشی تاکو سەگ یان گورگ دێنە ناوی و لەلای هەندێک لەستوونەکانی مزگەوت یان لەسەر مینبەرەکەی میز دەکەن)) ووتیان ئـەی پێغەمبەری خوا بەرو بومی ئەو زەمانە بـۆ کێیە؟ فەرمووی (( بۆ باڵندەو دڕندەکانە))**

مالیک ریوایەتی کردووە.

لەوانە بەئاوەدانکردنەوەی بیت المقدس دابەزینی خەلافەت تێیدا لەکۆتایی سەردەم بێت.

لەحەدیسـە کـە دەفەرموێت ((وخـراب يثرب خروج الملحمة )) **واتـە: (( وەکاول بوونی یەسریب داستانەگەورەکەی بەدوادێت))**

داسـتانە کە شەڕێکی گەورەیە لەنێوان موسلمانەکان و ڕۆمە مەسیحیەکان کەوا کوشتاری تێـدا زۆر دەبێـت، بۆیە ناونراوە بەداسـتان لەبەر گەورەیی کوشـتن تێیدا، پاش داسـتانەکە رزگارکردنی قوسـطنطینیەیە، ئەویش ئەستەمبۆڵی ئێستایە، ئەستەمبۆل یەکێکە لەگەورەترین شارەکانی تورکیای ئەمڕۆ، پاش ئەو دەرچوونی دەجالی بەدوادا دێت.



# ١١٢

# مەدینە پیاوە خراپەکانی لادەبات وەک چۆن ئاسنی دەستی ئاسنگەر پیسی لادەبات

ئـەو نیشـانەیە لەنیشـانەکانی رۆژی دواییە تـەواو کاری هەواڵەکانـی رووداوەکانی پێش خۆیەتی لەکاولبوونی مەدینە و چۆڵ کردنی دانیشتووەکەی.

وە مەدینـەش ئاوەدان بووەتەوەو گەشـەی سـەندووە، پاش ئـەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ ئەوێ، سـاڵ تێپەڕین و خەڵکیش لەنیشـتەجێ بوو تیایدا زیادی کرد، ئاوەدان کردن بوونـەوە دەسـتی پێکرد، لەنیشـانەکانی رۆژی دوایی پێغەمبـەر ﷺ هەواڵی داوە کە خەڵک ئارەزووی نیشتەجێ بوون دەکەن لەمەدینە.



مدینەی منەوەرە

لەئەبوهورەیـرەوە ڕەزای خـوای لەسـەر بێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسـەر بێت فەرموویەتـی ((يأتـي على الناس زمان يدعو الرجل ابن عمـه وقريبه : هلم إلى الرخاء ، هلم إلى الرخاء ، والمدينة خير لهم لو كانوا يعلمون ، والذي نفسـي بيده ، لا يخرج منهم أحد رغبة عنها إلا أخلف الله فيها خيرا منه ، ألا إن المدينة كالكير ، تخرج الخبيث ، لا تقوم الساعة حتى تنفي المدينة شرارها ، كما ينفي الكير خبث الحديد )) **واتە: ((زەمانێک بەسەر خەڵک دادێت کەوا پیاو بانگی کوڕەمامی و نزیکی خۆی دەکات وەرن بۆ خۆش گوزەرانی وەرن بۆ خۆشـگوزەرانی، بەڵام مەدینە زۆر بۆخۆیان چاکترە ئەگەر بزانن، سـوێند بەوەی گیانی منی بەدەسـتە هیچ کەسـێ نیەکەوا بەئارەزووی خۆی لێی دەرچێت ئیلا خوای گەورە لەو چاکتر دەکات، بەجێنشـین تیایدا، ئاگاداربن کەوا مەدینە وەک ئاسـنی دەسـتی ئاسنگەر وایە پیسی لەخـۆی دەردەکات، وە قیامەت دانایەت تاکو شـاری مەدینە پیـاو خراپی لەخۆی دەردەکات هەروەک کەئاسنی گەرم پیسی ئاسن لادەبات))** موسلیم ڕیوایەتی کردووە.

ڕیوایـەت کـراوە لەعومەری کـوڕی عەبدول عەزیـز ڕەحمەتی خوای لەسـەر بێت کاتێک لەمەدینە دەرچوو بە مزاحمی هاوڕێی گەیشت و پێی گوت: ئەی مزاحم ناترسیت لەوەی ئێمە ئەو کەسەبین کەمەدینە دەری کردبین؟

ئەمە ئەوە ناگەیەنێت هەرکەسـێک لەمەدینە نیشـتەجێ بێت و و پاشـان بڕوا و لێی جودا بێتـەوە، ئەوا ئەو کەسـە لەپیاو خراپەکان و پیسـەکانیەتی، نەخێر بەڵکو زۆر کەسـی چاک و ئیمانـدار لەمەدینـە کۆچیان کردووە، وە ڕوویان کردۆتە شـوێنی تر بـۆ جیهادو بانگەواز کردن.

لەئەبـو هورەیـرەوە ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێت ((يتركون المدينة علـى خير ما كانت لايغشـاها إلا العوافي )) **واتە: ((مەدینە بەجێ دەهێڵن لەسـەر چاکترینی ڕەوش و بارودۆخ، کەسێک ناچێتە ناوی تەنها باڵندەکان نەبێت))** متفق عليه

**ماناکەی:** خەڵک شـاری مەدینە بەجێ دەهێڵن و لێی دەردەچن لەگەڵ چۆنیەتی ژیان تیایدا، وەبەرووبومەکەی باشە، ژیانیشی خۆشە، بەڵام دەکەوێتە ناو فیتنە و تووندو تیژی ئەمەش دەبێتە هۆی کەوا خەڵک لێی جیاببنەوە، وە بیگوازنەوە بۆ شـوێنێکی دیکە، تاوەکو وای لێی دێت کەسی تێ نامێنێت، تەنانەت وای لێدێت ماڵەکان و ڕێگاکان و مزگەوتەکان چۆڵ دەبێت، وە باڵنـدەو دڕنـدەکان تێیدا دەسـووڕێنەوەو مبـزی تێدادەکەن، بێ ئەوەی کەسـێک هەبێت قەدەغەی بکات لەبەر ئەوەی کەسی تێدانیە.

(العوافى) باڵندەو دڕندەکانە

# ١١٣
# نەمانی چیاکان لەشوێنی خۆیان

خودای گەورە چیاکانی جێگیر کردووە کە ئەویش شاخ و داخی سەرزەوین، پێغەمبەریش ﷺ هەواڵی داوە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی چیاکان لەشوێنی خۆیان نامێنن، یان ئەمە نەمانێکی ڕاستەقینەیە بەڕووچوونی زەوی یان بەهەورەتریشقەکان، یان بەکردەوەی خەڵک نامێنن، لەبەر زۆر بوونی بینایە، وە یەکسان کردنی چیاکان، ئەمەش ڕوویداوە لەچەند وڵاتێک.
یان بەهۆی دارمانی چیاکانە، یاخود بەهۆی داروخانی بەردە گەورەکانە لەسەر شاخەکان کە ئەمەش بەدرێژایی کات دەبینرێت.



وێنەیەك لەوێنەکان یەکسانکردنی چیاکان لەگەڵ زەوی بەدەستی ئادەمیزاد





چەند نموونەیەك لەسەر دارمانی چیاکان بەشێوەیەکی سروشتی

# ١١٤

# دەرچوونی پیاوێک لەقەحطان خەڵکی گوێڕایەڵی دەبێت

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی لەکۆتایی زەماندا پیاوێک دەردەچێت لەقەحطان کەوا هۆزێکی عەرەبی بەناوبانگە خەڵکی گوێڕایەڵی بۆ دەکات و لەدەوریدا کۆدەبنەوە ئەمەش لەکاتی گۆڕانی زەماندا.

لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لا تقوم الساعة حتى يخرج رجل من قحطان يسوق الناس بعصاه))

**واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو پیاوێک لەقەحطان دەردەچێت خەڵکی بەگۆچانەکەی مل کەچ دەکات))** متفق عليه




دابەشکردنی هۆزەکانی دوورگەی عەرەب لەئێستادا

وە ئەمەش لە (سوق الناس بعصاه) ئەوە دەگەیەنێت کەخەڵکی لەسەردەمی ئەو دا ڕێک و ڕاست دەبن و خەڵکی مەلکەچ دەبن بۆی وە لەگەڵیدا ڕێک دەکەون، مەبەستیش لەبەکار هێنانی گۆچان نیە، بەڵکو ئەمە نموونەیەکە لەسەر گوێڕایەڵی خەڵک و دەسەڵات بەسەر خەڵکەکەیە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەدەسەڵاتێکی ترسناک و توندو تیژی هەیە.

ئاوا دەرکەوتووە کە ئەم پیاوە پیاوێکی چاکە کارە، وەک ئەوەی لەئیبن و عەباس رەزای خوای لێبێت ریوایەتکراوە کەوا دەربارەی ووتوویەتی ((پیاوێکیش لەقەحطان دەسەڵات دەگرێتە دەست کە هەموویان پیاو چاکن)) ابو نعيم ریوایەتی کردووە.

لەبەر ئەوەی دەچێتەوە سەر قەحطان، واتە لەئازادەکانە، ئەم پیاوەش ئەم پیاوەنیە کەوا دەردەکەوێت بەناوی (جەهجەهـ)، چونکە جەهجەهـ لەبەندەکانە لە ئازادەکان نیە.

## ١١٥

# دەرکەوتنی پیاوێک پێی دەڵێن جەهجاه

لەکۆتایی زەمانـدا هەندێک پیاو دەردەکەون و کەلەنێوخەڵکیدا دەسەڵات پەیدادەکەن و توونـدو تیژو پەلامار دەرن، پێغەمبەر ﷺ باسـیکردووە هەندێکیـان بەناوی خۆیانەوە یان بەوەسف و خەسڵەتیان وە لەوانە پیاوێک پێی دەڵێن جەهجاه.

لەئەبوهورەیـرەوە رەزای خـوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((لا تذهبُ الليالي والأيام حتى يملك رجل من الموالي، يقال له الجهجاه وفي نسخة: الجهجل قال الحافظ في الفتح وأصل الجهجاه الصياح )) **واتە: ((شـەوان و رۆژان کۆتاییـان نایەت تاوەکو پیاوێک لەبەندەکان دەسەڵات دەگرێت، پێی دەوترێت جەهجاه))** موسلیم ریوایەتی کردوە وە لەنوسخەیەکی تر بە (الجهل) ناوی هاتووە.

وە الحافظ له الفتح دا دەڵێت : ئەسڵی جەهجاهـ بەمانای کەسێکی دەنگ گڕە زۆر هاواربکات.

## ١١٦ ١١٧ ١١٨ ١١٩

# قسەکردنی دڕندەو بێ گیانەکان
# قسەکردنی جێ دەستی قامچی مرۆڤ - قسەکردنی قەیتانی پێڵاو - هەواڵ پێدانی ڕانی مرۆڤ بەهەواڵی کەس و کاری

پێغەمبـەر ﷺ هەواڵی داوە کەلەنیشـانەکانی رۆژی دوایی دڕنـدەو گیانلەبەرە کێوییەکان قسە دەکەن، و جێ دەستی قامچی مرۆڤ و قەیتانی پێڵاوو ڕانی مرۆڤ دێنە قسە کردن.!!

لەئەبـو سـەعیدی خودری رەزای خـوای لێبێت کەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموویت ((والذي نفسي بيده لا تقوم الساعة حتى تكلم السباع الإنس , وتكلم الرجل علاقة سوطه , وشراك نعله , ويخبره بما أحدث أهله بعده)) **واتە: ((سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە قیامەت هەڵناسـتێت، تاوەکـو دڕندە قسـەدەکات لەگـەڵ مرۆڤدا، و هەتاکو جێ دەسـتی قامچیەکەی قسـەدەکات لەگەڵ خاوەنەکـەی، وە قەیتانی پێڵاوەکەی قسـەدەکات، لەگەڵ مرۆڤ، و ڕانی مرۆڤ هەواڵی پێدەدات بەکەس و کارەکەی لە دوای خۆی چی بەسـەریان هاتووە))** ترمزی ریوایەتی کردووە.

(حتی تکلم السباع ) واتە گیانلەبەری دڕندە وەک شێرو گورگ و وورچ وەهەموو گیانلەبەرێکی دڕندەو کێوی.
(الانس) هەموو ئادەمیزادێک ئەگەر هاتوو موسڵمان بێت یان کافربێت.
(عذبة سوطه) واتە جێ دەستی قامچی مرۆڤ، (الوسط) ئەو پێستەیە کەلێی دروست دەکرێت.
(شراك نعله) یەکێک لەقەیتانەکانی نەعل کەوا پێڵاوەکەی پێ دەبەسترێت.
هەردوو نیشانەکانی – جێ دەستی قامچی مرۆڤ و ڕانی مرۆڤ هەواڵی کەس و کارەکەی دەدات لە دوای خۆی – ئەم دوو نیشانانە هێشتا ڕوویان نەداوەو، خودای گەورەش زاناترە بەڵام دەبێ ڕووبدات مادام پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێمان داوە لەلایەن خودای خۆی عزوجل.
وە هەندێک لەتوێژەرو لێکۆلەرەوەکان ئەوەیان باسکردووە کەمەبەست لەقسەکردنی جێ دەستی قامچی مرۆڤ و قەیتانی نەعل وە ڕانی مرۆڤ ئەو داهێنانەیە لەوسەردەمەی ئێمەدا لەهۆکارەکانی گەیاندنی نوێ، لەتەلەفۆن و گواستراوەکان، وەنامە دەنگدەرەکان، وە گواستنەوەی لێدانی دەنگەکان و نزمکردنەوەیان.
دەڵێن ئەمە لەسەر دەرکەوتنەو، ئەمە نیشانەی لەسەر دەرکەوتنیان کەوا لەقامچی و قەیتانی نەعل و ڕانی مرۆڤ قسەدەکەن،قسەکردنێکی ڕاستەقینەیە.
وەخوای گەورەش زاناترە

## بەڵام لەبارەی قسەکردنی دڕندەکان لەسەردەمی پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت ڕوویداوە

لەئەبوو سەعیدی خودری ڕازی خوای لێبێت((بينا أعرابي في بعض نواحي المدينة في غنم له عدا عليه الذئب ، فأخذ شاة من غنمه ، فأدركه الأعرابي ، فاستنقذها منه وهجهجه، فعانده الذئب يمشي ، ثم أقعى مستذفرا بذنبه يخاطبه ، **فقال** : أخذت رزقا رزقنيه الله ، **قال**: واعجبا من ذئب مقع مستذفر بذنبه ، يخاطبني فقال : والله إنك لتترك أعجب من ذلك ، **قال** : وما أعجب من ذلك ؟ **فقال** : رسول الله ﷺ في النخلتين بين الحرتين يحدث الناس



عن نبإ ما قد سبق ، وما يكون بعد ذلك، قال: فنعق الأعرابي بغنمه حتى ألجأها إلى بعض المدينة، ثم مشى إلى النبي ﷺ حتى ضرب عليه بابه، فلما صلى النبي ﷺ قال : أين الأعرابي صاحب الغنم ؟ فقام الأعرابي ، فقال له النبي ﷺ حدث الناس بما سمعت وما رأيت، فحدث الأعرابي الناس بما رأى من الذئب وسمع منه ، فقال: النبي ﷺ عند ذلك : صدق ، آيات تكون قبل الساعة ، والذي نفسي بيده ، لا تقوم الساعة حتى يخرج أحدكم من أهله ، فتخبره نعله أو سوطه أو عصاه بما أحدث أهله بعده ))

**واتە:** ((دەشتەكیەک لەدەووروبەری مەدینە لەناو ڕانە مەڕەکەی دابوو، گورگێک هاتە لای مەڕەکان و مەڕێکی لێبرد، کاتێک شوانەکە پێیزانی بەدوای کەوت تاوەکو مەڕەکە لەدەست گورگەکە ڕزگاربکات، جا گورگەکە سەرکەوتە سەر گردێک و وەرکەوت، دەستی کرد بەقسەکردن لەگەڵ شوانەکە: گورگەکە ووتی رزقێکم برد کەخوای گەورە دابووی پێم! شوانەکە ووتی: وای لەم سەیرو سەمەرەیە گورگێک تاوان دەکات و قسەشم لەگەڵدا دەکات؟ گورگەکە ووتی : سوێند بەخوا لەوەش سەیرتر هەیە! شوانەکە ووتی : چی لەمە سەیرتر هەیە؟ گورگەکە ووتی: پێغەمبەر ﷺ لەنێوان ئەم دارخورمایانەدا قسە بۆ خەڵک دەکات لەو هەواڵانەی کە ڕوویداوە و ئەوانەی کە هێشتا ڕوویان نەداوە، ئایا لەمەسەیرتر هەیە، پاشان شوانەکە مەڕەکانی هێنایەوە تاکو گەیشتە مەدینە و چووە لای پێغەمبەر ﷺ کاتێک پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی ((کوا دەشتەکیە خاوەن مەڕەکە؟)) جا دەشتەکیەکە هەستا سەرپێ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو ((ئەو ڕووداوە بۆ خەڵکەکە بگێڕەوە کە گوێت لێبوو وە لەوەی کە بینیت)) جا دەشتەکیەکە ئەو ڕووداوەی بۆ خەڵکەکە گێرایەوە لەوەی لەگورگەکە دیتی و لەوەی گوێی لێبوو! جا پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرمووی (( ڕاست دەکەن، ئەونیشانانەی لەپێش هاتنی ڕۆژی دوایی، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە قیامەت هەڵناستێت تاوەکو پیاو لەماڵ دەردەچێت و دەگەڕێتەوە نەعلەکانی یان قامچیەکەی یان گۆچانەکەی هەواڵی پێدەدات لەوەحی لەدوای خۆی ڕوویانداوە لەبارەی کەس و کارو خێزانەکەی)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

## هەروەها قسەکردنی مانگایەک کەڕوویداوە:

لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویێت بينما رجل يسوق بقرة لـه ، قد حمل عليها ، التفتت إليه البقرة فقالت : إني لم أخلق لهذا ، ولكني إنما خلقت للحرث فقال الناس : سبحان الله تعجبا وفزعا ، أبقرة تكلم ؟ فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم « فإني أؤمن به وأبو بكر ، وعمر))
**واتە: ((کاتێک پیاوێک چێڵکەی لێدە خوڕێت کە سواری سەرپشتی بووە، چێڵەکە ئاوڕی لێدایەوە و ووتی : من بۆ ئەو کارە دروست نەکراوم، بەڵام من بۆ زەوی کێڵان دروست کراوم، خەڵکەکەووتیان، سبحان الله پاک و بێگەردی بۆ خوا ! جێگای سەرسوڕمان و ڕاچڵەکینە ئایا مانگا قەسەدەکات؟ جا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی (( من باوەڕ بەمە دەکەم و هەروەها ئەبوبەکرو عومەریش))** موسلیم ریوایەتی کردووە

قسەکردنی گیانلەبەرە درندەو کێویەکان لەحەدیسدا هاتووەو ئەویش قسەکردنێکی ڕاستەقینەیە، خوای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە.

وە خوای گەورە عزوجل دەفەرموویێت ﴿ يَزِيدُ فِي ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ﴾ فاطر/١

**واتە// ((لەدروستکردندا هەرچی بوویێت زیادی دەکات (لەژمارەی فریشتەکان، لەئەستێرەو هەسارەکان، لەئادەمیزادو پەری..هتد، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە))**



## ١٢٠ ١٢١

# قیامەت هەڵناستێت تاوەکو ئایینی ئیسلام دەپووکێتەوە - بەرز بوونەوەو هەڵگیرانی قورئانی پیرۆز لەناو دڵەکاندا

لەنیشـانەکانی رۆژی دوایـی و نزیکبوونـەوەی کەوا ئایینی ئیسـلام کز دەبێـت و نامێنێت بەهـۆی فیتنەو تاوانـەکان و نەزانین، وە لەناو لەخەڵکیدا رۆژوو گرتن و نوێژکردن نامێنێت، قورئانیـش دەردەهێنرێت لەناو دڵی خەڵکیدا وە لەسـەر زوەیدا تەنها یەک ئایەتیش نامێنێت، نەزانیـن لەنـاو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە تاکـو وای لێدێت پیاوە پیرو بەتەمەنـەکان دەڵێت: ئێمە لەبـاب و باپیرانمانـەوە گوێمـان لەو ووشـەیە بووە کـە دەیانگوت: لااله الااللـە، وا ئێمەش دەیڵێینیەوە.

لەحوذەیفـە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت ((یدرس الإسـلام كما يدرس وشـي الثوب ، حتى لا يدرى ما صيام ولا صدقة ولا نسـك ، ويسرى على كتاب الله في ليلة فلا يبقى في الأرض منه آية ، ويبقى طوائف من الناس الشـيخ الكبير والعجوز الكبـيرة ، يقولـون : أدركنـا آباءنا على هذه الكلمـة : لا إله إلا الله فنحـن نقولها )) **واتە: ((ئیسـلام کز دەبێت وەکو رەنگی تۆخی کراس کاڵ دەبێتەوە و ڕەنگەکەی نامێنێت، تاوەکو نازاندرێت رۆژو گرتن چیە، وە نوێژ چیە، و قوربانی چیە، وەخێرو سـەدەقە چیە؟ لەماوەی شـەوێکدا خوای گەورە کتێبەکەی خۆی کە قورئانە دەباتەوە لای خۆی، لەسـەرزەویدا تەنها یـەک ئایەتیـش نامێنێت، و هەندێک لەپیرو پەککەوتە لەناوخەڵکدا دەمێنێتەوەو دەڵێت : لەباب و باپیرانمانەوە ووشەیەکمان گوێ لێبووەو درکم پێ کردووە ئەویش ووشەی (لااله الا الله) یە ئێمەش ئەوە دەڵێینەوە))** ابن ماجە و حاکم ریوایەتیان کردووە.

کاتێـک حوذەیفـە رەزای خـوای لەسـەر بێت ئـەم حەدیسـەی گێرایەوە، ئـەو خەڵکانەی دەوروبەری سـەریان سـورما جا صلەی بـن زمر بەحوذەیفەی گوت : ئـەی حوذیفە ئەدی ئەوانە کەتەنها دەزانن لا اله الا الله بڵێن، نازانن رۆژو گرتن و خێرو پاداشت و قوربانی چیە؟ دوا رۆژییان چۆن دەبێت!!، حوذیفە وەڵامی نەدایەوە، پاشـان سێ جاران دووبارە پرسیاری لێکردەوە، هەموو جار حوذەیفە وەڵامی نەدەدایەوە، پاشـان جاری سـێیەم وەڵامی دایەوەو گوتی : ئەی صلە ئەوانە لەئاگر ڕزگاریان دەبێت) ابن ماجە ریوایەتی کردووە

(یــدرس) واتــە لادەچێ هیچ شــتێکی لــێ نامێنێتەوە وەماناکــەی لەناو خەڵکدا دروشــمی ئیسلامەتی نامێنێت.

(وشي الثوب) واتە نەخش و نیگارەکانی ســەرجل و بەرگ ئەمــەش لەگەڵ زۆر بەکارهێنان و شوشتن لادەچێت.

(یســری علی القــران) واتــە قورئان لەناو دڵەکان هەڵدەگیرێت و نامێنێت.

ئەم نیشــانەیە هێشــتا ڕوویندداوە وە ئایینی ئیســلامیش لەزیــاد بوون و بڵاو بوونەوە دایە حەمدو سوپاس بۆ خودای گەورە.



نموونەی پارچە قوماشێکی کۆن کەنەخش و نیگاری تێدا بووە بەلام لەگەڵ زۆر بەکار هێنانی نەخشەکان نەماون



# ١٢٢

# سوپایەک دەیەوێت مەککە داگیربکات سەرەتا و کۆتاییەکەی ڕوو دەچێت لەزەویدا



پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەوا سوپایەک دەیەوێت مەککەی پیرۆز داگیر بکات و داوا لە پیاوێک دەکرێت کە بەرەنگاری ئەو سوپایە ببێتەوە ئەویش مەهدیە، جاخوای گەورە ئەو سوپایە لەسەرەتا وکۆتاییەکەی لەزەویدا دەباتە خوارەوە، سوپایەکەش لەئوممەتی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت وە لەسەر نیەت و مەبەستەکەیدا زیندوو دەکرێتەوە.

وە لەعبداللەی کوڕی القبطە دەڵێت، ((دخل الحارث بن أبي ربيعة وعبد الله بن صفوان وأنا معهما ، على أم سلمة أم المؤمنين ، فسألاها عن الجيش الذي يخسف به ، وكان ذلك في أيام ابن الزبير ، فقالت : قال رسول الله ﷺ : يعوذ عائذ بالبيت ، فيبعث إليه بعث ، فإذا كانوا ببيداء من الأرض خسف بهم « فقلت : يا رسول الله فكيف بمن كان كارها؟ قال : يخسف به معهم ، ولكنه يبعث يوم القيامة على نيته)) **واتە: ((حارسی کوڕی أبی ربیعە و عەبدوڵلای کوڕی صفوان، وەمنیش لەگەڵیاندا چووینە لای (ام سلمە)، پرسیاریان لێکرد لەبارەی ئەو سوپایەی کەلەزەویدا ڕوو دەچێت؟ ئەمەش لەڕۆژانی عەبدولای کوڕی زوبێر لەکاتێکدا لەشەڕدا بوو لەگەڵ حەجاجی کوڕی یوسف، لەو کاتە ابن الزبیر، لەمەککەی پیرۆزدا خۆی قایم کردبوو، ام سلمە دەڵێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((کە سانێک پەنا دەگرێت بەم ماڵی بەیتە سوپایەک ڕەوانە دەکرێتە سەری کاتێک کەدەگەنە زەویەکی بیابان ڕوودەچن بەزەویدا)) جا ووتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە چۆن دەبێت هی وا هەیە رقی لێیەتی لەم کاتەدا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (لەگەڵ ئەواندا لەزەویدا ڕوو دەچن، بەڵام لەڕۆژی دوایی لەسەرنیەتی خۆی زیندوو دەکرێتەوە))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەریوایەتێکی دیکەدا کە پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو سوپایەی کردووە کە روو دەچێت بەزەویدا جا ام سـلمە دەڵێت : لەوانەیە خەڵکی تێدابێت حەزی لێ نەبێت هاتبێت لەگەڵیاندا؟ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویێت ((إنهم يبعثون على نياتهم )) **واتە: ((ئەوانە لەسەر نیەتی خۆیان زیندوو دەکرێنەوە))** ترمذی ریوایەتی کردووە.

بەڵام زیندوو بوونەوەیان لەسەر نیەتی خۆیان چونکە تێیاندا هەیە رقی لێیەتی، وەهەشیانە بـەزۆر هێناویانە و هەشـیانە رێبـوارە، وەهۆی بەهیلاک چوونی هەموویـان دەگەرێتەوە بۆ گەورەیی نەگبەتی و خراپەکاران چونکە بەڵایەکە گشـتیر دەبێت بۆ هەمووان و هەر کەسێک لەوانە لەرۆژی دوایی بەگوێرەی نیەت و مەبەستی خۆی پرسیاریان لێدەکرێت.

لەحەدیسـەکەدا ئـاگادار دەکرێتەوە لـەوەی هاورێیەکی خراپەکاران نەکرێـت و لەگەڵیاندا هاتووچوونەکرێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی پشـتگیری کەسـێک بکات لەخراپەکردن ئەوا سزاکەی هەمان سزایە.

لەحەدیسەکەدا بەڵگەدەدات کەخودای گەورە بەزەویدا دەیان باتە خوارێ پێش ئەوەی بگەنە کەعبەی پیرۆز.

ئەمـەش ئەوانـەی ئـەم حەدیسـە یان ڕوایەت کـردووە واتێدەگـەن کە ئەو سـوپایە کەوا دەیەوێـت کەعبـە داگیربکات بۆ کەسـێکە کەپەنادەباتە بەر بەیت (کەعبـەی پیرۆز)، ئەویش مەهدی موحەممەدی کوڕی عبدالله یە کە خودای گەورە دەیپارێزێت و سـوپایەکە بەزەویدا دەباتە خوارێ ئەمەش کەرامەتێکە بۆ مەحەممەدی مەهدی.

لەعائیشـەوە ڕەزای خـوای لێبێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسـەر بێت دەفەرموێت ((عبـث رسـول الله ﷺ في منامـه ، **فقلنـا** : يا رسـول الله صنعت شـيئا في منامك لم تكن تفعلـه، **فقال** : العجب إن ناسـا من أمتي يؤمون بالبيـت برجل من قريش ، قد لجأ بالبيت ، حتـى إذا كانوا بالبيداء خسـف بهـم « ، **فقلنا** : يا رسـول الله إن الطريق قد يجمع الناس ، **قال** : نعم، فيهم المسـتبصر والمجبور وابن السـبيل ، يهلكون مهلـكا واحدا ، ويصدرون مصادر شـتى، يبعثهم الله علـى نياتهم)) **واتە: ((پێغەمبەر ﷺ لەکاتی نوسـتنیدا لەشـی دەجوولایەوە، ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا لەکاتی نووستندا شتێکت کرد پێشتر کاری وات نەکردووە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((جێی سـەر سوڕمانە کەسانێک لەئوممەتەکەم ڕوویان کردۆتە ماڵی بەیت (کەعبەی پیرۆز) بۆ پیاوێکی قورەیشی، کە پەنای بردۆتە بەر کەعبە، هەتا کاتێـک گەیشـتنە بیابانەکە ڕوو چـوون بەزەویدا)) جا ووتمان ئـەی پێغەمبەری خوا جاری وا هەیـە ڕێگە خەڵکـی جۆراو جۆر کۆدەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمـووی ((بەڵێ، تیایاندایە بەچاو ڕۆشـنی هاتووە، وە تیایاندایە بەزۆر هاتووە، وە هەشیانە ڕێبوارە، هەموویان بەیەک تیاچوون تیادەچن و، هەریەکەشیان بەڕێیەکی جیاواز دادەڕوات، خوای گەورە هەریەکەیان**

**لەسەر نیەتی خۆیان زیندوو دەکاتەوە))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەریوایەتێکی تردا عائشە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت ((يغزو جيش الكعبة ، فإذا كانوا ببيداء من الأرض ، يخسف بأولهم وآخرهم قالت : قلت : يا رسول الله ، كيف يخسف بأولهم وآخرهم ، وفيهم أسواقهم ، ومن ليس منهم ؟ قال : يخسف بأولهم وآخرهم ، ثم يبعثون على نياتهم)) **واتە: ((سووپایەک کەعبە داگیر دەکات هەتا کاتێک گەیشتنە بیابانی ئەو خاکە لەیەکەمینیان تاکۆتاییان روو دەچن بە زەویدا)) ووتی : ووتم ئەی پێغەمبەری خوا : چۆن لەیەکەمینیان تاکۆتاییان بەزەویدا رووودەچن و، تیایاندایە بەزۆر هاتووە، تیایاندایە خاوەنی کارە کەچی لەوان نیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (لەیەکەمینیان تاکۆتاییان بەزەویدا رووودەچن، وەلەسەرنیەتی خۆیان زیندوو دەبنەوە))** بوخاری ریوایەتی کردووە

لەدواییدا بەدرێژی باس لەمەهدی و رووداوەکانی دەکەین (سەیری نیشانەی ژمارە (١٣١) بکە لەنیشانەبچووکەکان)



# ١٢٣

# واز هێنان لەحەجکردن لەکەعبەی ماڵی خوا

لەرووداوەکانی رۆژی دوایی فیتنەکان روودەدەن، رِوو وەردەگێڕ درێت لەدین، وە زەمانێک بەسەر کەعبەدادێت حەج و عەمرەی تێدا ناکرێت.

لە ئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى لايُحَجَّ البيت )) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو بەیت (کەعبەی پیرۆز) حەجی تێدا ئەنجام نادرێت))** ابو یەیعلی وابن حبان، والحاکم ریوایەتیان کردووە




بەڵام ئەم نیشانەیە زۆر دوادەکەوێت، چونکە پاش هاتنی یەئجوج و مەئجوجیش حەجکردن بەردەوام دەبێت، وە لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لَيحَجَّنَّ هذا البيتُ ولَيُعتَمَرَنَّ بعدَ خروج يأجوج و مأجوجَ)) **واتە: ((ئەم بەیتە حەج و عومەری تێدا دەکرێت لەپاش دەرچوونی یەئجووج و مەئجووجیش))** بوخاری ریوایەتی کردووە.

وەمەبەست لە ((لاتقوم الساعة حتى لايُحَجَّ البيت )) **واتە: (( قیامەت هەڵناستێت تاوەکو بەیت حەجی تێداناکرێت))** کەوا حەجکردن لەکەعبەی پیرۆز دەپچرێت لەماوەی شەرو کوشتارەکان یان شتی تر، پاشان بۆجارێکی دیکە حەجکردن دەگەرێتەوە.

یاخود ماناکەی : هەندێک هۆزو قەبیلە خەڵکی قەدەغە دەکەن لەحەجکردن بۆ ماڵی خودا، خوای گەورەش لەهەمووکەس زاناترە.

# ١٢٤

# گەڕانەوەی هەندێک هۆزی عەرەب بۆ بت پەرستی



پێشتر جەزیرەی عەرەب لەکوفرو هاوبەش پەیداکردن بۆ خوداو بت پەرستیدا بوو، جا خودای گەورە پێغەمبەری ﷺ نارد بۆیان، بەسەر بازەکانی خۆی یارمەتیداو پشتگیری لێکرد، تاوەکو بتەکانی تێکشاندو، یەکتاپەرستی بڵاوکردووە.

بەڵام لەگەڵ نزیکبوونەوەی رۆژی دوایی و، دوورکەوتنەوەی خەڵک لەئایین، وازهێنانیان لەزانست و زانیاری، لەوکاتەدا کۆمەڵێک لەوان دەگەڕێنەوە بۆ پەرستنی بتەکان، ئەمەش لەنیشانەکانی رۆژی دواییە.

لەئەبوهورەیرە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى تضطربَ أليات نساء دَوس على ذي الخلصَةِ )) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو ئافرەتانی دەوس ئەسوڕێنەوە بەدەوری بتەکانی ذی الخلصة))** بخاری و مسلیم ریوایەتیان کردووە.




جێگای هۆزی دەوس

(ذو الخلصة) ئەو بتەیە کە هۆزی دەوس لەسەردەمی نەزانین دەیانپەرست.

(أليات) کۆی (ألية)یە بەمانای کردنی بتپەرستی، گەڕانەوە بۆ کوفر.

وەمەبەست لێی ئافرەتەکانی دەوس لەچوار دەوری ئەو بتە دەسوڕێنەوەو تەواف دەکەن و کوفر دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ پەرستنی بتەکان و گەورەکردنیان بەتایبەتی بتی (ذی الخلصه).

هۆزی دەوس لەبنەڕەتدا لەباشووری رۆژئاوای دوورگەی عەرەب نیشتەجێن.

# ١٢٥
# نەمانی هۆزی قورەیش

هـۆزی قورەیـش لەهۆزەکانـی عەرەبە، و ئەوانـە لەنـەوەی فەهر کـوڕی مالک کوڕی النضـر کوڕی کنانە، وە قورەیـش نازناوێکە لەسـەر زۆربەی ئەو کەسـانەی کە کڕین و فرۆشتن دەکەن و پارە کۆدەکەنەوە، ئەویش بازرگانیە، چونکە ئەوانە بازرگان بوون.

قورەیشـیش ژمارەیـەک بنەماڵـەو تیرەن، ئەوانـەش، نـەوەی الحارث کـوڕی فەهرو، نـەوەی جذیمـة، و نەوەی عائـذة، و نەوەی لوئـەی کوڕی غالب، و نەوەی عامری کوڕی لوئەی، و نەوەی عودەی کوڕی کەعب کوڕی لوئەی، و نەوەی مەخزووم، و نەوەی تەمیم کوڕی مـوڕرە، و نـەوەی زەهـرەی کوڕی کیـلاب، و نـەوەی ئەسـەد کـوڕی عەبدول عـوزەی، و نـەوەی عەبـدول دار، و نەوەی نەوفل، و نەوەی عەبدول موتەلیب، و نەوەی ئومەییە، و نەوەی هاشم، زۆری تریش..

پاشـان قورەیـش لـەدوای ئیسـلام لێـک جیابوونەوەو بوونە تیرەو نەوەیەکی زۆر، وەک بەکرییەکان و، عومەرییەکان و، عوسـمانیەکان و، عەلەوییەکان، و زۆری دیکەش .

بنەچـەی نیشـتەجێ بوونیـان جەزیـرەی عەرەبە، بێگومان ئێسـتا پـەرت بوونەو لەو وولات و شارەکاندا بڵاوبوونەتەوە.

پێغەمبـەر ﷺ هەواڵـی داوە ئـەوان لـە



دابەشبوونی هۆزەکانی دوورگەی عەرەب پێش ئیسلام



دابەش بوونی ئێستای هۆزەکانی دوورگەی عەرەب

کەمبوونەوەدان و تاوەکو وای لێدێت هۆزەکە نامێنێت و لەناو دەچێت. وە لەئەبو هوریرەوە ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((أسرعُ قبائل الناس فناء قريش يوشك ان تمر المرأة بالنعل فتقول هذا نعل قرشـي)) **واتە: ((خێراترین ئەو هۆزانەی لەناو دەچێت قورەیشـە، خەریکە کەوا ئافرەتێک تێدەپەڕێت بەنەعلێکەوە دەڵێت ئەمە نەعلی قورەیشـیە))** ئەحمەد وابو یعلی ریوایەتیان کردووە.

هەروەها پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویت ((يا عائشة قومك أسرع أمتي بـي لحاقاً)) **واتە: ((ئەی عائیشـە هۆزەکەی تـۆ خێراترین ئوممەتی منەکـە دەگەن بەمن )) پێشتر باسکراوە،** نیشانەی ژمارە (٨٢) لەنیشانە بچووکەکانە

# ١٢٦

# روخاندنی کەعبە لەسەر دەستی پیاوێک لەحەبەشە



لەنیشـانەکانی ڕۆژی دوایـی تێکدانـی قیبلـەی موسـڵمانان کەعبـەی پیرۆزە، لەئاخـری زەمانـدا پیاوێکـی ڕەش لەحەبەشـە تێکیدەدات بەنـاوی دووقاچ باریکەکـە لەبەر بچووکـی قاچەکانی و لاوازیان بەوناوە بانگ دەکرێت، وە بەرد بەرد کەعبە لەبن دەردەهێنێ، خشلەکانی دەبات و بەرگەکەشی لێدەکاتەوە.

لەعەبـدولای کـوڕی عەمـرو کـوڕی عاص ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (( أتركوا الحبشـة ما تركوكم، فإنه لا يستخرج كنـز الكعبة إلا ذو السـويقتين من الحبشة)) **واتە: ((حەبەشـە جێهێڵن وەک چۆن بەجێتان هێشت، چونکە هیچ کەسێک گەنجینەی کەعبە دەرناهێنێت تەنها پیاوێکی دووقاچ بارێک نەبێت لەحەبەشە))** ابوداود ریوایەتی کردووە.

لەریوایەتێکی دیکەدا ((يخرب الكعبة ذو السويقتين من الحبشة )) **واتە: ((خاوەنی دوولاق باریک لەحەبەشە کەعبە دەرووخێنێت))** متفق عليه




حەبەشە (ئەسیوبیا)

لەعەبدوللای کوڕی عەباس ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((كأني به أسود أفحج، يقلعها حجراً حجراً )) **واتە: ((هەر دەڵێی دەیبینم و لەپێش چاومە پیاوێکی ڕەش پێستە هەر دوولاقی لەیەکتردوورە، بەرد بەدر کەعبە لەبن دەردە هێنێ))** بوخاری ریوایەتی کردووە

وە لەعەبدوللای کوڕی عەمرو ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((يخرب الكعبة ذو السويقتين من الحبشة ، ويسلبها حُليّها ، ويجردها من كسوتها ، ولكأني أنظر إليه أصيلع أفيدع ، يضرب عليها بمساحيه ومعوله )) **واتە: ((کابرایەکی خاوەن دوولاقی باریک لەحەبەشە کەعبە دەرووخێنێت، هەموو خشلەکانی دەبات و بەرگەکەشی لێدەکاتەوە، هەردەڵێی لەپێش چاوومەو دەیبینم کابرایەکی کەچەڵەو جومگە خواری دەرپەڕیوە بەخاکە نازو پاچەکەی لێی دەدات))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.




(أصيلع ) بچووککراوەی (أصلع)

واتە: پرچی پێوە نیە

(افيدع ) واتە: خوارو خێچ لە جومگەکان

(بمساحته) واتە: بەخاکەنازەکەی، (المجرفه) ئاڵەتێکی لەئاسن دروستکراوە بۆ کێڵان بەکار دەهێنرێت.

(المعول) واتە : پاچ ئامێرێکە لەئاسن دروستکراوە بەردی پێ لادەبردرێت.



تێبینی و گومان

بێگومان دەڵێن چۆن دەرووخێندرێت لەکاتێکدا خودای گەورە مەککەی کردۆتە حەرەمێکی ئارام؟ خودای عزوجل دەفەرموویت ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا﴾ العنكبوت/ ٦٧ واتە: باشە، خوانە ناسانی مەککە هەست ناکەن، نابینن کە چۆن شوێنێکی ئەمین و پڕ لەئاسایشمان بۆ فەراهەم هیناون)) هەروەها دەفەرموویت ﴿أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا﴾ / القصص/٥٧ واتە ((مەگەر ئێمە شوێنێکی دوور لەستەم و پڕ لە ئاسایشمان بۆ فەراهەم نەهێناون)) هەروەها دەفەرمویت ﴿وَالْبَادِ ۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾﴾ الحج/٢٥ ((جا ئەوەی بیەوێت بەهۆی یاخی بوون و لادانەوە ستەم بکات، ئەواسزایەکی بەئازاری پی دەچێژین))

بێگومان خوای گەورە کەعبەی پاراستووە لەخاوەنی فیل. وە ئەوانە ئەوکاتە کافرو هاوبەش کاربوون، ئایا چۆن ئەم پیاوە دەسەلات دەخاتە سەری، لەکاتێکدا قیبلەی موسڵمانانە؟

وەڵام //

**یەکەم :** بێگومان کەعبەی پیرۆز بەحەرەمێکی ئارام و ئاسایش دەمێنێتەوە تاوەکو نزیکبوونەوەی رۆژی دوایی، نەک تاوەکو هەڵسانی قیامەت و تێکچوونی دونیا، وە لەئایەتەکەدا بەردەوامی بەمانەوەی ئەمن و ئاسایشی نەداوە تا هەستانی قیامەت، چونکە ئایەتەکە باری کەعبە لەو زەمانەدا بەئەمن و ئاسایش وەسف دەکات.

**دووەم :** پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی داوە بەوەی کەتەنها ئەهلی کەعبە بەحەڵال دەزانێت.

وە لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((يبايع لرجل بين الركن والمقام ، ولن يستحل هذا البيت إلا أهله ، فإذا استحلوه ، فلا تسل عن هلكة العرب ، ثم تظهر الحبشة ، فيخربونه خرابا لا يعمر بعده أبدا ، وهم الذين يستخرجون كنزه )) **واتە: ((پیاوێک لەنێوان ڕوکن و مەقامدا بەیعەتی پێدەدرێت وەکەس کەعبە بەحەڵاڵ نازانێت جگە لە ئەهلەکەی، کەبەحەڵاڵیان زانی کەس پرسیاری فەوتانی عەرەب ناکات پاشان حەبەشیەکان دێن وا وێرانی دەکەن بەشێوەیەک هەرگیز نۆژەن نەکرێتەوە هەر ئەوانیش زێڕو گەنجینەکەی ناوی دەردەهێنن))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

لەزەمانی ئەسحابی فیل خەڵکی مەککە کافر بوون بەڵام ئەوکات ڕێزی کەعبەیان دەگرت و کەعبەیان بەحەڵاڵ نەدەزانی، بۆیە خوای گەورە قەدەغەی کرد لەئەبرەهەو قەومەکەی.

بەڵام خاوەن دووڵاقە باریکە حەبەشیە کە نایرووخێنێت ئیلاپاش ئەوەی ئەهلەکەی کەعبە بەحەڵاڵ دەزانن وە نایپارێزن و چاودێری ناکەن، وە ئەگەر کەمتەرخەمی پشت گوێ خرا لەچاودێری کردن و گرنگی دان پێی ئەوا خوای گەورە وازیان لێ دەهێنێت لەسەر

# ١٢٧
# هەڵگردنی بایەكی فێنك بۆ كێشانی گیانی ئیمانداران

پاش ئەوەی نیشانەكانی رۆژی دوایی یەك بەدوای یەكداهاتن و، دەركەوتنی نیشانەگەورەكان وەك دەجال، و دابەزینی عیســای كوڕی مەریەم (علیه السلام)، و شتی تر، هەستانی رۆژی دوایــی نزیـك دەبێتەوە، گیانی ئیمانداران دەكێشــرێت، بۆ ئــەوەی رزگاربكرێت لەو ترس و تۆقینــەی كەلەكاتی هەســتانی قیامــەت روودەدات، وە رۆژی دواییش دانایەت تەنها لەســەر خەڵكەخراپە كارەكان نەبێت.

لە النواس كوڕی ســەمعان رەزای خوای لەســەر بێت دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ باسی دەجالی دەكرد.. وە لەحەدیســەكەدا باســیكرد تاوەكو فەرمووی ((**فبينمــا هم كذلك إذ بعث الله ريحا طيبة ، فتأخذهم تحت آباطهم ، فتقبض روح كل مؤمن وكل مســلم ، ويبقى شرار الناس، يتهارجــون فيها تهارج الحمر ، فعليهم تقوم الســاعة**)) **واتە:** ((**لــەو كاتەدا خوای گەورە بایەكی پاك و خۆش دەنێرێت وە خەڵكی لەبن باڵیەوە هەڵدەگرێت و رۆحی هەموو ئیماندارو موسڵمانێك دەكێشێت و، تەنها خراپەكاران بۆ خەڵكی دەمێنێتەوە ئەوانیش وەكو گوێ درێژ سواری یەكتر دەبن، جا قیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەستێت**)) متفق علیه.

لەعەبدوڵــلای كــوڕی عەمرو رەزای خوای لێبێت كەوا پێغەمبــەر ﷺ دەفەرموویێت ((**يخرج الدجال ..ثم يرســل الله ريحاً باردة من قبل الشــام فلا يبقى على وجه الأرض أحد في قلبه مثقال ذرة من خير أو إيمان قبضته حتى لو أن أحدكم دخل في كبد جبل لدخلته عليه حتى تقبضــه**)) **واتــە:** ((**دەجال دەردەچێت بۆ نێو خەڵك ...پاشــان خوای گەورە بایەكی فێنك دەنێــرێ لەلای شــامەوە، كەس نامێنێ لەســەر رووی زەوی كەتۆزقاڵێــك چاكە یان ئیمانی لەدڵدابێت ئەوا ئیلا گیانی دەردەچێت، تاوەكو ئەگەر یەكێ لەئێوە بچێتە ناو جەرگەی شاخیش ئەوا هەر پێی دەگات و دیمرێنێ**)) موسلیم ریوایەتی كردووە.

ئەم بایەش لەپاش مردنی عیسای كوڕی مەریەم علیه السلام و دەرچوونی دەجاڵ دەبێت.

# ١٢٨
# بەرزبوونەوەی بینایەو باڵەخانەکانی مەککە

لەســەردەمی پێغەمبەر ﷺ ژمارەی دانیشــتوانی شــاری مەککەو باڵەخانەکانی کەم بوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەوا لەنیشانەکانی رۆژی دوایی باڵەخانەکان لەسەر چیاکان بەرز دەبێتەوە، ئیبن شــەیبە لەسەنەدەکەی، دەریهێناوە بۆ یعلی بن عطاء لەباوکیەوە **دەڵێت:** سەر زەنیشتم کرد لەعەبدوڵلای کوڕی عەمرو **ووتی** ((چۆن ئێوە دەمێنن لەکاتێکدا کەعبەتان وێران کرد و لێگەڕان بەرد بەرد بەرد لای ببەن؟ ووتیان: ئایا ئێمەش لەسەر ئیسلامین؟؟! ووتی: بەڵێ ئێوەش لەســەر ئیسلامن، **ووتی:** پاشــان چی دەبێت؟ **ووتی:** پاشان جارێکی تر تۆژەن دەکرێتــەوە لەجاران باشــتر، کەدەبینــی مەککە هەمــوو هەڵکەندراوەو بووەتــە توونێڵ، وە دەبینیت بیناو باڵاخانەکان بەرز بوونەتەوە بەقەدەر ســەری چیاکان بزانە ئەم کارە ســەرت لێ دەسوڕمێنێ))

ئێســتا دەبینی لەمەککەی پیرۆز تونێلەکانی زەوی بە ژێرچیاکانی مەککەو لەژێر خاکەکەیدا تێپەڕ دەبن، وە بۆریە گەورەکان بۆ ئاوی زەمزەم ڕاکێشراون.



# ١٢٩
# دوایین ئوممەت نەفرەت لەئوممەتی پێش خۆیان دەکەن

لەئاخری زەماندا بیدعە زۆر دەبێت، وە خەڵکەکانی ئێستا خەڵکی پێش خۆیان سەرزەنشت دەکەن و وەبەر تانەیان دەدەن، هەندێکیش چاکەی سەحابە بەرێزەکان لەبیردەکەن و، شکۆمەندی تواناو هێزیان، خۆیان غافل دەکەن لەحەمدوو شوکرانەی خوای گەورە لەسەریان ئەو مەدح و ڕێز لێنانەی لەبۆ ئەوان هەیەو، هەندێک لەئوممەتەکانی کەوا لەپاش ئوممەتەکانی دیکە هاتوون نەفرەتیان لێدەکەن.

کەوەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت ((لاتقوم الساعة حتى يلعن أخر الأمة أولها))

**واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو ئاخیرین ئوممەت نەفرەت لەئوممەتی یەکەمیندا دەکات))**

((الامة)) ئوممەتی موحەممەدە ﷺ خەریکە دەردەکەوێت، خوای گەورەش زاناترە .



# ١٣٠
# سوار بووە نوێیەکان ....ئۆتۆمبیل

درێـژە پێدەرەکانـی ئاخیری زەمـان وە ژمارەیەک لەداهێنانەکانی، لەژمارەیەک حەدیسـدا هاتووە، یاخود ئاماژەی پێدراوە، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێمان داوە بەزۆر بوونی بازارەکان، و نزیکبوونـەوەی کات و ڕۆژگار،... لەمەشـدا هەندێـک لەزانایان والێی تێگەیشـتوون کەوا ئاماژەیـە بەئۆتۆمبیلـە بەناوبانگەکان لەزەمانی ئێمەدا هەروەک پێشـەوا الالبانی لەزنجیرەی سەحیحدا ئاماژەی پێکردووە، وەزۆری دیکەش.

ئیبن حەبان لەسـەحیحەکەیدا لەئیبن عومەر ڕەزای خوای لەسـەر بێـت ریوایەتی کردووە کـەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێـت ((یكون في آخر أمتي رجال يركبون على سـرج كأشـباه الرحال ينزلون على أبواب المسـاجد، نسـاؤهم كاسـيات عاريات.. )) **واتە: ((لەکۆتایی ئەم ئوممەتەدا هەندێک پیاو پەیدا دەبن سواری زین دەبن هەر دەڵێی ماڵ و خانووەو بەسواری ئەوانە دێنەبەر دەرگای مزگەوتەکان، ئافرەتەکانیشـیان ڕووتن و پرچیان لەسـەر سـەریان وەک پشتی ووشتر کۆکردۆتەوە))**

ووشەکەی ((كأشباه الرحال)) کۆی (رحال)ە ئەمە ئاماژەیە.

بۆ ئەو سواربووە تازانەی کەوا پێغەمبەر ﷺ نەیبینیوون.

وا دەردەکەوێت کەوا ئۆتۆمبیل بن، خوای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە.



# ١٣١
# دەرکەوتنی مەهدی

لەگەڵ زۆربوونی فەسادو خراپەکاری لەئاخیری زەماندا، وەبڵاوبوونەوەی جەوروستەم، وەخواردنی مافەکانی بێهێز لەلایەن بەهێزەکان، وە خۆگرتنەوەی ئەهلی شەڕو بەرز بوونەوەیان، لەم کاتەدا ئیمانداران چاوەڕێی بەیانیەکی نوێ دەکەن، کە تاریکی لەسەریان لاببات لەکاتێکدا هەموو زەوی پڕکردووە، جا خودای گەورە عزوجل مژڵەت دەدات لەدەرکەوتنی موحەممەدی کوڕی عەبدوللا الحسنی العلوی ......مەهدی...

- مەهدی کێیە؟
- هۆی دەرکەوتنی چیە؟
- لەکوێ دەردەکەوێت؟
- ئایا ئێستا بوونی هەیە؟
- ئایا چی دەکات؟
- وەکێن ئەوانەی بەدوای دەکەون؟

...پرسیارێکی زۆر خۆی دەخزێنێتە ناو بیروهۆش، بەوەی تەنها گوێی لەووشەی مەهدی دەبێت، لێرەدا بەڕوونی وەڵامی دەدەینەوە، وەبەکورتی لەلاپەڕەکانی داهاتوو لەسەری دەدوێین.

## ناوو جنەماڵەکەی :

ناوی محمد کوڕی عبدالله الحسنی العلوی، لەئال و بەیتی پێغەمبەرە لە نەوەی فاطمە، لەنەوەی (الحسن کوڕی علی)یە خودای گەورە لەهەرهەموویان خۆشبێت.

لەئیبن مسعود ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت




((لَو لَمْ يَبْقَ مِـنَ الدُّنيا إلا يَوْمٌ لَطَوَّلَ الله ذَلِكَ الْيَوْمَ حَتَّى يَبْعَثَ فِيـهِ رَجُلاَمِنِّي أو مِـنْ أَهْلِ بَيْتِي يَوَطِـيءُ اسْمُـهُ أسْمِي وأسْـمُ أَبِيهِ أسْم أَبِي))

**واتە:** **((ئەگەر تەمەنی دونیا تەنها یەک ڕۆژی مابێت خوای گەورە ئەو ڕۆژە هێندە درێژدەکات تاپیاوێک لەمن یان لەئاڵ و بەیتی من دەنێرێت، ناوی وەک و ناوی منە وە ناوی باوکی وەک ناوی باوکمە))** ترمذی و ابو داود ریوایەتی کردووە.

## هۆی دەرکەوتنی

لەئاخیری زەماندا پیاوێکی چاکخواز دەردەکەوێت، ئەمەش پاش بڵاوبوونەوەی فەسادو خراپەکاری، وەزۆربوونی کاری ناڕەواو، دروست بوونی ستەم و زۆرداری و کەمبوونی دادوەری و، ئەمەش پیاوێکە خوای گەورە باری ئەم ئوممەتە لەسەر دەستیدا ڕێکی دەخات و دەیسازێنێ، وە شوێنێکەوتووانی لەدەوریدا کۆدەبنەوەو، سەرپەرشتی ئیمانداران دەکات لەژمارەیەک شەڕو پێکداداندا، وە دەبێتە سەرکردەیەکی دادپەروەر.

## سیفەت و تایبەتمەندیەکەی:

لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (المهدي مني ، اي من نسلي..هذا نسبه، ثم ذكر صفاته الخلقية **فقال:** أجلى الجبهة ، أقنى الأنف، يملأ الأرض قسطا وعدلا ، كما ملئت جورا وظلما ، يملك سبع سنين)) **واتە: ((مەهدی لەمنە)): واتە لەنەوەی منە..ئەمە نەسەب و بنەماڵەکەیەتی، پاشان پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت باسی سیفەتە دروستکراوەکەی دەکات و دەفەرمووێت ((پیاوێکە نێوچەوان پان و گەورەیە، لووتی باریک و ڕێکە، زەوی پردەکات لەیەکسانی و دادپەروەری، لەکاتێکدا پرببوو لەستەم و تاوان، وە حەوت ساڵان حوکم دەکات))** ابو داود ڕیوایەتی کردووە.

(اجلى الجبهة) واتە: پرچی لەپێشەوەی سەر رووتابێتەوە، یان نێوچەوان پان.

(اقنى الانف) واتە: لووتی باریک و مامناوەندییەو لەناوەراستیدا تۆزێک بەرزبووبێتەوە نەک لووتێکی باریکی کەوتوو.

### لەسیفەتەکانی :

ناوی : وەک ناوی پێغەمبەرە دروودی خوای لەسەر بێت، ناوی باوکی وەک ناوی باوکی پێغەمبەرە دروودی خوای لەسەر بێت، ئەمەش محمد کوڕی عبدالله، لەئاڵ و بەیتی پێغەمبەرە درووددی خوای لەسەر بێت لەنەوەی (الحسن کوڕی علی)ە رەزای خوای لێبێت .

## حیکمەت لێی لەنەوەی (الحسن)ە:

پاش شەهید بوونی عەلی کوڕی ئەبی تالیب رەزای خوای لێبێت ئیمامی حەسەن خەلافەت دەگرێتە ئەستۆ، جا لەوکاتەدا بۆ موسلمانەکان دەبێتە دوو پێشەوا:

- الحسن رەزای خوای لێبێت لەعێراق و حیجازو شوێنی تر.
- وە معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان رەزای خوای لەسەر بێت لەشام و دەوروبەری.

پاش ئەوەی ئیمام حەسەن شەش مانگ حوکمی کرد بەبێ هیچ جێ گرەوەیەکی دنیایی خەلافەتی بۆ معاویە بەجێ هێشت، بەڵکو لەبەر خاتری خودای گەورە، بۆ کۆکردنەوەی ووشەی موسلمان لەسەر یەک حاکم و دەسەلات، وە نەرشتنی خوێن ئەمەش ئەو زیرەکی و لێهاتوویە بوو کە خودای گەورە پێی دابوو، ئەمەش شتێک بوو کەخودای گەورە پێبەخشی و، وازی لێهێنا.

## ماوەی حوکم کردنەکەی

حەوت ساڵ حوکمی موسلمانان دەکات.

لەماوەی حوکمەکەیدا زەوی پڕ دەکات لەدادپەروەری، هەروەک پێشتر پڕ ببوو لەجەوروستەم.

لەسەردەمی ئەودا ئوممەتی ئیسلامی نیعمەت و خۆشیەکی زۆریان بەسەردا دەبارێت، زەوی گژوگیاو دارودرەختی خۆی دەردەخات، وە ئاسمان لێزمە باران دەبارێنێت و ئیمامی مەهدی پارەوپوول وسەروەت و سامان بەبێ ژمارە دەبەخشێت.



## لەکوێ دەردەچێت؟

محمدی مەهدی کوڕی عبدالله الحسنی العلوی لەلای رۆژ هەڵاتەوە دەردەچێت، وە لەکاتی دەرچوونیدا بەتەنیا نابێت، بەڵکو خوای گەورە خەڵکی لەرۆژهەڵاتەوە ئیسلاح دەکات و پێشگیری لەمەهدی دەکەن و لەگەڵ خۆیاندا ئاییینی ئیسلام هەڵدەگرن و خەبات دەکەن لەپێناوی خوا، وەک لەحەدیسەکەدا هاتووە.

# کاتی دەرچوونی



لەئاخیری زەمانـدا لەکاتی ئالـۆزی و تەنگەژەی کاروباری خەڵک، سێ کەس لەکوڕە خەلیفەکان لەگەڵ یەکتر بەشەڕ دێن، لەسەر خشل و گەنجینەی کەعبە هەریەکەیان دەیەوێت دەستگرێت بەسەریدا لەگەڵ ئەمەش هیچ یەکێک لەمانە هیچیان بەدەست ناکەوێت.

لەوکاتە مەهدی لەمەککە دەردەکەوێت لەناوخەڵک ناوبانگی پەیدادەکات ولەلای مەککە خەڵکی بەیعەتی دەدەنی و ملکەچ و گوێڕایەڵی دەبن بەدوای دەکەون.

لەثوبانەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((یقتتل عند كنزكم ثلاثة كلهم ابن خليفة ، ثم لا يصير إلى واحد منهم ، ثم تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلونكم قتلا لم يُقْتَلهُ قوم - ثم ذكر شيئا لم أحْفِظَهُ فقال - إذا رأيتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج )) **واتە: ((لەلای گەنجینەکاتان سێ کەس بەشەڕ دێن کە هەرسێکیان کوڕە خەلیفەن، پاشان بۆ هیچ یەکێکیان نابێت، پاشان ئاڵاڕەشەکان لەلای رۆژ هەڵاتەوە بەدیار دەکەون، جا شەڕێکتان لەگەڵدا دەکەن کەس ئەو شەڕەی نەکردبێت، جا ثۆبان ووتی : پاشان باسی شتێکی کرد لەبیرم نەماوە – ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((جا ئەگەر بینیتان بەیعەتی بدەنێ ئەگەر بەسەر بەفریشدا خۆتان خشاند بێت))** ابن ماجە ریوایەتی کردووە.

؟! پرسیارەکان

**چۆن نێوانی دەرچوونی مەهدی لەمەککە و هاتنی ئاڵاڕەشەکان لە رۆژهەڵاتی خوراسان کۆبکەینەوە؟..**

**وەبۆچی ئەو ئاڵایەی کەمەهدی هەڵیگرتووە ڕەنگی ڕەشە؟....**

## لێکدانەوەی حەدیسەکە:

((کلهــم ابــن خليفة)) واتە: ســێ پیاون، هەر یەکە یان شــوێنکەوتووی خــۆی هەیە، وە هەریەکێک لەم پیاوانە باوکیان پادشــابووە، وە هەریەکەیەیان داوای موڵک و ســامان دەکات وەک موڵک و سامانی باوکی.

((كنزكم)) هەندێک دەڵێن خشــل و گەنجینەی کەعبەیە، ئەمەش زێڕو گەنجینەیەکە واباس دەکەن لەژێر کەعبەیە.

**هەندێکی تر دەڵێن :** وەرگرتنی پادشایەتیە واتە حوکم وخەلافەت، وە هەندێکی دیکە دەڵێن: گەنجینەی ئاوی فوراتە، ئەو چیا زێڕەیە کەئاوی فورات دەری دەخات.

**ئیبــن کثیر** دەڵێــت: **(مەهدی) بەکەســانێک لەخەڵکی رۆژ هەڵات پشــتیوانی دەکرێت و ســەری دەخەن، ئەو کۆمەڵەیە دەســەڵاتی بۆ دادەمەزرێنن، و کۆڵەگەکانی بۆ پتەو دەکەن، هەروەها ئاڵا کانیشــیان ڕەش دەبێت، کە ئەویش پۆشــاکێکە هەیبەتــی پێوە دیارە چونکە ئاڵاکەی پێغەمبەریش دروودی خوای لەسەر بێت ڕەنگی ڕەش بوو پێی دەوترا: (العقاب) واتە (شاهۆ).**

لەئەبــی ســەعیدی خودری ڕەزای خــوای لێبێت کە وا پێغەمبــەر ﷺ دەفەرموویێت ((يخرج في آخــر أمتي المهدي يســقيه الله الغيث وتخرج الأرض نباتها، ويَعطــي المال صحاحاً، وتكثر الماشــية، وتعظم الأمة، يعيش ســبعاً أو ثمانياً )) واتە: **((لەئاخیری ئوممەتی مندا مەهدی دەردەچێــت خوای گەورە بەهۆیەوە زەوی تێر ئــاو دەکات و، زەوی گژوگیاو ڕووەکەکانی دەردەکات و ، ماڵ و سامان زۆر بەفراوانی دەبەخشێت، ئاژەڵ و مەڕو مەڵات زۆر دەبێت، وە ئوممەتی ئیسلام گەورەو شکۆمەند دەبێت، حەوت یان هەشت ساڵ حوکم دەکات))** حاکم ریوایەتی کردووە.



وە لەریوایەتێکی دیکەدا ((ثم لاخير في الحياة بعده)) **واتە: ((پاشان دوای مردنی ئەو ژیان هیچ خێری پێوە نامێنێت))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

ووشـەی (يعطي المال صحاحا) واتە بەیەکسـانی ماڵ و سەروەت سامان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکات.

ئەمەش ئەوە دەسەڵمێنێ کەوا پاش مردنی مەهدی شەڕو ئاژاوەیەکی گەورە جارێکی دیکە سەر هەڵدەداتەوە.

**ئیمـام ئیبـن بـاز** دەڵێت: **((مەسـەلەی (مەهدی) زانـراوو ئاشـکرایە وە فەرموودەو حەدیسەکان دەربارەی ئەو زۆرن و بەڵێشاون، بەڵکو نیشانەو (متواتر)ەکانی پشتگیری یەکتر دەکەن، وە (تواتر)ەکەشی لەلایەن زیاتر لەکەسێک لەئەهلی زانست و زانیاری قسەی لەسەر کراوە، وە تواترەکەشی (تواتر)ێکی معنوی و واتاییە، لەبەر زۆری ڕێگاکانی و جیاوازی مەخرەج و دەریچەکانی هەروەها سـەحابەکان و ریوایەتەکانی و ووشەکانی، و ئەمانە هەمووی ڕاستی بەڵگەن لەسـەر ئەوەی کە ئەم کەسـە مژدە پێدراوە، مەسەلەیەکی چەسپاوەو هاتنی هەقە، ئەویش محمد کوڕی عبدالله العلوی الحسـنی لە نەوەی الحسن کوڕی علی رضي الله عنهم وە ئەم ئیمامە لەژێر ڕەحمەتی خودای گەورەدایە بۆ ئوممەتی ئیسلام لەئاخیری زەماندا دەردەچێ و دادپەروەری و هەق و عەدالەت دادەمەزرێنێ، و زولم و سـتەم قەدەغە دەکات، وە خودای گەورە بڵاوی دەکاتەوە بەبەیداخی خێر لەسـەر ئوممەتی ئیسلام بەدادپەروەری و ڕێنمایی و سەرکەوتن بۆ خەڵک))**

## ئەو حەدیسانەی لەبارەی مەهدی یەوە هاتوون :

چەندەها حەدیسی سەحیح کەبەڵگەن لەسەر دەرکەوتنی مەهدی هاتوون، ئەو حەدیسانەش لەسەر دوو جۆرن.

- هەیانە لەبارەی دەق هاتووە لەسەر مەهدی.
- وەهەشیانە لەبارەی باسکردنی تەنها سیفەتەکەی هاتووە.

لێرەدا هەندێک لەو حەدیسانە باس دەکەین، ئەمەش بەسە لەسەلماندنی دەرکەوتنی لەئاخیری زەماندا کەنیشانەیەکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی.

ژمارەی ئەو حەدیسانەی دەربارەی مەهدی هاتوون، پەنجا حەدیسن کەتیایاندا (سەحیحە) وە تیایاندا (حسن)ە وتیاشیاندایە (زەعیفی منجبر)ە

ژمارەی هاوەڵەکانیش: بیست و هەشت هاوەڵەکە فەرموودەکانیان گێڕاوەتەوە.

وە ئەم ئیمامانەش دەربارەی ئەوەی کە ئەو فەرموودانەی باس لەهاتنی مەهدی دەکەن گەیشتوونەتە پلەی متواتر، ئەمانەش : السفاريني وە صديق حسن خان والحافظ الآبري.

١ لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((يخرج في آخر أمتي المهدي يسقيه الله الغيث وتخرج الأرض نباتها، ويعطي المال صحاحاً، وتكثر الماشية، وتعظم الأمة، يعيش سبعاً أو ثمانياً )) **واتە: ((لەئاخری ئوممەتی من مەهدی دەردەچێت: بەهۆیەوە خوای گەورە زەوی تێر ئاو دەکات، زەوی رووەکەکانی دەردەکات، وە ماڵ وسامان بەیەکسانی دەبەخشێت و ئاژەڵ و مەڕو ماڵات زۆر دەبێت و ئوممەتی ئیسلام گەورە و شکۆمەند دەکات، حەوت یان هەشت دەژیت))** حاکم ریوایەتی کردووە

٢ ئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویت ((أبشركم بالمهدي، يبعث على اختلاف من الناس وزلازل فيملأ الارض قسطاً وعدلاً، كما مُلِئت جوراً وظلماً، يرضى عنه سكن السماء وساكن الأرض، يقسم المال صحاحاً)) **واتە: ((موژدەتان دەدەمێ بەهاتنی مەهدی، لەکاتێکدا دێت کەخەڵکی لەناکۆکی و لەزۆر بوونی بوومەلەرزە دایە، زەوی پردەکات لەڕاستی و دادپەروەری، هەروەک پێشتر پڕببوو لەزوڵم و ستەم، وە دانیشتوانی ئاسمان و دانیشتوانی زەوی لێی ڕازی دەبن، پارەو سامان بەڕێکی دابەش دەکات)) پیاوێک پێی ووت: چۆن بەڕێکی؟ فەرمووی ((بەیەکسانی لەناو خەڵکدا))، وە دەفەرموێت ((خوای گەورە دڵی ئوممەتی محمد درووودی خوای لێبێت ڕاست و دەوڵەمەند دەکات، تاوەکو فەرمان دەکات بانگ دەرێک بانگ بکات و بڵێت: کێ پێویستی بەپارەو ماڵ و سامان هەیە؟ هیچ کەس لەو خەڵکە هەڵناستێت تەنها پیاوێک نەبێت، جا پێی دەڵێت: برۆ بۆ لای خەزنەدار، وەپێی بڵێ، مەهدی فەرمانت پێ دەکات کەوا پارەم بدەیتێ، خەزنەدارەکە پێی دەڵێت، کۆشت بکەوە و هەڵیرێژە، تاوەکو کۆشی پڕ پارە دەکات و پەشیمان دەبێتەوەو وەریناگرێت، جادەڵێت: من پیسکەترین ئوممەتی محمد بووم، جا پارەکە ڕەتدەکاتەوە و وەریناگرێت، ئینجا پێی دەڵێن ئێمە هەرشتێ کەبەخشیمان وەریناگرینەوە، بەم شێوەیە حەوت ساڵ یان هەشت ساڵ یان نۆ ساڵ دەمێنێتەوە، لەپاش ئەوە خێر لەژیاندا نامێنێت، یان دەفەرموێت : پاش ئەوە گوزەران هیچ خۆشی تێدا نامێنێت))** ئەحمد ریوایەتی کردووە.

٣ وە ئیمامی عەلی رەزای خوای لێبێت دەگێرێتەوەو دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((المهدي منا أهل البيت، يُصْلحه الله في ليلة)) **واتە: ((مەهدی لەئالو بەیتی ئێمەیە، خوای گەورە لەشەوێکدا ئامادەی دەکات و دەیسازێنێ بۆ ئەم کارە))** ئەحمەدو ابن ماجە ریوایەتیان کردووە.

((يُصْلحه الله في ليلة)) ڕەنگە مەبەستی ئەمە بێت، کەوا خودای گەورە دەیسازێنێ بۆ خەلافەت واتە بۆی ئامادە دەکات، وەسەری دەخات، و سروشی بۆ دەنێرێت و ڕێنمایی

دەکات، سیفەتی سەرکردەکانی دەداتێ و، حیکمەتی دەداتێ کە پێشتر نەیبووە.
دەڵێـن ((یُصلحهُ الله فــی اللیلة)) **واتە:** کاروبارەکانی ڕێـک دەخات و هێزو توانای بەرزدەکاتەوە لەشــەوێکدا، یان لەیەک کاتژمێری شەوێکدا بەجۆرێک ئەهلی ناکۆکەکان لەگەڵ یەکتر ڕێک دەکەون.
ئەمەش مانای ئەوەیە کە مەهدی محمد کوری عبدالله خۆی نازانێت کە ئەو مەهدیە بەگوێرەی ئەو حەدیسانە تاوەکو خەڵکەکە بەیعەتی پێدەدەن و لەدەوری کۆدەبنەوە.



وە داوای خەلافەت ناکات و گومان نابا بەو پلەو پایەی کەهەیەتی، بۆیە خەڵکەکە بەیعەتی دەداتێ ئەویش پێی ناخۆشە.
((یُصلحــهُ الله فی اللیــة)) مانای ئەوەنیـە کـە پیاوێکـی گومـڕاو خراپـەکارە، بـەڵام خـوای گەورە لەشــەوێکدا هیدایەتــی دەدات، وە دەبێتە پێشــەوای خەڵــک، نەخێر، بەڵکو مەهدی پێشــەوایەتی خەڵک دەکات بەزانستێکی شەرعی بەردەوام، وەهەروەها حوکم لەنێوانیاندا دەکات و فەتوایان بۆ دەدات و، تایبەتمەندیەکانی جیای دەکاتەوە.
سەرکردایەتیان دەکات لەشەرو کوشتار.. ئەو هەموو زانستە لەشەوێکدا لێی کۆنابێتەوە ئیلا دەبێت بەسورش بێت، وەسروشیش تەنها بۆ پێغەمبەرانە، لەکاتێکدا ئەو پێغەمبەر نیە.
بۆیە ماناکەی ((یُصلحهُ الله فی اللیة)) واتە: خوای گەورە، وای لێدەکات کەقەناعەت بهێنێت کە ئەو مەهدیە بەگوێرەی حەدیسەکان، وەسیفەتی سەرکردەو پیشەوای دەداتێ کەپێشتر نەیبووە.

٤ ام سلمە رەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت **((المهدي من عُترتي من ولد فاطمة)) واتە: ((مەهدی لە بنەماڵەی منە، وە لەکورەکانی فاتیمەیە))** ابی داود، ریوایەتی کردووە.
((من عُترتي)) واتە: لەئال و بەیتی منەو لەنەوەی منە.

((من ولد فاطمة)) واتە: لە نەوەی فاتیمەیە ڕەزای خوای لێبێت.

٥ لەجابر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((ینزل عیسى بن مريم فيقول أميرهم المهدي تعال صَلِّ بنا، فيقول: لا، إن بعضهم أمير بعض: تكرمة الله هذه الأمة)) واتە: **((عیسای کوڕی مەریەم لەئاسمان دێتە خوارەوە جامەهدی کەپێشەوای موسڵمانانە پێی دەڵێت: فەرموو پێش نوێژمان بۆ بکە، ئەویش دەڵێت: نەخێر، ئێوە هەندێکتان بۆ هەندێکتان ئەمیرن، ڕێزێکە خوای گەورە لەم ئوممەتەی ناوە))** حارث بن ابی اسامە ڕیوایەتی کردووە.

ئەم حەدیسەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کەوا دەجال لەزەمانی مەهدی دەردەچێت پاشان (عیسا علیە السلام) دادەبەزێت بۆ کووشتنی دەجال، لەکاتێکدا مەهدی هێشتا پێشەوای ئیماندارانە، جا عیساو ئیماندارەکان لەدواوەی مەهدی نوێژ دەکەن.

٦ لەئەبی سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((منا الذي يصلي عيسى ان مريم خلفه)) واتە: **((ئەو کەسەلە نەوەی منە کە عیسای کوڕی مەریەم نوێژ لەدواوەی دەکات))** ابو نعیم ڕیوایەتی کردووە

لێرەدا مەبەست ئەوەیە، کەوا مەهدی پێش نوێژ بۆ خەڵک دەکات، وەعیسای کوڕی مەریەم علیە السلام لەناو ئەو ئیماندارانەیە.

٧ ابن مسعود ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمویت ((لَو لَم يَبقَ مِنَ الدُنْيا إلا يَومٌ لَطَوَّلَ اللهُ ذَلِكَ الْيومَ حَتَّى يَبْعَثَ فِيهِ رَجُلاً مِنِّي أَو مِنْ أَهلِ بَيْتِي يَوَاطِيءُ اسْمُهُ أَسِمي وَاسـُم أَبيهِ أَسْـَم أَبِي)) واتە: **((ئەگەر تەمەنی دونیا تەنهایەک ڕۆژ مابێت، خوای گەورە ئەو ڕۆژە هێندە درێژ دەکات تا پیاوێک لەمن یان لەئاڵ وبەیتی من دەنێرێت، ناوی وەکو ناوی منە، ناوی باوکیشی وەک ناوی باوکمە))** ترمذی ڕیوایەتی کردووە.

کەواتە ناوی (محمد کوڕی عبدالله)یە، ئەمەش بەرپەرچی شیعەکان دەداتەوە، کە دەڵێن ناو (محمد کوڕی الحسن العسكری)یە.

مانای ((يَبْعَثَ)) واتە: دەریدەخات یان دەینێرێت.

لەحەدیسێکی دیکەدا کەئەحمەد ریوایەتی کردووە دەگێڕێتەوەو دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت ((لو لم يبق من الدهر إلا يوم لبعث الله رجلاً من أهل بيتي يملؤها عدلاً كما مُلئت جوراً)) واتە: **((ئەگەر تەمەنی ڕۆژگار تەنها یەک ڕۆژ مابێت، خودای گەورە پیاوێک لەئاڵ و بەیتی من دەنێرێت، کەوا زەوی پڕ دەکات لەدادپەروەری هەروەک پێشتر پڕببوو لەزولم و ستەم))**

لەڕیوایەتێکی دیکەدا ((لاتذهب - أو: لاتنقضي - الدنيا حتى يملك العرب رجل من أهل بيتي يواطيء أسمه سمي.)) **واتە: ((ئەو دونیایە نـاڕوات - یان (کۆتایی نایەت تاوەکو لەنـاو عـەرەب پیاوێک پەیدا دەبێت لەئاڵ و بەیتی من ناوی وەکو ناوی منە))** ابو داود ریوایەتی کردووە.

وە فەرموودەی (حتى يملك العرب ) **واتە: ((دەبێتە پێشـەوای موسـلمانان بەگشـتی، ئەگەر عەرەب بن یان عەجەم بن))**

بەڵام لێرە عەرەب باس لەوەدەکەن کە مەهدی لەلای ئەوان دەستپێدەکات، کەوا لە مەککەو مەدینە دەردەچێت، عەرەبەکان بەدوای دەکەون، پاشان موسلمانەکانی تر بەگشتی.

هەروەها هەموو موسڵمانێک وا دادەنێت کە عەرەبە لەبارەی خوێندنەوەی قورئان، وەزانین و تێگەیشتنی زمانی عەرەبی.

٨ زەڕ کوڕی عبدالله ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لاتقوم الساعة حتى يلي رجل من أهل بيتي يواطيء أسمه اسمي )) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکـو پیاوێـک لەئـاڵ وبەیتی مـن دێت ناوی وەکو نـاوی منە))** ئەحمـەد ریوایەتی کردووە

٩ وە عەلی ڕەزای خوای لێبێت دەگێڕێتەوەو دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویت (( لو لم يبـق مـن الدهر إلا يوم لبعث الله رجلاً من أهل بيتي يملؤها عدلاً، كما مُلئت جوراً ))
**واتە: ((ئەگەر تەمەنی ڕۆژگار تەنها یەک ڕۆژ مابێت ئەوا خوای گەورە پیاوێک لەئال و بەیتی من دەنێرێت، زەوی پڕ دەکات لەدادپەروەری، کەوا پێشـتر پڕ ببوو لەجەورو ستەم))**

لەڕیوایەتێکـی دیکـەدا ((لو لم يبق من الدنيا إلا يوم لبعث الله رجلاً منا يملؤها عدلاً كما مُلئت جوراً)) **واتە: ((ئەگەر تەمەنی دونیا تەنها یەک ڕۆژ مابێت، ئەوا خودای گەورە عزوجل پیاوێک دەنێرێت لەئاڵ و بەیتی من، زەوی پڕ دەکات لەدادپەروەری کەوا چۆن پێشتر پڕببوو لەجەوروستەم))** ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە.

ئەو حەدیسانە هەموویان ڕاشکاون لەدەقەکان لەسەر مەهدی محمد کوڕی عبدالله باسی ناوو سیفەتەکەی دەکات.

## وە لێرەدا کۆمەڵێک لە حەدیسەکان باس دە کەین لەوانەیە لەبارەی مەهدی دا هاتبن.

١٠ لەجابر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((یوشك ان أهل العراق لايجيء اليم قفيز ولادرهم، قلنا، من أين ذلك؟ قال: من قبل العجم، يمنعون ذلك.)) **واتە: ((خەریکە لەئەهلی عێراق هیچ (قفیز) وەیا (درهم) وەک جەزیەو خەراج نەدرێت بۆ خەزێنەی دەوڵەتی ئیسلام)) ووتمان ئەمەلەلایەن کێ دەبێت؟ فەرمووی ((من قبل العجم)) واتە: ((لەلایەن عەجەمەکانەوە، کە قەدەغەکەی دەکەن))**




((قفیز)) پێوەری خەڵکی عێراقە، وەک ڕبە بۆ پێوانی گەنم و جۆ، کیلۆ، تەن.

(من قبل العجم) ووشەی عەجەم بۆ غەیرە عەرەب بەکار دەهێنرا، جا ئەگەر بەعەرەبی قسەی بکردایە یانیش نا، بەڵام دوایی ئەم ناوە بووە ئاڵایەک لەسەر فارسەکان.

پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((یوشك أهل الشام ان لا يجيء اليهم دينارولامُدي قلنا من اين ذلك؟ قال: من قبل الروم )) **واتە: ((خەریکە خەڵکی شام هیچ (دینار) وە یان (مدی) بۆیان نەنێرێت لەخەزێنەی دەوڵەتی ئیسلام)) ووتمان: ئەمە لەلایەن کێ دەبێت؟ فەرمووی ((لەلایەن ڕۆمەکانەوە))**

((دینار)) پارەیەکە لەزێڕ دروست دەکرا.

((مدي)) پێوەرێکە بۆ خەڵکی شام، وەک هەرپێوەرێک، کیلۆ، تەن.

پاشان هنیهە بێدەنگ بوو، دوایی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی ((يكون في آخر أمتي خليفة يحثي المال حثياً لابعده عداً )) **واتە: ((لەئاخیری ئوممەتی مندا خەلیفەیەک پەیدا دەبێت، سەروەت و سامان دەرێژێت و دەیبەخشێت بەبێ ژماردن)) جەریری دەڵێت ((بە ئەبی نضرە) و (ئەبی عەلاء)م ووت: وانا بینن کە ئەمە عومەری کوڕی عەبدول عەزیزبێت؟ ووتیان نەخێر))** موسلیم ریوایەتی کردووە

ئەمە بەبەڵگەی حەدیسەکانی پێشوو (مەهدی)یە کەوا ناوی باسکراوە، هەروەها لەبەر زۆر بوونی دەستکەوت و غەنیمەو، ڕزگار کردنی دەوڵەتە ئیسلامیەکان لەسەر دەمی ئەودا لەگەڵ سەخی و دەستبڵاوی خۆی، و هەوڵ و تێکۆشانی بۆ هەموو خەڵکی.

١١ لەعائیشــەی دایکی ئیماندارانەوە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت ((أن عائشة ، قالت : عبث - أي تحرك - رســول الله صلى الله عليه وســلم في منامه ، فقلنا : يا رســول الله صنعت شيئا في منامك لم تكن تفعله ، فقال : العجب إن ناســا من أمتي يؤمون -أي يقصــدون ويتوجهون - بالبيت - أي الكعبــة - لرجل من قريش ، قد لجأ بالبيــت ، حتى إذا كانوا بالبيداء - أي بالصحراء - خسف بهم - أي انشقّت الأرض وابتلعتهم في جوفها، فقلنا: يا رسول الله إن الطريق قد يجمع الناس ، قال : « نعم ، فيهم المستبصر والمجبور وابن السبيل ، يهلكون مهلكا واحدا ، ويصدرون مصادر شتى ، يبعثهم الله علــى نياتهم)) واته: **((پێغەمبەر ﷺ لەخــەودا جوولایەوە، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمشەو لەخەودا کارێکت کرد کە پێشتر نەتکردووە، جا فەرمووی (( جێی سەر سوڕمانە کەسانێک لەئوممەتەکەم ڕوویان کردۆتە کەعبە، بۆ پیاوێکی قورەیشی کەپەنای هێناوەتەوە بەر کەعبە، هەتا کاتێک گەیشــتنە بیابانەکــە لەزەویدا چوونە خوارێ)) جا ووتی : ئەی پێغەمبەری خودا! جاری وا هەیەڕێگا ئەم خەڵکانە کۆدەکاتەوە! فەرمووی ((بەڵێ، تیایاندا هەیە بەچاورۆشــنی هاتــووە، وە تیایاندا هەیە بەناچاری هێناویانە، وە تیایاندا هەیە ڕێبوارە، هەموویان بەیەک تیاچوون لەناو دەچن، وە هەریەکەیان لەسەر نیەتی خۆیان زیندوو دەکرێتەوە))** بوخاری ڕیوایەتی کردووە.



((المستبصر)) واتە: چاوکراوەو دەلیلە بۆ کاروفەرمانی نێردراوەکە.

((والمجبور)) واتە پێیناخۆشەو خەمبارە، بەناچاری هێناویانە.

مەبەست لێی لەناو چوونی ئەو سوپایە یەک لەناوچوونە هەموویان پێکەوە بەزەویدا دەچنەخوارەوە، بەڵام لەرۆژی دوایی لەلای پەروەردگار هەر کەسەو لەسەر نیەتی خۆی زیندوو دەکرێتەوە بەبارێکی جیاواز یەکێک بۆ بەهەشت دەڕوات و ئەویتر بۆ ناو ئاگر دەڕوات، لەسەر تواناو کارەکانیان و مەبەستەکانیان.

١٢ لەئەبوهوریرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێـت دەفەرموێـت ((يبايع لرجل بين الركن والمقام ، ولن يسـتحل هذا البيت إلا أهله ، فإذا اسـتحلوه ، فلا تسـل عن هلكة العرب ، ثم تظهر الحبشة ، فيخربونه خرابا لا يعمر بعده أبدا ، وهم الذين يسـتخرجون كنزه. )) **واتە: ((پیاوێک لەنێوان ڕوکن و مەقامـدا بەیعەتـی پێدەدرێت، وەکەس کەعبەبەحەڵاڵ نازانێـت جگە لەئەهلەکەی، جا کاتێک بەحەڵاڵیان زانی ئەوا پرسـیار لەناوچوونی عەرەب مەکە، پاشـان حەبەشیەکان دێـن وا وێرانـی دەکەن هەرگیز نـۆژەن نەکرێتەوە، هەر ئەوانیـش گەنجینەکەی لەناو دەردەهێنن))** امام ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

١٣ لەئەبوهورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت ((كيف أنتم إذا نزل ابن مريم فيكم وأمامكم منكم)) **واتە: ((دەبێت لەوکاتەدا ئێوە چۆن بن کە عیسـای کوڕی مەریـەم لەناوتاندا دادەبەزێت و پێشەواشـتان لەخۆتانە))** بوخاری ریوایەتی کردووە.

لێرەدا مەبەست لەپێشەوا مەهدی محمد کوڕی عبدالله یە، بەسەلماندنی دەقەکە لەسەری لەو حەدیسەی کە جابر رەزای خوای لەسەر بێت لەژمارە (٥) گێراویەتیەوە.

١٤ لەجابـری کـوڕی عبداللـە رەزای خوای لەسـەر بێت کەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێت (( لا تـزال طائفـة مـن أمـتي يقاتلـون علـى الحـق ظاهريـن إلى يـوم القيامة « ، قـال : « فينزل عيسـى ابـن مريم صلى الله عليه وسـلم ، فيقـول أميرهم: تعال صـل لنـا ، فيقـول : لا ، إن بعضكـم علـى بعض أمـراء تكرمة الله هـذه الأمة)) **واتە: ((هێشتا بەردەوام کۆمەڵێ لەئوممەتی من شەڕدەکەن لەسەر هەق دیارو باڵادەستن تارۆژی دوایی، جا عیسای کوڕی مەریەم لەئاسماندا دادەبەزێت جا ئەمیرەکەیان دەڵێت، وەرە پێش نوێژیمان بۆ بکە، عیسـا علیە السـلام دەفەرموێت: نەخێر ئێوە هەندێکتان بـۆ هەندێکتـان ئەمیرن، ئـەوەش ڕێزێکە خوای گەورە لەم ئوممەتـەی ناوە))** ئەحمەد ریوایەتی کردوووە.

**وەلێرەشدا دیسان مەبەستی (مەهدی)یە پێشەوایانە لەنوێژەکانیاندا**



سوودەکان

**نوێژکردنی عیسا علیه السلام لەدواوەی مەهدی مانای ئەوەنیە کە مەهدی باشتر بێت لەعیسا علیه السلام، کەچی پێغەمبەر محمد دروودی خوای لەسەر بێت نوێژی لەدوای أبی بکر رەزای خوای لەسەر بێت کردووە، لەکاتی نەخۆشبوونی، کەوا تێیدا کۆچی دوای کرد، وەنوێژی لەدوای عبدالرحمن کوڕی عوف کردووەو جا عیساش علیه السلام نوێژ لەدوای پیاوێک دەکات لەئوممەتی محمد دروودی خوای لەسەر بێت، بۆ ئەوەی بەدیار بکەوێت کەوا دابەزیووەو شوێنکەوتووی محمدە دروودی خوای لەسەر بێت، دادوەرە بەشەرعەکەی، پاشان لەدوای ئەمە مەهدی پەیڕەوی بە عیسا علیه السلام دەکات و دەبێتە یەکێک لەسەر بازەکانی.**

١٥ لەجابری کوڕی سمرە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : لەگەڵ باوکم چووینە خزمەتی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت گوێم لێبوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو((دَخَلْتُ مَعَ أَبِي عَلَى النبي صلى الله عليه وسـلم ، فَسَـمِعْتُهُ يَقُولُ : إِنَّ هَذَا الأَمْرَ لاَ يَنْقَضِي حَتَى يَمْضِيَ فِيهِمُ اثْنَا عَشَرَ خَلِيفَةً ، قَالَ : ثُمَّ تَكَلَّمَ بِكَلامٍ خَفِيَ عَلَيَّ ، قَالَ : فَقُلْتُ لأَبِي : مَا قَالَ ؟ قَالَ : « كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْش)) واتە: **((بێگومان ئەو کاروبارە کۆتایی نایەت تاوەکو لەوان دوازدە خەلیفە تێپەڕ نەبێت)) ووتی: پاشـان قسەی کرد بەقسەکردنێکی شاراوە لەبەر من، جابەباوکم ووت : پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت چی ووت؟ باوکم ووتی : پێغەمبەر دروودی خوای لەسـەر بێت فەرمووی ((هەمووشیان لەقورەیشن))**

موسلیم ریوایەتی کردووە.

ئیبن کثیر دەڵێت ((ئەو حەدیسە بەڵگەیەکی تێدایە لەوەی گومانی تێدانیە لەبوونی دوازدە خەلیفەی دادپـەروەر، بەڵام پێشەوایانی شیعە دوازدە کەس نین، بەڵکو زۆر لەوانە هیچ کاروبارێکیان بەوانە نەبووە، بەڵام ئەم دوازدە خەلیفەیە هەموویان لەقورەیشن و دادپەروەری دەکەن))

١٦ حەفصە رەزای خوای لەسـەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێت (( لَيَؤُمَّنَّ هَـذَا الْبَيْـتَ جَيْشٌ يَغْزُونَـهُ ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ ، يُخْسَـفُ بِأَوْسَـطِهِمْ وَيُنَـادِي أَوَّلُهُـمْ آخِرَهُـمْ ، ثُمَّ يُخْسَـفُ بِهِمْ ، فَـلاَ يَبقَى إِلاَ الشَّـرِيدُ الَّذِي يُخْـبِرُ عَنْهُمْ))

واتە: **((ئەم کەعبەیە ئەمین و ئاسوودە دەبێت سوپایەک دێت بەمەبەستی داگیرکردنی، لەکاتێکدا ئەو سـوپایە لەوپەڕی دەسەڵاتدایە لەسـەر زەوی، خوای گەورە ناوەڕاستی**

**سوپاکە لەزەویدا دەباتە خوارەوە، وە سەرەتاکەیان بانگی کۆتاییەکەیان دەکات، پاشان ئەوانیش ڕوودەچن بەزەویدا، کەسیان نامێنێتەوە مەگەر یەک کەس نەبێت هەواڵی ڕوو چوونەکەیان پێ ڕادەگەیەنێت))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

(الشريد) مانای پیاوێک لەوان دەمێنێتەوەو ڕزگاری دەبێت لەڕوو چوونەکە، وە هەواڵی ڕووچوونی سوپایەکە ڕادەگەیەنێت.

**١٧** لە ام سـلمەی دایکی ئیماندارانەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((يَكُونُ اخْتِلافٌ عِنْدَ مَوتِ خَلِيفَةٍ، فَيَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ هَارِباً إِلَى مَكَّةَ فَيَأتِيهِ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ فَيُخْرِجُونَهُ وَهُو كَارِهٌ فَيُبَايِعُونَهُ بَينَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ. وَيَبعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ مِنْ أَهلِ الشَّامِ فَيُخْسَفُ بِهِمْ بِالْبَيداءِ بَينَ مَكَّةَ وَالمَدِينةِ، فَإذا رَأى النَّاسُ ذَلِكَ أَتَاهُ أَبْدَالُ الشَّامِ وَعَصَائِبُ أَهْلِ الْعِرَاقِ فَيُبَايِعُونَهُ بَيْنَ الرُّكنِ وَالْمَقام، ثُمَّ يَنْشَأُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيشٍ أَخْوَالُهُ كَلبٌ، فَيَبْعَثُ، إِلَيْهِمْ بَعَثاً فَيَظْهَرُونَ عَلَيْهِمْ وَذَلِكَ بَعْثُ كَلْبٍ وَالْخَيبَةُ لِمَنْ لَمْ يَشْهَدْ غَنِيمةَ كَلْبٍ فَيَقسَمُ الْمَالَ وَيَعْمَلُ فِي النَّاسِ بِسُنَّةِ نَبِيِّهِم، وَيُلقِي الإِسلامُ بِجِرانِهِ فِي الأَرضِ فَيَلْبَثُ سَبْعَ سِنينَ ثُمَّ يُتَوفَّى وَيُصَلِّي عَلَيهِ الْمُسلِمُونَ – وَفِي رواية اخرى تِسْعَ سِنِينَ.))** واتە: **((ناکۆکی و ئاژاوەیەک ڕوودەدات لەکاتی مردنی خەلیفەیەکدا، لەوکاتەدا پیاوێک لەئەهلی مەدینە ڕادەکات بەرەو مەککە، کەسانێک لەخەڵکی مەککە دێن بۆلای و دەیهێننە دەرەوە بەنابەدڵی، وە بەیعەتی دەدەنێ لەنێوان ڕوکن و مقام دا، پاشان لەشکرێک لەخەڵکی شام ڕەوانەی سەری دەکرێت، لەبیابانی نێوان مەککەو مەدینە بەزەویدا دەچێتەوە خوارەوە، کاتێک خەڵکەکە ئەمە دەبینێت ئەوا پیاوچاک و لەخوا ترسەکانی شام و هەڵبژێردراوو باشەکانی ئەهلی عێراق بەیعەتی دەدەنێ لەنێوان ڕوکن و مقامدا، پاشان لەهۆزەکانی کلب پیاوێک لەقورەیش دەستێنیشان دەکات، جا سوپایەک دەنێرێتە سەریان و بەسەریاندا زاڵ دەبن، وە ئەمەش سوپای هۆزی کەڵبە وە زەرەرمەند بۆ ئەو کەسەیە کەوا غەنیمەی هۆزی کەڵب نەبینێ، جا ماڵ و سامانەکە دابەش دەکات، لەگەڵ خەڵکی بەسوننەتی پێغەمبەر محمد ﷺ، مامەڵەدەکات وەئیسلام جێگیر دەکات لەسەر زەوی و ڕێکی دەخاتەوە، حەوت ساڵ دەمێنێتەوە**



**پاشـان کژچـی دوایـی دەکات و موسـڵمانان نوێـژی لەسـەر دەکـەن، لەڕێوایەتێکـی دیکەدا نۆسـاڵ دەمێنێتـەوە))** ابودادو ریوایەتی کردووە



((بعث من اهل الشـام )) واتە: سوپایەک لەئەهلی شام.

((بالبیـداء بین مكـة والمدینة)) واتە: لەبیابانێک لەنێوان مەککەو مەدینە.

((أبـدال الشـام)) واتـە: پیاوە چاکەکانی شام.

((وعصائب اهل العراق)) واتە: پیاوەچاکـەکان و باشـەکانی خەڵکی عێراق

((اخواله کلب )) واتە: هۆزی کەڵب، بریتیە لەهۆزە بەناوبانگەکانی عەرەب.

((فیظهرون علیهم)) واتە: بەسەریاندا زاڵ دەبن و سەردەکەون بەسەریاندا.

((والخیبة)) واتە: زەرەرمەند

((بجرانـة الارض )) الجـران واتـە: بـن گـەردن، بەمانـای جێگیـر کردنی ئیسـلام و ڕێکخسـتنەوەی، بەوشـێوەی ووشـتر کە دابنیشێت لەسـەر زەوی وە گەردنی خۆی لەگەڵ زەوی تەخت بکات.

حەدیسـەکانی مەهدی جێگیرەو گومانی تێدانیە، وە سی سەحابە ڕیوایەتیان کردووە، پێشـەواکانی ڕیوایەتـی سـوننە دەریـان هێناوە، وە ڕێکیان خسـتووە، لەسـوننەت و مەسنەدەکاندا، هەندێک لەزانایان نارەزاییان دەربڕی، تاوەکو دەرکەوتنی مەهدی بووە بیروباوەڕێکی ڕێکەوتن لەسەری لەئەهلی سوننە و جەماعە.

زۆرێـک لەزانـاکان، دەفەرمـوون حەدیسـەکانی مەهـدی گەیشـتۆتە پلـەی (تواتـر) وەک ئیمـام السـفارینی، والشـوکانی، ومحمد صدیق خـان ڕەحمەتی خوایـان لێبێت.

کتاب (الاذاعة الاشراط الساعة)، ص١٤٥

## ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لەوانەی پڕوپاگەندە دەکەن کەوا ئەو مەهدیە:

لەکاتی بیرکردنەوە لەمێژوو وە شەن و کەوکردنی سەردەمەکان، وە تێپەڕبوونی موسڵمانەکان بەبارێکی پڕ لەناکۆکی و ستەم و، بڵاوبوونەوەی جەوروستەم لەلایەن سەردارو گەورەکان، دەبینین پیاوان دەرکەوتوون و بوونەتە سەردارو گەورە پێیان وابووە کەئەوان (مەهدی)ین، وە خەڵکیش باوەڕیان پێیان کردووە، لەوانەش:

١. رافزیـەکان وا ڕادەگەیەنـن کە مەهـدی لەوانەو چاوەڕێی دەکـەن و، ئەمەش دوایین خەلیفەو پێشـەوایە دوازدەکەسـەکەیە، وە لـەلای ئەوان ناوی محمد کوڕی الحسـن العسکریەو، ئەو لەلایان نەوەی ئیمام حوسەین کوڕی علی یە، نەک لەنەوەی حەسەن کوڕی عەلی خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت.




### بیروباوەڕیان وایە:

- کـە ئـەوپـیـاوە چـووەتـە ژێر زەمـیـنـی سـامـەڕاء لەماوەی زیاتر لەهەزار ساڵ، ساڵی ٢٦٠ کۆچی.
- کاتێک چووەتە نـاوی تەمەنی پێنج ساڵان بـووە، ئێستاکەش لـەو ژێـر زەمـیـنـەدا دەژیـت، نـەشـمـردووەو ناشمرێت، لەئاخری زەماندا دێتە دەرەوە.
- بیروباوەڕیان وایـە کـەوا ئەو ئامادەیە بۆجێ بەجێ کردنی بڕیارەکان، کاروباری خەڵک دەزانێت، بەڵام ئەو لەپێش چاوان نیەو نابینێت.

ئەوان قسەو گفتەکانیان گەوجیە لەسەر هیچ بەڵگەیەک دانەمەزراوە، وەهیچ سەلمێندراوێک نیە، و هیچ عەقل و بیردۆزێکی تیانیە، ئەمەش پێچەوانەی سووننەتی خودایە لەئادەمیزاددا، وە پێغەمبەرو نێردراوەکانی خودا ئەوانەن باشترین دروستکراون لەلای خودا، کەچی خوای گەورە مراندوویانن، ئایا چۆن خودای گەورە پێغەمبەرو نێردراوەکانی دەمرێنێت و کەچی

مەهدیەکی هەڵگەڕاوەو یاخی بەزیندوویی دەهێڵێتەوە بۆ ماوەی هەزار ساڵ کەوا ئەوان وای ڕادەگەیەنن!؟؟
پاشان چ پێویست بەشاردنەوەو خۆ ونکردنی ناکات لەوماوە دوورو درێژە کەچی زیندووشە؟
ئەی بۆچی نایەتەدەرەوە ئەمربەچاکەو نەهی لە خراپەبکات، وە واقعی ئوممەتی ئەمڕۆ زۆر پێویستی بەیەکێکی وا دەبێت؟!
ئیبن کثیر رەحمەتی خوای لێبێت – قسە دەکات لەبارەی مەهدی محمد کوڕی عبدالله کەلەحەدیسەکان ناوی هاتووە، دەڵێت (ئیمامی مەهدی لەڕۆژ هەڵاتەوە دەردەچێت (بەمانای مەهدی ئەهلی سوونەیە) نەک لەژێر زەمینی سامەڕاء، هەروەک نەزانەکانی شیعە واگومان دەبەن، کە ئەو ئێستا لەو شوێنەدایە، وەئەوان چاوەڕێی دەرچوونی دەکەن لەئاخری زەماندا، ئەمەش جۆرێکە لەسەر لێشواوی، وە بەشێکی زۆر گەورەیە لەشەرمەزاریەکی تووند لەشەیتان، لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەو سەلمێندراوێک لەسەر ئەم کارەدانیە، نە لەقورئان و نەلەسوننەتدا وە نەعەقڵی دروست ئەمەباوەڕ دەکات و نەهیچ پەسندکردنێک.



وێنەی ئەو ژێر زەمینەی سامەڕایە کە نەزانەکانی شیعە واگومان دەبەن کەمەهدی خۆی تێیدا حەشارداوە ماوەی زیاتر لەهەزار ساڵە

٢. عبدالله ی کوڕی سەبەء پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات کەعلی کوڕی ئەبی تالب ڕەزای خوای لەسەر بێت ئەو مەهدی چاوەڕوانکراوە، واگومان دەبات بۆ دونیا دەگەڕێتەوە.

٣. المختار کوڕی عبدالثقفی پڕوپاگەندە دەکات کەوا محمد کوڕی الحنیفە، کەلەساڵی (٨١ کۆچی) کۆچی دوایی کردووە، ئەو مەهدی چاوەڕوانکراوە، وە محمد کوڕی الحنیفە، محمد کوڕی علی کوڕی ئەبی تالیبە ڕەزای خوای لەسەر بێت، ناونراوە

بەئیبن الحنیفە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی دایکی خەولەی کچی جعفر کەوا لەهۆزی نەوەی حنیفەیە.

٤. کۆمەڵەی کەیسانیەکان، ئەوانە شوێنکەوتەی کەیسان پێشەوا عەلین ڕەزای خوای لەسەر بێت، کەکۆمەڵەیەکی شیعەن باوەڕیان بەپێشەواکەیان محمد کوڕی الحنیفەیە بەوەی کەوا هەمووی بەزانست و عیلم دەورەدراوە، وە قەولێک کۆیان دەکاتەوە کەوا دین ملکەچ کردن بۆ پیاوێکە، وەگومان دەبەن کەوا عبداللە کوڕی معاویە کوڕی عبداللە کوڕی جعفر کوڕی ابی تالب الهاشمی القریشی. مەهدی چاوەڕوانکراوە.



٥. محمد کوڕی عبداللە کوڕی الحسن کوڕی علی کوڕی ابی تالب (ناز ناوی خاوەن دەروونی پاکە، لەساڵی ١٤٥ کۆچی)) کۆچی دوایی کردووە، ڕۆژووگرێکی خۆڕاگربوو، وەلەسەر دەمی ئەودا فیتنە لەناوخەڵکدا بڵاوببۆوە، گومانیان دەبرد کە ئەو مەهدیە، کە شوێنکەوتووی زۆری هەبوو، وە هەوڵی دا بارو وەزعەکان ڕاست بکاتەوە، جا عەباسیەکان شەڕیان لەگەڵیدا کرد کەوا ئەوان باڵادەست بوون لەسەر دەمی ئەودا، لەسوپایەکدا، کەژمارەکەی (١٠,٠٠٠) جەنگاوەر بوو، وەزاڵبوون بەسەر بزووتنەوەکەی،لەو کاتەدا خاوەنی دەروونی پاک دەرکەت لەسەر المنصور خەلیفەی عەبباسی. لەکاتێکدا جەوروستەم، لەسەردەمی ئەودا بڵاوبۆوە.

٦. یەکێک لەوانەی پڕوپاگەندەی مەهدی دەکات: عبیداللە کوڕی میمون القداح، ساڵی (٣٢٥ک) کۆچی دوایی کردووە، باپیرەی یەهوودی بوو، ئەو پێشەوای (قرامطە)کان بوو کەوا موسلمانەکانی دەکوشتن و بەردەڕەشەکەیان دزی لەساڵی (٣١٧ک)، وە ئەوانە کوفرەکەیان لەجوولەکەو دیانەکان توندتر بوو.

بنەچەو نەوەکانی هێزو دەسەڵاتیان پەیداکردو، دەستیان گرت بەسەر میسرو حیجازو شام..گەڵێک درۆ دەلەسەیان خستە پاڵ ئاڵ و بەیتی پێغەمبەر ﷺ، وایان دادەنا کە ئەوان لەنەوەی فاتیمەن ڕەزای خوای لەسەر بێت ..بۆیە ناویان لێنرا فاتیمیەکان.

وە بڕیارو داوری شافعیان لابرد، قەبرو گلکۆیان دامەزراندو، موسلمانەکانیان تووشی بەلاو کارەساتێکی گەورەکرد.
(قرامطە)کان خۆیان بەموسڵمان دادەنا، بەڵام ئەوان لەڕاستیدا بێباوەڕبوون، دەرچوون لەهەموو بێزاریەک، و مەزهەبیشیان پێکهاتبوو لەمەزهەبی مەجوس کە ئاگرپەرست بوون، وە (صائبە)کانیش ئەستێرەپەرست بوون.
ابن کثیر دەڵێت ماوەی پادشایەتی فاتیمیەکان زیاتر لە ٢٨٠ ساڵ بوو، وە عبیداللە القداح پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات کە ئەو مەهدیە وە مەدینەی مەهدی بنیات دەنێتەوە))

٧. وەیەکێکی تر لەوانەی پڕوپاگەندەی (مەهدی)یاتی دەکرد، محمد کوڕی عبداللە البربری ناسراو بە (ابن تومرت)، لەساڵی (٥١٤ک) دەرکەوت و پڕپاگەندەی ئەوەی دەکرد کە ئەو عەلەویە واتە لەنەوەی علی کوڕی ابی تالیبە ڕەزای خوای لەسەر بێت . وە بنەماڵەی الحسن کوڕی علی بۆ خۆی دانا..
پاداشایەتی و گەورەیی ئەو بەزوڵم و ستەم دەستپێکرد..زۆر فرت و فێڵی بەکار دەهێنا بۆ هەڵخەلەتاندنی خەڵک تاکو واخۆی دەربخات کەوا کەراماتی هەیە، یەکێک لەوفرت و فێڵانەی : ئەو هەندێک لەپیاوەکانی خۆی لەناو گۆڕ دەشاردەوە، جا بەدوای خەڵکیدا دەناردن بۆ ئەوەی کەرامەت و نیشانەی پێ نیشان بدات، ئینجا بانگی دەکرد، ئەی مردوو وەڵام بدەرەوە، جا وەڵامیان دەدایەوەو دەیان ووت: تۆ مەهدی پاک و بێ تاوانی، هەر تۆی، پاشان بۆ ئەوەی فێڵەکە ئاشکرا نەبێت گۆڕەکانیان بەسەردا دەڕووخاندو دەیکوشتن.

٨. یەکێکی تر کەپڕوپاگەندەی ئەوەی دەکرد کە ئەو مەهدیە، محمد احمد کوڕی عبداللە السودانی، لەساڵی (١٣٠٢ک – ١٨٨٥ز) کۆچی دوایی کرد، سۆفیگەریەتی زاڵببو بەسەر سودان، وەناوبانگی بەپیاوچاک دەکرد، کاتێک تەمەنی (٣٨ساڵ) بوو پڕوپاگەندەی (مەهدی)یاتی کرد، زۆر لەسەر کردەکان و شێخی هۆزەکان بەرەو پیری چوون.
واگومانی برد کەواگومان هەیە لەمەهدی بوونی ئەو، بۆیە کوفری بەخوداو پێغەمبەرەکەی کرد جگە



لەپروپاگەندەی بەتاڵ، گوایە ئەو دەستێکی سپی هەیە لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ ئینگلیزە مەسیحیەکان.
دوای واقیع دەریخست کە ئەو (ئەو مەهدیە مژدە پێدەرە نیە کەوا لەحەدیسەکان باسکراوە)) بەڵکو ئەو تەنها یەکێکە لەو کەسانەی کە پروپاگەندەی (مەهدی)دەکەن.



٩. یەکێکی دیکە لەوانەی پروپاگەندەی مەهدی دەکات: محمد کوڕی عبدالله القحطانیە، لەریاز دەرکەوت لەمیرنشینی عەرەبی سعودی، وای باس دەکرد کەوا خەونێکی دیوە و پێیان ووتووە کە ئەو (مەهدی) چاوەڕوانکراوە، کۆمەڵێک بەیعەتیان دایی، وە لەمزگەوتی حەرام پاراستیان لەساڵی (١٤٠٠ک - ١٩٨٠ک) کەوا بە کوشتنی کۆتایی پێهات.

## لێکۆڵینەوەکان لەمامەڵەکردندا لەگەڵ ئەوانەی داوای (مەهدی) بوون دەکەن:

بەرپەرچدانەوەمان لەسەر ئەو کەسانەی داوای مەهدی)یەت دەکەن مانای ئەوە نیە، ئێمە درۆو بوختان بەو حەدیسانە دەکەین کەناوی مەهدی تێداهاتووە، نەخێر.
بەڵام .
ڕەنگە جیاوازی و جیابوونەوە بکەوێتە نێوان سەلماندن و بڕواکردن بەحەدیسەکانی مەهدی، بێگومان هەواڵەکان ڕاست و دروستی کەلەلایەن پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت بۆمان باسکراوە، لەنێوان حوکمی ئێمە کە دەڵێن فلان کەس (مەهدی)یە - لەگەڵ ئەمەش پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت کارو فەرمانەکانی ئاوا بەخۆڕایی بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو باسی نیشانەکان و بنج و بناوانی کردووە، بۆ ئەوەی ئێمە بەباشی مەهدی بناسین و هیچ گومانێک نەمێنێت، لەوانە:


مەقامی ئیبراهیم

١. ناوی مەهدی پروپاگەندە بۆ خۆی ناکات، وەکەسیش بانگ ناکات کەبەیعەتی پێبدەن، بەڵکو خەڵکەکە خۆیان بەیعەتی دەدەنێ کەچی ئەو پێناخۆشەو بەزۆر بەیعەتی دەدەنێ.
٢. ناوی مەهدی رێک وەک ناوی پێغەمبەر ﷺ ((محمد کوڕی عبدالله))
٣. ئەسڵ و نەسەبی دەگەڕێتەوە بۆ الحسن کوڕی علی ڕەزای خوایان لێبێت.
٤. سیفەتی خەڵق و دروستکراوی بەسەر دادەچەسپێت، کەوا لەحەدیسدا هاتووە (نێوچەوان پان و گەورە، لووتی باریک و ڕێک...)
٥. ئەو بارو زروفەی کە (مەهدی) تێیدا دەردەکەوێت.

- **ناکۆکی ڕوودەدات پاش مردنی خەلیفەیەک.**
- **زەوی پڕ دەبێت لەزوڵم و ستەم .**
- **سێ کەس بەشەڕدێن هەموویان کوڕی خەلیفەن.**
- **پیاوێکی چاک و لەخواترسە، زانستی شەرع و یاسای هەیە.**
- **لەمەککە دەردەکەوێت لەنێوان ڕوکن و مقام دا بەیعەتی دەدرێتێ.**

## چی وادەکات هەندێ کەس خۆیان یان کەسێکی دیکە بە (مەهدی) دابنێن؟ !؟

**کێشـەو گـرفـت**

**لەماوەی چاوپێداخشانەوە لەو داستان و چیرۆکانەی کەوا پڕو پاگەندەی (مەهدی) بوون دەکەن، دەرکەوتووە کە:**

- **هەندێکیان دەیانوویست خۆیان دەربخەن و دەسەڵات بگرنە دەست، بۆیە بەدرۆو بوختان پڕوپاگەندەی مەهدی بوونیان دەکرد، ئەمەش هیچ لە نیشانەکانی بەسەردا ناچەسپێت، وەک (عبیدالله القداح)، (وابن تومرت).**
- **هەندێکیان ناووشێوەی یان لاسایی کاروباری ئەوە دەکەنەوە، وە خەڵکیش وا گومان دەبات کە ئەو مەهدیە، وەک (محمد بن عبدالله ذی النفس الزکیه) واتە: خاوەنی دڵ و دەروونێکی پاک، جادەرکەوت و شوێنکەوتووی پەیداکرد، پاشان دەرکەوت کە ئەو مەهدی نیە، وە هەندێکیان ناوبانگی بەوە پەیداکرد، کە خەونی زۆر دەبینێت و خەڵکیش واگومانیان دەبرد کەئەو مەهدیە، وەک محمد بن عبدلله القحطانی.**

## هەڵوەستەیەک لەگەڵ خەونەکان:

خەوو خەوبینین لەوەرگرتنی یاساکان و بڕیارەکان لەناو گەڵ و ئوممەتدا پشتی پێنابەسترێت، وە نەکەمتریش لەمەیان.

شریک کوڕی عبدالله القاضی چووە لای خەلیفە مەهدی، کەوا دیتی مەهدی دڵ و دەروون گۆڕاو لێی توورە بووە، جاقاضی شریک ووتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەمە چیتە؟ مەهدی ووتی: دوێنێ شەو تۆم لەخەودیت، خۆت کزۆلەکردبوو لەسەر جێگاکەم، جاداوات کرد بۆت ڕوون بکەمەوەو هەواڵم پێ بدەیت، تۆ لێم بێزاریت و فریوم دەدەن جاشریک ووتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، سوێند بەخوا نەخەونەکەت وەک خەونی ابراهیم علیه السلام، وە نەدەربڕینەکەشت وەک یوسف علیه السلام.

ئەمەش بەرپەرچدانەوەیەکی رووتە لەشریک القاضی لەسەر خەلیفە لەکارو فەرمانێک لەپەیوەندی تاکەکەسێک هەبێت، ئەی ئایا هەست و نەستت چۆن دەبێت ئەگەر خەونەکە پەیوەندی بەدوا ڕۆژی ئوممەتێکی تەواو هەبێت.

## پیاوێک لەخەودا کوڕەکەی سەردەبڕێت جابەڕاستی سەری بڕی !!

ڕۆژێک خوێندمەوە کەوا لەئەفریقیا پیاوێک لەخەودا کەڕەکەی خۆی سەردەبڕێت، جا کاتێک لەخەوهەڵساو چووەی لای کوڕەکەی و دریژی کردو، سەری بڕی!!، وابیری دەکردەوە کەوا کوڕەکەی خۆی رزگار کردووە بەقوربانیەکی گەورە!!
هەروەک خودای گەورە حەزرەتی (اسماعیل)ی رزگار کرد بەقوربانیەکی گەورە بە((بەرانێک))!
کاتێک لەو نەزانە یان پرسیار کرد لەبارەی ئەو کارەی کردوویەتی؟ ووتی: ئەم کارەم کرد وەسوننەتێک بۆ لاسایی کردنەوەی حەزرەتی ابراهیم علیه السلام کاتێک ابراهیم لەخەودا بینی کوڕەکەی اسماعیل سەردەبڕێت، ووتی:

﴿ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿٧٧﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ ﴾ (١٠٧) الصافات/١٠١ – ١٠٧

**واتە// ((کوڕەکەم، کوڕی شیرینم بێگومان من دەمبینی لەخەونمدا کەتۆسەر دەبڕم، تۆ دەڵێی چی؟ ڕات چۆنە؟! (کوڕی چاک و خواناس وخۆگر بەزمانی شیرین) ووتی: بابە گیان هەرفەرمانێکت پێ دراوە جێ بەجێی بکە، دەمبینیت ئەگەر خوا حەز بکات، خوابیەوێت، لەئارامگرتن دەبم (١٠٢) کاتێک هەردووکیان تەسلیمی فەرمانی پەروەردگاربوون، ئیبراهیم، ئیسماعیلی بەڕوودا خستە سەرخاک، بۆ ئەوەی سەری ببڕێت (١٠٣) ئێمەش بانگمان کرد، ئەی ئیبراهیم!! (١٠٤) بەڕاستی خەوەکەت هێنایە دی، ئێمە هەرئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە (لەتاقیکردنەوەکان داسەریان دەخەین، چونکە لێبڕاون (١٠٥) بەڕاستی ئەمە خۆتاقیکردنەوەیەکی ئاشکراو روونە (١٠٦) ئێمەش قۆچێکی گەورەمان کردە قوربانی ئیسماعیل تالەجیاتی ئەودا سەری ببڕێت))**

ئەمەش مەبەستی نەزانێکە، ئایا چۆن خەونی نەزانێک وەک خەونی پێغەمبەرێکە کەوەحی بۆ دێت!!
جا ئەگەر ئەمە خەونی پیاوێکی چاک و ئیماندار بێت ئەوا حەمدو سوپاس بۆ پەروەردگارو مزگێنی پێ دەدەین، وە ئەگەر پیاوێکی خراپ بێت ئەوا پەنا دەگرین بەخودای دلۆڤان لەشەڕو فیتنەکەی، ئەوا زەرەرمەند هەر خۆیەتی.

## یاسا :

هەر کەسێک پڕوپاگەندە بۆ خۆی بکات کە ئەو (مەهدی)یە وە سیفەتەکانی مەهدی لەسەری نەچەسپا، وە دەجالیش لەزەمانی ئەودا دەرنەکەوت، ئەوا ئەو دەجالێکی درۆزنە، وە هەرکەسێکیش پڕو پاگەندەی ئەوە بکات کە (عیسای کوڕی مەریەم)ە وە دەجالیش لەپێش ئەودا دەرنەکەوتبێت ئەوا دەجالێکی درۆزنە.

## پێویستە بەدادپەروەری بڕوانێتە مەهدی بەبێ زیادە ڕەوی

مەهدی لەلای ئەهلی سووننە و جەماعەت بەپێشەوای ئوممەتی موسڵمانان دەژمێردرێت ئەوانەی دادپەروەری بڵاودەکەنەوە، وە ئەویش دوور لە هەڵەو بێ تاوان و مەعسوم نیە.
سەیری کتاب عقیده أهل الاثر فی المهدی المنتظر، للشیخ العباد بکە.

## هەندێ لەزانایان هاتنی مەهدی ڕەت دەکەنەوە لەوانەش

### • ابن خلدون

ابن خلدون بەرچەردانەوەی هەیە لەمەسەلەی مەهدی و ڕەخنە دەگرێت لەوحەدیسانەی هاتوون کەباسی مەهدی دەکەن، پاشان دەڵێت:
**(هەر وەک دەبینی لەڕەخنەدا هیچی لێ ڕزگار نابێت تەنها کەمێکی نەبێت)** سەیری مقدمە ابن خلدون (١/٥٧٤) بکە

## • محمد رشید رضا

دەڵێت: (بەڵام دژایەتی کردن و بەهەڵستکاری لەحەدیسەکانی مەهدی بەهێزتربووەو دەرکەوتووە، وەکۆک بوون و یەکدەنگی لەنێوان ڕیوایەتەکان نابووت بووە، وەبەرپەرچکاران زیاتر بووەو، گومان تێیدا دەرکەوتووەو، هەردوو شێخەکان بوخاری و موسلیم لەڕیوایەتەکانی سەحیحدا هەژمارنەکراون و، زۆر لەپێشەوایانی موسڵمانان ئەو حەدیسانەی باس لەمەهدی دەکات بەلاوازیان داناون) تفسیر المنار (٤١٦/٩)

## • احمدأمین

دەڵێت: (حەدیسەکانی مەهدی حەدیسێکی ئەفسوناوییە، لەڕاستیدا ئاکامێکی ترسناک لەژیانی موسڵماندا ڕێک دەخات)

## • عبدالله ی کوری زید ئال محمود

دەڵێت: (پڕوپاگەندەی مەهدی لەسەرەتا کەیەوە تاکۆتاییەکەی لەسەر درۆیەکی ڕاشکاوانە دامەزراوە، بڕوباروەرێکی خراپ و ناشرینیشە، لە بنچینەشدا فەرموودەیەکی ئەفسووناویە یەک لەدوای یەک دەستاو دەستی پێکراوە، لەڕاستیدا فەرموودەی درۆو سیاسی بۆ بەکار هێنراوە بۆ ترساندن و تۆقاندن)

## • محمد فرید وەجدی

دەڵێت: (ئەوەی لەحەدیسەکاندا هاتووە دەربارەی مەهدی چاوەڕانکراو، چاودێران و ئەوانەی لەنزیکەوە تەماشا دەکەن لەدڵیاندا هیچ گومانێک نیە لەپاکیەتی پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەکانی، بەڵام زیادەڕەوی و تێکەڵاویەک هەیە لەمێژووەکان و نغرۆ بوون لە زیادە ڕەویدا، وە نەزانین بەکاروباری موسڵمانان و دوورکەوتنەوە لەسوونەتەکانی خوداو هەست

کردن بەپێداچوونەوەو کۆششکردن بۆ یەکەم جار، ئەمانە حەدیسی بابەتین پیاوەکانی ئەهلی لەڕێ لادەرو هاوبیرو باوەڕەکان مەبەستیانە بیکەن بۆ هەندێ خەڵکی بانگەوازکار لەقوتابیەکانی خەلافەت لەووڵاتی عەرەب یان ڕۆژ ئاوادا)

## بیانووەکانیان لەم کارەدا:

### ١. لە قورئاندا باسی مەهدی نەکراوە نەگەرچی لەئایەتەکانی قورئاندا چەسپاوە.



وەڵام // قورئان باسی هەموو نیشانەکانی ڕۆژی دوایی نەکردووەو، باسی دەجالیشی نەکردووە، وە زەوی ڕووچوونەکانی کەڕوودەدەن لەرۆژی دوایی..زۆرشتی لەم بابەتەش، بەم جۆرە لەسوننەتەکاندا باسکراوە، جامادام ئەمە لەسوونەتەکاندا جێگیرکراوە کەوا خودای عزوجل دەربارەی پێغەمبەرەکەی دەفەرموویێت :

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ ﴾ النجم/٣ **واتە// (قسەو گوفتاریشی ئەوەی کە قورئانە لەئارەزوویاری و هەواو هەوەسەوە نیە)**

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت ((الا اني أوتيت القرآن ومثله معه)) واتە: **((خوای گەورە قورئانی بۆ ناردووم و هاوشێوەکەشی لەگەڵدایە واتە سوونەت))** بوخاری ریوایەتی کردووە

جامادام پێغەمبەر ﷺ باسیکردووە و جێگیری کردووە کەواتە لەدینیش جێگیرە.

### ٢. حەدیسەکانی لەهەردوو سەحیحی موسلیم و بوخاری نەهاتووە.

وەڵام // هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیم هەموو حەدیسەکانی پێغەمبەر درووی خوای لەسەر بێت تێدا کۆنەبۆتەوە، وە ڕیوایەتکاری سوننەش تەنها بوخاری وموسلیم نین ئەوانە پێشەوای تەواوکارانن، وە چەند ڕێگامان هەیە بۆ جیاکردنەوەی سەحیحی حەدیسەکە لەزەعیفی، ئەگەر حەدیسەکە سەحیح بێت ئەوا پێویستە لەسەرمان وەریبگرین، ئەگەر هاتوو لەهەردوو

سەحیحەکەهاتبێت یان لەجێگایەکی دیکە، پاشان بوخاری و موسلیم حەدیسەکانی مەهدیان ڕیوایەت کردووە، بەسیفەتێک بەبێ دەق لەسەر ناوەکەی هەروەک پێشتر لەحەدیسەکانی مەهدی باسکراوە.

**٣. نامانەوێت دەرگایەک بکەینەوە بۆ پڕوپاگەندەکردنی مەهدیەت.**

وەڵام // ئێمە ئەگەر کاروبارەکەمان ڕێکخست و بەرێکخستنەکانی شەرع دەرگاناکرێتەوە وەمەهدیش سیفەتێکی خەلقی و دروستکراوی هەیە بۆ زەمانی خۆی و کات و سەردەمێکی دیاریکراوی هەیە پێشتر باسکراوە – ناچەسپێت تەنها لەسەر یەک پیاو نەبێت، ئەویش مەهدی ڕاستە قینەیە.

## کۆتاییەکەی

### ئایا بڕوابوون بەمەهدی مانای کەمتەرخەمی یە بەبانگەوازو کارکردن؟

لەگەڵ پاڵەپەستۆخستنە سەر یەکتری خێروشەڕ، وە دەرکەوتنی فەسادو خراپەکاری، وەبڵاوبوونەوەیان، وەڵاوازی ویستی بانگەوازکاران بۆ خێرو چاکە لەزۆربەیووڵاتان، وەکەوتنی نائومێدی و بێهوایی لەدڵی ژمارەیەک لەموسڵمانان، و چاوەڕێی دەرچوونی مەهدی دەکەن بۆ ئەوەی پێشەوایەتیان بکات بۆ سەرکەوتن.

بۆیە کەمتەرخەم بوون لەکارو بانگەوازیداو، بێدەنگ بوون لەفەرمانکردن بەچاکەو نەهی کردن بەخراپە، وەتەمەلی کردن لەداواکردنی زانست و بڵاوکردنەوەی، بەڵام لەبازرگانی و کارو باڵەخانە دروستکردن، دەشێت یەکێک لەخۆی بپرسێت بڵێت، کارەکە لەمەخێراترە، ئەمە زەمانی دەرکەوتنی مەهدیە.

پەیڕەووپرۆگرامی شەرع لەمامەڵەکردن لەگەڵ حەدیسەکانی هاتوو لەبارەی مژدە پێدەرەکان لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی وەک:

- **حەدیسەکانی مەهدی، کەوا خوای گەورە عزوجل دینەکەی پێ سەردەخا.**

- حەدیسەکانی شەڕکردنی موسڵمانەکان و جوولەکە وەسەرکەوتن لەسەریاندا.
- حەدیسەکانی شەڕکردنی موسڵمانەکان لەگەڵ ڕۆمە مەسیحەکان، وەسەرکەوتن بەسەریاندا..وە زۆرشتی دیکەش.

## هاهەڵەکردن لەگەڵیدا دەزانین کەوا :

ئەو نیشانانەو هی دیکەش، بەوەی هەژمار ناکرێت کە دڵخۆشیە بۆ موسڵمانان، چاو ڕوونییە بۆ ئەوان، موژدەدەریشە بەوەی کە دین پارێزراوو سەرکەوتووە.

بەڵام ئێمە کاردەکەین بەوەی شەرع فەرمانی پێداوین، لەسەر خستی دین و، بەرگریکردن لەووڵاتانی موسڵمانان، وە دامەزراندنی جیهادکردن لەڕێگای خوا، وەشەڕکردن بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام.

تەمەڵ و لەش قورس دانەنیشین تاوەکو سەرکەوتن لەئاسماندا بۆمان دابەزێت، یان لە زەوی بێتەدەرەوە، بەبێ کۆشش کردن لەئێمەوە، بۆیە لەسەر موسلمانانە ئەمڕۆ خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕکردن لەگەڵ جوولەکەکان، یان دەرکردنی مەسیحیەداگیرکەرەکان لەووڵاتی موسڵمانان، وەکەمتەرخەم دانەنیشین بەڕەزیلی وبچووکی چاوەڕێی دەرکەوتنی مەهدی بکەین تاوەکو پێشەوایەتیمان بکات...بەڵکو کۆببینەوەو دینەکەمان سەربخەین چونکە دەرکەوتنی مەهدی سەرکەوتنی ئێمەیە.



# نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

## نیشـانە گەورەکان

- دەرکەوتنی دەجال
- دابەزینی عیسا سەلامی خوای لێبێت
- دەرکەوتنی یەئجووج و مەئجووج
- سێ زەوی ڕووچوونی گەورە
- دووکەڵ
- دەرکەوتنی (دابةالارض) گیاندارەکەی ژێر زەو
- هەڵاتنی ڕۆژ لەڕۆژ ئاوا
- ئاگرێک خەڵکی بۆ مەحشەرەکانیان کۆدەکاتەو




**پێشەکی**

دابەشکردنی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بۆ بچووک و گەورە باسکرا، کە (١٣١) نیشانەمان لەنیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی باسکرد، ئەوەی دەمێنێتەوە قسە کردنە لەسەر نیشانە گەورەکان کەوا پێش هەستانی ڕۆژی دوایی دەکەوێت.

نیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی وەک دەزووی مووروو وایە هەرکە گرێیەکە کرایەوە یەک بە دوای یەکدا دەکەوێت، ئەگەر نیشانەی یەکەمین ڕوویدا،- کەمەهدیە- نیشانەکانی دیکە ڕاستەوخۆ لەدوای ئەو یەک بەدوای یەکدا دێن.

لەعبدالله ی کوڕی عمرو ڕەزای خوای لەســەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((الآيات كخرزات منظومات في ســلك فانقطع الســلك فتبع بعضها بعضاً)) واتە: **((نیشــانەکان وەک دەزووی مــوورو وان هەرکــە دەزووکە پچڕا بەدوای یەکــدا دەخرێن و دەکەونە خوارەوە))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە

وەلەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((خروج الآيات بعضها على أثر بعض تتابعن كما تتابع الخرز في النظام)) واتە: **((هاتنی نیشانەکان هەندێکیان بەدوای هەندێک وەکویەک بەدوای یەکدا هاتنی دەنکە تەسبێحی پچڕاوە))** تەبەرانی ریوایەتی کردووە.

قەدەغەو بەرهەڵست نیە کە نیشانەگەورەکانی ڕۆژی دوایی بچێتە نێوان هەندێک لەنیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دوایی، بۆ نموونە مەهدی دەردەچێت پاشان لەسەردەمی ئەودا ژمارەیەک لەنیشانە بچووکەکان دەردەکەوێت،پاشان دەجاڵ دەردەکەوێت . وەهەروەها.. خودای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە.






خودای عزوجل ئەوە ی بیەوێت و هەڵیبژێرێت لەهێماکان و نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونەوە و ڕوودانی.

لەوانەش مەسیحی دە جال..

- مەسیحی دە جاڵ کێیە؟
- ئایا ئەمڕۆ دە جاڵ بوونی هەیە؟
- ئایا پێشتر کەس دە جاڵی بینیوە ؟
- سیفەت و خەسڵەتەکانی چین؟
- هۆکاری دە رچوونی چیە؟
- ئەم تووڕ بوونە گەورە یە چیە کەوا پێی تووڕ دە بێت؟
- وە بیرو باوە ڕ هەڵەکان چین دە ربارە ی؟

## دەجال کێیە؟

پیاوێکە لەنەوەی ئادەم خودای گەورە توانایەکی بەهێزی داوەتێ وە نەیداوەتە هیچ کەسێکی دیکە لەئادەمیزاد، ئەمەش خوای گەورە ڕێکی خستووە بۆ تاقیکردنەوەو شارەزابوون لەئیمانی خەڵک، وە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە لە شوێنەکەوتنی گومڕاییەکەی، و هەواڵی پێمان داوە لەسیفەتە دروستکراوو ڕەوشتەکانی .

### لێرەدا ئێمە قسە لەسەر دەجاڵ دەکەین چونکە:

زانست و زانیاریت لەسەر شتێک هەبێت باشترە لەوەی لێی نەزانیت، جارێک حوذیفە بن الیمان ڕەزای خوای لەسەر بێت پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەشەرێک ترسا لەوەی پێی بگات.

وە دەجاڵ گەورەترین فیتنەو ئاژاوەیە، پێغەمبەر ﷺ ترساوە لەسەر ئوممەتەکەی بەرامبەر دەجال، وە ئاگاداری کردۆتەوەو، ترساندوویەتی، ووریای کردۆتەوە...کاتێک لەگەڵ دەجاڵ گومان و فیتنەو ئاشووب دەردەکەوێت..لەگەڵ پڕوپاگەندە کردنی دەجاڵ کەگوایە خودای هەموو بوونەوەرە!!

جا ئەگەر ئێمە سیفەت و خەسڵەتەکانی دەجاڵمان ناسی، و ڕێگاکانی سەلامەت بوون لێی، ئەوا خوای گەورە لەشەڕی ئەو دەمانپارێزێ..

## ناونانی بە (مەسیحی دەجاڵ)

ناونراوە بەمەسیح چونکە چاوی چەپی سڕاوەتەوەو، کوێرە، نابینێت تەنها یەک چاوی نەبێت.

دەڵێن بەڵکو دەجاڵ ناونراوە مەسیح...وەهەندێکی دیکە دەڵێن (مەسیح) (مەسیخ)ە (بەخاء).

وە دەڵێت ناونراوە بەمەسیح چونکە دەست بەسەر زەوی دادەکێشی و هەمووی داگیر دەکات..

دەڵێن چونکە کەسێکی شەڕانگێزە و لەڕوخساریدا نەچاوی هەیە و نەبرۆ....

وەناونراوە دەجال: چونکە دادەپۆشێت، واتە گومڕاکەرو درۆزن و خەڵەتێنەرە، وەگەورەترین درۆزنیش، دەجاڵی درۆزنی گومڕاکەرو جادووگەرە.

## دەجال پروپاگەندەی چی دەکات؟

دەجــاڵ پروپاگەنــدەی خوایەتی دەکات، داوالەخەڵک دەکات بــاوەڕی پێبکەن، بۆیە پێغەمبەر دروودی خــوای لەســەر بێــت دەفەرموێــت ((إن الدجــال أعــور، وإن ربكم ليــس بأعور)) **واتــە: ((بێگومان دەجاڵ کوێرە، وە بزانــن کەپەروەردگارتان کوێرنیە)) بوخاری ریوایەتی کردووە لەدواییدا بەدرێژی باســی دەکەین، وەشــتی گوماناوی دەکات و خەڵکی فریودەدات دەکەونە ناو فیتنەو ئاشووبەکەی))**

## چیرۆکی ابن صیاد



وێنەیەکی کۆنی مەدینەی منەوەرە

لەســەردەمــی پێغەمبەر ﷺ منداڵێکی جوولەکە هەبوو نـاوی ابن صیاد بوو، گومـانی لـەکارو کـردەوەکـانی هەبوو، پێغەمبەریش ﷺ وایزانی کەئەمە دەجالە، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کەوتە قسەکردن، ئەمەش درێژەی گفت وگۆیەکەیە.

لەعبدوللای کوڕی (عمر ڕەزای خوای لەسەر بێت (عمری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت) لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێ کەس بۆ لای ابن صیاد ڕۆیشتن، تاکو دۆزیمانەوە لەلای قەڵای بەنی مەغالە، ابن صیادیش نزیک ببووەوە لەتەمەنی بلوغ بوون، (واتە نزیکبوونەوەی بالغ بوون: تەمەنی نزیک دەبێت لە (١٥ساڵ)، جاهەستی بەهیچ نەکرد تاکو پێغەمبەر ﷺ دەستێکی لەپشتیدا پاشان:

- **قال رسول الله ﷺ لابن صياد: اتشهد أني رسول الله؟**
- **فنظر اليه ابن صياد، فقال : أشــهد أنك رســول الأميين،ثم قال ابن صياد لرسول الله ﷺ اتشهد أني رسول الله؟**
- **فرفضــه رســول الله ﷺ وقــال: آمنت بالله وبرســله ،ثم قال له رســول الله ﷺ : ماذا ترى؟**

- قال ابن صياد : يأتيني صادق وكاذب
- فقال رسول ﷺ : خُلِّط عليك الأمر ، ثم قال له رسول الله ﷺ : (إني خبات لك خبيئاً)
- فقل ابن صياد: هو الدُّخ
- فقال له رسول الله ﷺ : اخسا فلن تعدو قدرك
- فقال عمر بن الخطاب : ذرني يا رسول الله أضرب عنقه.
- فقــال ﷺ : ان يكن هو فلن تُسـلَّط عليه (يعني إن كان ابن صيــاد هذا هو الدجّال فلن تتمكن من قتله، لأن الله قدّر وقضى أن يقلته عيسى بن مريم عليه السلام بعد نزوله)، وإن لايكنْه فلا خير لك في قتله.

واتــــە:

- پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت بەابن صیادی فەرموو ((ئایا شایەدی دەدەیت کەمن پێغەمبەری خوام؟))
- ابن صیادی سەیرێکی پێغەمبەری کردوو ووتی: شایەدی دەدەم کەتۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارانی، پاشان ابن صیاد بەپێغەمبەری ووت ﷺ: ئایا تۆش شایەدی دەدەی کەمن پێغەمبەری خوام؟
- جا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت رەتی کردەوە فەرمووی ((باوەرم هەیە بەخواو پێغەمبەرەکانی)) پاشان پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت پێی فەرموو ((چی دەبینێت؟))
- جا ابن صیادی ووتی: راستگۆیەک و درۆزنێک دێن بۆلام.
- ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((کارەکەت لێ تێکەڵ بوو، پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو((من شتێکی نهێنیم لێی شاردویتەوە؟))
- جا ابن صیادی ووتی (هو الدخ) واتە شتەکە دوخە، ابن صیاد هەوڵیدا بڵێت (الدخان) واتە: دووکەڵەکە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، ووتی (الدّخ) چونکە ابن صیاد جنۆکەی هەبوو شتەکانیان پێ دەگووتن، بەڵام نەیانتووانی ئەوان ئەوشتە ئاشکرابکەن کەلەدڵ و دەروونی پێغەمبەردابوو درووودی خوای لەسەر بێت.
- جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو ((ریسوابە رێزت لەمەزیاتر نابێت))
- ئینجا عومەری کوری خەتاب رەزای خوای لێبێت ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا رێگام بدە لەملی بدەم.

- **پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ئەگەر دەجالّ بێت تۆ ناتوانێت بیکوژی) واتە: ئەگەر ابن صیاد دەجال بێت تۆناتوانیت بیکوژیت، چونکە ئەمە قەزاو قەدەری خودای دلۆڤانە دەبێت (عیسای کوری مەریەم پاش دابەزینی بیکوژێت)، (ئەگەر ئەویش نەبێت هیچ خێرێکت دەست ناکەوێت لەکوشتنی ئەودا))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

سالم کوڕی عبدالله دەڵێت: گوێم لەعبداللەی کوڕی عمر بوو رەزای خوای لێبێت دەیگوت: پاشان پێغەمبەر ﷺ وە ابی بن کعب الانصاری دەرچوون بۆ لای ئەو دار خورمایەی کەوا ابن صیادی لێبوو تاوەکو پێغەمبەر ﷺ بەنهێنی رۆیشت بۆ لای دارخورمایەکە بەمەبەستی ئەوەی کە گوێی لە ابن صیاد بێت پێش ئەوەی هەستی پێبکات و ببینێت، جا پێغەمبەر ﷺ بینی وا ڕاکشاوە لەبەر خۆیەوە قسەدەکات، لەو کاتەدا دایکی ابن صیاد، پێغەمبەری خوای بینی ﷺ لەپەنا دار خورماکە خۆی حەشاردابوو، بە ابن صیادی ووت: ئەی صاف (کەئەمە ناوی ابن صیادە) ئەوە محمدە ﷺ ابن صیادیش یەکسەر ڕاپەڕی. جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **((لو ترکته بین)) واتە: ((ئەگەر وازی لێ بهێنابایە ئاشکرادەبوو دەجالە یان نا))** موسلیم ریوایەتی کردووە



لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت باسکراوە ابن صیاد لەدەورووبەری رێگاکانی مەدینە گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ و ابوبکرو عمر رەزای خوای لێبێت.

- **فقال له رسول الله ﷺ : اتشهد أني رسول الله؟**
- **فقال هو : أتشهد أني رسول الله؟**
- **فقال له رسول الله ﷺ : آمنت بالله وملائكته وكتبه، ماترى؟**
- **قال : أرى عرشاً على الله**
- **فقال له رسول الله ﷺ : ترى عرش إبليس على البحر، وماترى؟**

- فقال : أرى صادقين وكاذباً، أو كاذبين وصادقاً
- فقال له رسول الله ﷺ : الله لُبِّسَ عَلَيهِ، دَعْوَه.

**واتــــە:**

- پێغەمبەر ﷺ بەابن صیادی فەرموو (( ئایا بڕوادەکەیت من پێغەمبەری خوام؟))
- ابن صیادیش ووتی : تۆش بڕوا دەکەیت من پێغەمبەری خوام .
- جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((من باوەڕم هەیە بەخوداو فریشتەکانی و قورئانەکەی، چی دەبینیت؟))
- ابن صیاد ووتی : عەرشێک دەبینم لەسەر ئاودا.
- جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : ((عەرشی شەیتان دەبینیت لەسەر دەریادا، وە چیدیکە دەبینیت؟))
- ووتی : دوو ڕاستگۆو درۆزنێک، یاخود دوو درۆزن و ڕاستگۆیەک دەبینم.
- ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((شەیتان بۆ لای هاتووە کارەکەی لێ تێکەڵ بووە وازی لێبێنن)) موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەئەبی سەعیدی خودری ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : ((چووین بۆ حەجکردن، یان عەمرە وە ابن صیادیشمان لەگەڵدابوو، لامان دا شوێنێک بۆ حەوانەوە، خەڵکی پەرتەوازەبوون تەنها من و ئەو ماینەوە، زۆرترسام لێی کاتێک بیرم لەوشتانە دەکردەوە کەدەربارەی گوتراوە، جاکەل وپەلی خۆی هێناو داینا لەلای کەل و پەلی من، ووتم: گەرماکە زۆر بەتینە ئەگەر کەل وپەکەت لەژێر ئەو دارە دانابا باشتربوو، وای کرد، واتە ابن صیاد کەل وپەلەکەی خۆی گواستەوە ژێر درەختێکی دوور لەهی ئەبی سەعید، جا ئەبوو سەعید ووتی : هەندێ مەڕ بەلای ئێمەدا تێپەڕین، ئینجا ڕۆیشت و قاپێکی گەورەی شیرهێنا.

- ووتی: بخۆرەوە ئەی (ابا سەعید)!
- منیش ووتم : گەرماکە زۆر بەتینەو شیرەکەش گەرمە، مەبەستم تەنها ئەوە بوو بە دەستی ئەو نەخۆمەوە.
- جا ابن صیاد ووتی: خەریکە پەتێک بێنم و خۆم بەودارەوە هەڵبواسم تاکو دەخنکێم لەبەر ئەو قسانەی خەڵک پێم دەڵێن!! ئەی ئەبو سەعید

ئایا کەس فەرموودەکانی پێغەمبەری لێ وون دەبێت و دەشارێتەوە؟ ئێوە ئەی پشتیوان و یارمەتی دەران شارەزاترین کەس نین لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا؟ ئایا پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت نەیفەرمووە: ئەو نەزۆکەو منداڵی نابێت، لەکاتێکدا من کورەکەم لەمەدینە بەجێ هێشتووە؟ وە ئایا پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت نەیفەرمووە ئەو ناچێتە مەدینە و مەککە، وا لەمەدینە هاتووم وە نیازمە بچمە مەککە؟

- **ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : تاکو نزیک بوو بیانووی بۆ بهێنمەوە .**
- **پاشان ابن صیاد ووتی : بەڵام سوێند بەخوا من دەزانم ئەو دەجاڵە کێیە و لەکوێ لەدایک بووە وە ئێستا لەکوێیە.**
- **ئەبوسەعید ووتی : جا پێم گووت: دەک ئەم ڕۆژەت بەخۆشی نەبەیتە سەر.** (موسلیم ریوایەتی کردووە)

## ڕاستی و دروستی لەقسەو بۆ چوونی زانایان :

ابن صیاد ئەو دەجالە گەورەیە نیە کە ناوی مەسیحی دەجالە، بەڵام ئەو دەجاڵێکی گومڕاو تەلەکەبازە لەناو دەجالەکاندا، ئەو قەشەو جادووگەرە، شەیتانی لایە کاروبارو هەواڵەکانی پێ رادەگەیەنن، وەڕووداوەکانی لەکۆتایی ژیانیدا هاتووە لەگەڵ ئەبو سەعیدی خودری و لەگەڵ کەسانی دیکەدا، ئەوەی لێی بەرهەم هاتووە، ئەوەیە کەوا ئەو تەوبەی کردووە و خۆی چاککردوە، خوای گەورەش زاناترە.

## حیکمەت چیە لەباس نەکردنی دەجال لەقورئاندا

دەجال گەورەترین فیتنەیە، پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەکەی لەسەر ترساندووە، بۆیە هەموو پێغەمبەرەکان ئوومەتی خۆیان ئاگادار کردۆتەوە لێی، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێمان داوە کەلەپاش هەموو نوێژێک پەنابگرین لەفیتنەی دەجال.

خودای گەورەش عزوجل لەقورئاندا باسی نیشانەبچووک و گەورەکانی کردووە، وەک لەتبوونی مانگ، وە دەفەرموێت ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ۝١﴾ القمر/١

**((ڕۆژی قیامەت نزیک بۆتەوەو مانگیش لەت بوو)) - هەندێ ڕیوایات هەیە کە**

ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە ، خوانەناسان داوای موعجیزەیان لەپێغەمبەر کردبێت ئەویش پەنجەی موبارەکی رووەو مانگ بزواندو بەویستی خوا لەت بوو - بەڵام هەندێک لەموفەسرین دەڵێن: ئەم رووداوە لەسەرەتای بەرپابوونی قیامەتدا پێش دێت))

دەربارەی یەئجووج و مەئجووجیش، دەفەرموویێت ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ٩٦﴾ الانبياء ٦٩

((هەتا ئەو کاتەی بەربەستەکەی (ذو القرنين) لەسەر دووتیرەی یەئجوج و مەئجووج دەکرێتەوە (کەئەمەش یەکێکە لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی کۆتایی دنیا و ئەوانە ئەو کاتە لەهەموو کون و کەلێنێکەوە بەلێشاو پەیدادەبن و زۆر دەبن )) وە زۆر نیشانەی دیکە، لەگەڵ ئەمەشدا خودای گەورە بەراشکاوی ناوی دەجالی لە قورئاندا باسی نەکردووە.

جا ئایا حیکمەت چیە لەمەدا؟!.

## لەو بارەیەوە وتوویانە :

- **یەکەمیان :** خوای گەورە لەفەرموودەیەکیدا باسیکردووەو دەفەرموویێت : ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ ١٥٨﴾ الانعام/١٥٨

((لەرۆژی هاتنی هەندێک لەنیشانەکانی پەروەردگارت (وەکو دەجاڵ و الدابە وە هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاوا..) ئەو کەسەی ئەو رۆژە ئیمان و باوەر دەهێنێت، ئەو ئیمان و باوەری سوودی بۆی نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنا بێت))

وە پێغەمبەر دروودی خوای لەســەر بێت دەفەرموویێت ((ثلاث اذا خرجن لا ينفع نفساً ايمانها لم تكن آمنت من قبل : الدجال، والدابة ، وطلوع الشمس من مغربها)) واتە: ((سێ نیشانە ئەگەر دەرکەوتن ئیمان سوودی بۆی نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێت، دەجال، والدابە، وە هەڵهاتنی رۆژ لەرۆژئاوا)) ترمزی لەئەبوهورەیرە ریوایەتی کردووە)

- **دووەمان :** ئاماژە بەرووداوی دابەزینی عیسای کوری مەریەم کراوە لەقورئانی پیرۆزدا، خودا عزوجل دەفەرمویێت ﴿وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ ١٥٩﴾ النساء/١٥٩

((هیچ کەسێک نیە لەخاوەنانی کتێب، کەباوەر نەهێنێت بەعیسا پیش ئەوەی گیانی دەربچێت، بەڵکو سوێندبەخوا هەر باوەردەهێنێت پێی لەپێش مردنیدا))

وە لەفەرموودەیەکی دیکەدا خودای گەورە دەفەرموێت

وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَـٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَـٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَـٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا ﴿٦١﴾ الزخرف/٥٧ - ٦١

(( **کاتێکیش باسی کوڕەکەی مەریەم - عیسا- بەنموونە هێنرابێتەوە، دەستبەجێ قەوم و هۆزەکەی تۆ روویان وەرگێراوەو سەریان باداوە تەسلیمی حەق نەبوون (٥٧) ووتویانە ئایا پەستراوەکانی ئێمە شایانی پەرستنن یان ئەو؟! واتە - عیسا- ئەو نموونەیان بۆتۆ نەدەهێنایەوە، تەنها بۆ موجادەلەنەبێت، بەڵکو ئەوانە کەسانێک حەزبەدوژمنایەتی و ئاژاوەو ململانێی بێ سەروبن دەکەن (٥٨) ئەو عیسایە تەنها بەندەیەکی ئێمە بوو کە نازو نیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پێبەخشی و کردمانە نموونەیەکی چاک بۆ نەوەی ئیسرائیل تاشوێنی بکەون (٥٩) ئەگەر بمان ویستایە ئێوەمان دەکردە فریشتەو لەزەویدا نیشتەجێمان دەکردن و هەموو فەرمانبەردار دەبوون (٦٠) بەڕاستی لەدایک بوونی عیسا، بەبێ باوک، بەڵگەیە لەسەر قیامەت، کەواتە بەگومان مەبن لێی و باوەڕی پێ بهێنن (٦١)** ))

ڕاستیەکەی عیسا علیە السلام، دەجال دەکوژێت و ئەم قسەیە لەلایەن عیسا علیە السلام وتراوە، وەلەقسەکانی دەجالیش دا هەیە.

## ئەو حەدیسانەی بەڵگەن لەسەر دەرچوونی دەجال کەوا لەنیشانەکانی رۆژی دواییە :

لەحوذیفــەی کوڕی ئەســیدی غەفاری ڕەزای خوای لەســەر بێت دەڵێــت پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت : ((إن الساعة لاتقوم حتى تكون عشر آيات، الدخان والدجال و الدابة وطلوع الشــمس.. وطلوع الشــمس من مغربها ونزول عيســى ابن مريم ويأجوج ومأجوج وثلاثة خسوف: خسف بالمشرق وخسف بالمغرب وخسف بجزيرة العرب، وآخر ذلك نارٌ تخرج من اليمن تطرد الناس الى محشرهم)) **واتە: (( قیامەت هەڵناستێت هەتا دەنیشانە لەپێش هاتنیــدا نەبینن، پاشــان فەرمووی: دووکــەڵ و دەجال و دابە، هەڵهاتنی خــۆر لەخۆرئاواوە دابەزینــی عیســای کوڕی مەریــەم وە یەئجوج و مەئجوج وە ســێ روو چوون: رووچونێک**

**لــە رۆژ هــەڵات وە رووچونێک لەرۆژ ئاواوە رووچوونێــک لەدوورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەوانەش ئاگرێکە لەیەمەنە دێتە دەرخەڵکی راودەنێت بەرەوشوێنی حەشرکردنیان))** موسلیم ریوایەتی کردووە

وەلەئەبی هوریرەوە رەزای خوای لەســەر بێت، کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەســەر بێت دەفەرموێــت ((ثــلاث اذا خرجــن لا ينفع نفســاً ايمانها لم تكــن آمنت أو كســبت في ايمانا خيراً، طلوع الشــمس من مغربها، والدجال ودابة الأرض.)) **واتە: ((ســێ شت هەن کە هاتن ئەوا بڕواهێنان ســوودی نابێت ئەگەر لەپێشــتردا بڕوای نەهێنابێت: هەڵهاتنــی رۆژ لەرۆژ ئاواو، دەجال و، ئاژەڵەزەویەکە))** موسلیم ریوایەتی کردووە

## دەجال گەورە ترین فیتنەیە لەسەر زەوی بەتێکڕایی

لەعمرانــی کوڕی حصین رەزای خوای لەســەر بێت دەڵێت کــەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:
((ما بين خلق آدم الى قيام الســاعة خلق أكبر من الدجال، وفي رواية : أمر أكبر من الدجال))
**واتە:** ((لەنێوان دروســت کردنی ئادەم تاکو هەســتانی قیامەت هیــچ فیتنەیەک نیە لەدەجال گەورەتر)) موسلیم ریوایەتی کردووە

ئیبنــو عومــەر رەزای خوای لەســەر بێــت دەڵێت : (( إنــي لأنذركموه، وما مــن نبي إلا أنذر قومه، ولكن ســأقول لكم فيه قولاً لم يقله نبي لقومه، إنه أعور، وان الله ليس بأعور)) **واتە: ((پێغەمبەر ﷺ هەســتاو ووتاری لەناوخەڵک دا خوێندەوە، سەرەتا سوپاس وستایشی خوای پەروەردگاری کرد بەوەی کە خۆی شایســتەی ئەو وەســف و سەنایەیە، ئینجا باسی دەجالی کــردوو فەرمــووی (من ئاگادارتــان دەکەمــەوە لەدەجال، هیــچ پێغەمبەرێک نەهاتــووە، ئیلا ئوممەتەکەی خۆی لێ ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام من شتێک دەربارەی ئەو بەئێوە دەڵێم، کە هیچ پێغەمبەرێــک بەئوممەتەکــەی نەگوتووە،بیزانن و ئاگاداربن کە دەجــال چاوێکی کوێرە، خوای پەروەردگار بەهیچ شێوەیەک کوێرنیە))** بوخاری ریوایەتی کردووە

١. وە لەنەواســی کوڕی سمعان رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەســەر بێــت دەفەرموێت ((غَيْرَ الدجال أخوفني عليكــم؟ ان يخرج وأنا فيكم فأنا حجيجه دونكم، وإن يخرج ولست فيكم فامرؤ حجيج نفسه، والله خليفتي على كل مسلم))
**واتــە:** ((زۆر ترســی دەجالم لەســەرتانا هەیە، ئەگەر دەجال هەڵســاو مــن لەوناتاندا مابــووم ئەوا خــۆم بەرپەرچی دەدەمەوە ئەگەر لەژیاندا نەمابــووم و دەجال پەیدابوو باهەر کەسێک لەئێوە خۆی بەرپەرچی بداتەوە، خوای گەورە لەبری من بەسەر هەموو موسڵمانیکەوەیە)) موسلیم ریوایەتی کردووە.

## رووداوەکانی پێش دەرچوونی دەجال




- لەنافـع کوڕی عتبە کـوڕی ئەبی وقاص ڕەزای خـوای لەســەر بێـت دەڵێـت کـەوا پێغەمبەر دروودی خـوای لەســەر بێـت دەفەرموویێت **((تغزون جزيـرة العرب فيفتحهـا الله ، ثم فـارس فيفتحهـا الله ، ثـم تغـزون الروم فيفتحها الله ، ثـم تغزون الدجال فيفتحه الله)) واتـە: ((شــەڕی دوورگەی عەرەب دەکـەن خـوا ڕزگاری دەکات، پاشــان شــەڕی فارس دەکـەن خـوای گەورە ڕزگاری دەکات لەسەر دەستیاندا، پاشان شەڕی ڕۆمەکان دەکەن خوای گەورە رزگاری دەکات لەســەر دەســتتاندا، پاشان شــەڕی دەجال دەکەن خوای گەورە رزگاری دەکات لەسەر دەستتاندا))** موسلیم روایەتی کردووە
واتە : ئەو شوێنەی دەجال تیایەتی و ئەو قەومەی لەگەڵیدایە))

- لەمعـاذی کـوڕی جەبـەل ڕەزای خوای لەســەر بێت کـەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێت **((عمران بيت المقدس خراب يثرب ، وخراب يثرب خروج الملحمة ، وخروج الملحمة فتح قسـطنطينية ، وفتح القسـطنطينية خروج الدجال)) واتــە: ((ئاوەدانکردنەوەی بيت المقـدس کاول بوونی یەثریبـی بەدوادێت، وەکاول بوونی یەثریب داسـتانە گەورەکەی بەدوادادێـت، وەدەرکەوتنـی داسـتانەکە ڕزگارکردنی قوسـطنطینیەی بـەدوادا دەبێت، وەڕزگارکردنـی قوسـطنطینیەش دەرچوونی دەجالـی بەدوا دێت))** ئەحمـەد ریوایەتی کردووە.

- پێش دەرچوونی دەجال شەڕکردن لەنێوان موسلمانەکان و ڕۆمە مەسیحیەکان زۆر دەبێت، وە موسڵمانەکان سەردەکەون.

- لــەذی مخمـر – پیاوێـک لەهاوەڵانـی پێغەمبـەر ﷺ – دەلێـت کـەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمووێت **((سـتصالحون الـروم صلحا آمنا ، فتغزون أنتم وهـم عدوا من ورائكم ، فتنصرون ، وتغنمون ، وتسلمون ، ثم ترجعون حتى تنزلوا بمرج ذي تلول ، فيرفع رجل مـن أهل النصرانيـة الصليب ، فيقول : غلب الصليب ، فيغضب رجل من المسـلمين ،**

فیدقــه ، فعند ذلك تغدر الروم ، وتجمع للملحمة)) وزاد بعضهم: ((فیثور المســلمون الى اسلحتهم، فیغتسلون، فیكرم الله تلك العصابة بالشهادة)) **واته:** **((ئێوە پەیماننامەیەکی ئاشــتی لەگــەڵ رۆمدا مۆردەکەن، جا ئێــوە دەجەنگن و ئەوان دوژمنتانــن لەدواوەتانن، ئێوە سەردەکەون دەستکەوتتان بەدەست دەکەوێت و خەڵکی دەکەنە موسڵمانان، پاشان دەگەرێنــەوە، تا کو لەجێگایەکدا دادەبەزن پێی دەڵێن: مێرگی ذی تلول، ئینجا کابرایەکی گاور خاچەکە بەرز دەکاتەوەو دەڵێت خاچ سەرکەوت، بۆیە کابرایەک لەموسلمان توورە دەبێت لەملی دەدات، لەو کاتەدا رۆمەکان غەدرتان لێ دەکات و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ داستانێک))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

## وە لەحەدیسێکی دیکەدا بەدرێژی لەو شوێنە دەدوێت

لەئەبوهورەیــرەوە رەزای خــوای لەســەر بێــت کــەوا پێغەمبــەر ﷺ دەفەرموێــت


مێرگی دابق - سوریا - پێکهاتووە لەژمارەیەك دێهات

(( لا تقــوم الســاعة حتــى ینــزل الروم بالأعمــاق أو بدابق ، فیخرج إلیهم جیش من المدینة ، من خیار أهل الأرض یومئذ ، فإذا تصافــوا ، قالت الروم : خلوا بیننا وبین الذین سبوا منا نقاتلهم ،(وهذا یدل انه وقعت حروب سابقة بین المســلمین والــروم وانتصر المســلمون وســبوا من الروم وأسلم الســي وجاء یجاهد) فیقول المســلمون : لا ، والله لا نخلــي بینكم وبین إخواننا ، فیقاتلونهــم ، فینهزم ثلث (أي من جیش المســلمین) لا یتوب الله علیهم أبــدا ، ویقتــل ثلثهم، أفضل الشــهداء عند الله ، ویفتتــح الثلث ، لا یفتنون أبدا فیفتتحــون قســطنطینیة ، فبینما هم یقتســمون الغنائم ، قد علقوا ســیوفهم بالزیتون ، إذ صاح فیهم الشــیطان : إن المسیح قد خلفكم في أهلیكم ، فیخرجون ، وذلك باطل ، فإذا جاءوا الشأم خرج. )) (أي خرج المسیح الدجال)




**واتــە:** ((قیامەت هەڵناسـتێ تاوەكو ڕۆمەكان لــە (اعماق) یان لــە (دابق) دادەبەزن، جا سـوپایەک لەمەدینەوە بۆیان دەردەچێت لە باشترینی خەڵكی زەوین لەوكاتەدا، جا كاتێک هەدرووڵا بەرامبــەر یــەک ڕیزدەبــن، ڕۆمەكان دەڵێن، ڕێگە لەنێوان ئێمەو ئەو دەست درێژیكەرانــەی لای ئێــوە داڵدەدراون بەردەن تاكو بیانكوژین (ئەمە بەڵگەیە كەوا پێشتر شەڕ لەنێوان موسڵمان و ڕۆمەكان ڕوویداوە، وە موسڵمانەكانیش سەركەوتوو بوون و، لەلایەن ڕۆمەكانەوە قسەی ناشیرین كراوە، وەیەكێكیان موسڵمان بوو، وە هاتــووە جیهــاد بكات))، جا موسـلمانەكان دەڵێن، نەخێر سـوێند بەخـوا ڕێگاتان نادەین براكانمان بكوژن جا شــەڕیان لەگەڵدا دەكەن سێیەكی موسلمانەكان دەدۆڕێن و ڕادەكــەن خــوای گــەورە هەرگیـز تۆبەیان لێ وەرناگرێت، وەسێیەكەكەی تر دەكوژرێن كە گەورەترین شەهیدن لــەلای خوا، وە سـێیەكەی دیكە خوای گــەورە ســەریان دەخــات و هەرگیـز تووشــی فیتنە نابنەوە، جا قوستەنتینیە ڕزگار دەكــەن، لەكاتێكـدا خەریكـی دابەشـكردنی دەسـتكەوتەكانی جەنگن و شمشـێرەكانیان بــەدار زەیتونــدا هەڵواسیووە، كاتێک شەیتان لە نێوانیاندا هــاواردەكات، كــەوا مەسـیحی دەجال لەدواوەتانــە لەنێوكــەس و كارتانــدا، ئینجا دەردەچن، بەرەولای دەجال، ئەم هەواڵەش درۆیە، جاكاتێ گەیشتنە شام دەجال دەردەچێت)) موسلیم ریوایەتی كردووە




جێگای شــاری حەلەب لەنزیكیدا مێرگی (دابق)ە كەوا سوپای ڕۆم تێیدا دادەبەزێت وەباكوورەكەشی توركیایە كــەوا ســوپای ڕۆم ڕووبــەڕوی دەبێتــەوە، وە شــاری قسطنطینیەكەوا موسلمانەكان ڕزگاری دەكەن

## چەند ڕووداوێكی دیكەش پێش دەرچوونی دەجال دەكەوێت :

لەئەبی امامە الباهلی ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت كەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت ((وإن قبل خروج الدجال ثلاث سنوات شداد ، يصيب الناس فيها جوع شديد ، يأمر الله السماء في السنة الأولى أن تحبس ثلث مطرها ، ويأمر الأرض فتحبس ثلث نباتها ، ثم يأمر السماء، في الثانية فتحبس ثلثي مطرها ، ويأمر الأرض فتحبس ثلثي نباتها ، ثم يأمر الله السماء، في السنة الثالثة ، فتحبس مطرها كله ، فلا تقطر قطرة ، ويأمر الأرض ، فتحبس نباتها كله، فلا تنبت خضراء ، فلا تبقى ذات ظلف إلا هلكت ، إلا ما شاء الله قيل: يارسول الله ﷺ فيما يعيش الناس في ذلك الزمان؟ قال: «التهليل والتكبير والتحميد ويجزؤ ذلك عليهم مجرأة الطعام»))

**واتە:** **((لەپێش هاتنی دەجالدا سێ ساڵ نەهامەتی و گرانی تووشی خەڵك دەبێت، كەبرسیەتیەكی زۆری تێدایە، ساڵی یەكەم خوای گەورە فەرمان بەئاسمان دەكات كە سێیەكی بارانی رابگرێت و فەرمان بەزەویش دەكات كە سێیەكی ڕووەكی بگرێتەوە، پاشان لەساڵی دووەمدا فەرمان بەئاسمان دەكات دوو لەسەر سێی بارانی بگرێتەوەو فەرمانیش بە زەوی دەكات دوو لەسەر سێی ڕووەكی بگرێتەوە، لەساڵی سێیەمدا فەرمان بەئاسمان دەكات هەموو بارانی بگرێتەوەو یەك دڵۆپی لێ نابارێت وە فەرمان بەزەویش دەكات هەموو ڕووەكی بگرێتەوە و هیچ سەوزاییەكی لێ ناڕووێت، جا هەرچی ئاژەڵی سمدارە هەمووی لەناو دەچێت، مەگەر ئەوەی كە خوای گەورە نەیەوێت لەناو بچێت، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵكی لەو زەمانەدا بەچی دەژین؟! فەرمووی (لا اله الا الله والله اكبر ولله الحمد، وەكو خۆراك پێی دەژین و شوێنی خۆراك دەگرێتەوە))** ابن ماجە ریوایەتی كردووە.



## ئەو رووداوەی پێش هاتنی دەجال دەکەوێت :

ڕاشدی کوڕی سعد، دەڵێت کاتێک اصطخر رزگار کرا اصطخر: (شارێکە لەفارس لەکۆنترین و بەناوبانگترین شـارەکانی فارسـە، پادشـاکانی فارس تێیدا نیشـتەجێ بوونەو، خەزێنەو گەنجینەکانـی ئەوانـی تیادایە)، بانگکەرێـک بانگی کرد: ئایا نازانـن کەدەجال دەرچووە، جا الصعب بن جثامة پێیان گەیشت و ووتی: بۆچی وا دەڵێن: با پێتان بڵێم من گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو ((لایخرج الدجال حتی یذهل الناس عن ذکره وحتی تترك الأئمة ذکره علی المنابر)) **واتە: ((دەجال دەرناچێت تاوەکو خەڵکی باسکردن و یادی دەجال لەبیردەکەن وە تاوەکو پێشـەواو ئیمامەکان لەمینبەرەکان واز لەباسـکردنی دەجال دەهێنن))** عبدالله بن احمد ریویەتی کردووە

## سیفەت و نیشانەکانی دەجال



نموونەیەك لەسەر لێك دووری (کەوانەیی) قاچەکانی

- پیاوێکی کورتە باڵایە (رۆیشتنی عـەیـبـدارە، بـەهـۆی لـێـک دووری قاچەکانی)
- قژی لوولە (واتە پرچی نەنەرمە ، وە لووسە)
- قژی زبرە (پرچی زۆرە)
- چاوی سراوەتەوەو بەقووڵدا چووە، وەک ترێی ڕەش وایە، چاوی چەپی کوێرە.
- روخساری سوورو سپیە.
- نێوچەوانی پانە
- لـەنـێـوچـەوانـیـدا نـووسـراوە (ک ف ر) هـەمـوو کـەسێکی ئـیـمـانـداری خـوێـنـدەوار یـان نەخوێندەوار دەیخوێنێتەوە.
- نەزۆکەو منداڵی نابێت



نموونەیەك لەسـەر لوول و گرژی قژی سـەر

(دەکرێت هەموو وەسفەکانی دەجال کۆبکەینەوە بەوەی کەوا پیاوێکی کورتە باڵایە، لاشەیەکی کەتەو گەورەی هەیە، سەری گەورەیە، هەردوو چاوەکانی خەوشدارە، چاوی ڕاستەی پڕگۆشتی داپۆشراوە، وەک ترێی ڕەش وایە و چاوی چەپی کوێرو بەگۆشت داپۆشراوە، خاوەنی قژێکی زۆرو لوولدراوە، دەم و چاوی سوورو سپیە، قاچ و ڕانەکانی لێک دوورن، لەنێوچەوانی نووسراوە کافر)

## شوێنی دەرچوونی :




لەئەبی بەکر ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی **((إن الدجال يخرج من أرض بالمشرق، يقال لها: خراسان، يتبعه أقوام كان و جوههم المجان المُطرقة))** **واتە: ((دەجال لەشوێنێ دەردەچێت لەلای ڕۆژ هەلاتەوەیە، پێی دەڵێن، خراسان ئەو گەلانەی شوێنی دەکەون رووخسارییان گزشتنە دەلێی بەقەلغان داپۆشراوە))** ئەحمەد و ترمذی ڕوایەتیان کردووە

یەکەم جار کەدەردەکەوێت و ناوبانگ پەیدا دەکات لەنێوان شام و عێراق دا دەبێت – خوای گەورەش لەهەمووکەس زاناترە.

وە لەڕیواتێکی دیکەدا لەنواسی کوڕی سمعان ڕەزای خوای لەسەر بێت دەربارەی دەجال دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت **((خارج خلة بين الشام والعراق))** **واتە: ((دەجال لەنێوان شام و عێراقەوە دەردەکەوێت))** موسلیم ریوایەتی کردووە

## چیرۆکی جەساسەو دەجال

لەعامری کوڕی شراحیل کەوا پرسیاری لەفاتیمەی کچی قەیس ڕەزای خوای لەسەر بێت کرد، پێی ووت: حەدیسێکم بۆ بگێڕەوە کە لەپێغەمبەرت دروودی خوای لەسەر بێت بیستبێت تەنها بەخۆت و کەس گوێی لێ نەبووبێ، فاتیمە ووتی: ئەگەر دەتەوێت بۆت دەگێڕینەوە، عامر **پێی گووت**: بەڵی بۆم بگێڕەوە، جا فاتیمە ووتی : گوێم لەبانگەوازکارێکی پێغەمبەر ﷺ بوو بانگی دەکرد (الصلاة جامعة) **واتە :** وەرن بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، منیش دەرچووم بۆ مزگەوت، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا نوێژم کرد، وە من لەڕیزی ئافرەتان بووم کە دەکەونە

دواوەی ڕیزی پیاوان، کاتێ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت لەنوێژەکەی بووەوە لەسەر مینبەرەکە دانیشت و زەردەخەنەی دەهاتێ :

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((باهەر کەسێک لەجێی نوێژەکەی خۆی دانیشێت))، پاشان فەرمووی

- فقال لَيَزم كلُّ انسان مُصلاه، ثم قال: أتدرون لم جمعتكم ؟
- قالوا : الله ورسوله أعلم
- قال : إني والله ما جمعتكم لرغبة ولا لرهبة ، ولكن جمعتكم ، لأن تميما الداري كان رجلا نصرانيا ، فجاء فبايع وأسلم ، وحدثني حديثا وافق الذي كنت أحدثكم عن مسيح الدجال، حدثني أنه ركب في سفينة بحرية، مع ثلاثين رجلا من لخم وجذام ، فلعب بهم الموج شهرا في البحر ، ثم أرفئوا إلى جزيرة في البحر حتى مغرب الشمس ، فجلسوا في أقرب السفينة فدخلوا الجزيرة فلقيتهم دابة أهلب كثير الشعر ، لا يدرون ما قبله من دبره ، من كثرة الشعر.



- فقالوا : ويلك ما أنت ؟
- فقالت : أنا الجساسة
- قالوا : وما الجساسة ؟
- قالت : أيها القوم انطلقوا إلى هذا الرجل في الدير ، فإنه إلى خبركم بالأشواق
- قال : لما سمت لنا رجلا فرقنا منها أن تكون شيطانة ، قال : فانطلقنا سراعا ، حتى دخلنا

الدير ، فإذا فيه أعظم إنسان رأيناه قط خلقا ، وأشده وثاقا ، مجموعة يداه إلى عنقه ، ما بين ركبتيه إلى كعبيه بالحديد.

- قلنا : ويلك ما أنت ؟
- قال : قد قدرتم على خبري ، فأخبروني ما أنتم ؟
- قالوا : نحن أناس من العرب ركبنا في سفينة بحرية ، فصادفنا البحر حين اغتلم فلعب بنا الموج شهرا ، ثم أرفأنا إلى جزيرتك هذه ، فجلسنا في أقربها ، فدخلنا الجزيرة ، فلقيتنا دابة أهلب كثير الشعر ، لا يدرى ما قبله من دبره من كثرة الشعر.
- فقلنا : ويلك ما أنت ؟
- فقالت : أنا الجساسة
- قلنا : وما الجساسة ؟
- قالت : اعمدوا إلى هذا الرجل في الدير ، فإنه إلى خبركم بالأشـــواق ، فأقبلنا إليك سراعا ، وفزعنا منها ، ولم نأمن أن تكون شيطانة
- فقال : أخبروني عن نخل بيسان
- قلنا : عن أي شأنها تستخبر ؟
- قال : أسألكم عن نخلها ، هل يثمر ؟
- قلنا له : نعم
- قال : أما إنه يوشك أن لا تثمر
- قال : أخبروني عن بحيرة الطبرية
- قلنا : عن أي شأنها تستخبر ؟
- قال : هل فيها ماء ؟
- قالوا : هي كثيرة الماء ،


بەیسان



- قال : أما إن ماءها يوشك أن يذهب
- قال : أخبروني عن عين زغر
- قالوا : عن أي شأنها تستخبر ؟
- قــال : هــل في العين مــاء ؟ وهل يزرع
- أهلها بماء العين ؟
- قلنا لــه : نعم ، هي كثيرة الماء ، وأهلها يزرعون من مائها
- قــال : أخبرونــي عــن نــبي الأميين ما فعل؟
- قالوا : قد خرج من مكة ونزل يثرب ،
- قال : أقاتله العرب ؟
- قلنا : نعم ،
- قــال : كيف صنع بهم ؟ فأخبرناه أنه قد ظهر على من يليه من العرب وأطاعوه
- قال لهم : قد كان ذلك ؟
- قلنا : نعم
- قــال : أمــا إن ذاك خير لهم أن يطيعــوه ، وإني مخبركــم عــني ، إنــي أنا المســيح ، وإني أوشــك




بحيرة طبرية

بيسان






أن يـؤذن لي في الخروج ، فأخرج فأسـير في الأرض فلا أدع قريـة إلا هبطتها في أربعين ليلـة غير مكة وطيبـة، فهما محرمتان علي كلتاهما ، كلمـا أردت أن أدخل واحدة - أو واحدا - منهما اسـتقبلني ملك بيده السيف صلتـا ، يصدني عنهـا ، وإن على كل نقب منها ملائكة يحرسونها

- ثم قـال ﷺ: وطعن بمخصرتـه في المنبر : «هـذه طيبة ، هذه طيبـة ، هذه طيبة».. -يعنـي المدينـة - ألا هـل كنـت حدثتكم ذلك؟
- فقال الناس : نعم
- قـال ﷺ : فإنه أعجبني حديث تميم ، أنه وافق الذي كنت أحدثكم عنه، وعـن المدينة ومكـة ، ألا إنه في بحر الشام ، أو بحر اليمن ، لا بل من قبل المشرق ما هو ، من قبل المشرق ما هو من قبل المشرق ، ما هو « وأومأ بيده إلى المشرق.
- قالت : فحفظت هذا من رسول ﷺ



**واتە:**

- **فەرمووی :** ئایا دەزانن بۆ ئێوەم کۆکردەوە؟
- **ووتیان :** خواو پێغەمبەرەکەی دروودی خوای لەسەر بێت دەزانن .
- **فەرمووی :** سوێند بەخوا لەبەر هیچ هاندانێک و هیچ ترسانێک ئێوەم کۆنەکردۆتەوە بەڵام لەبەر ئەوەی ئێوەم کۆکردۆتەوە چونکە (تمیم الداری) – کابرایەکی گاور بوو پاشان هات و بەیعەتی داو موسلمان بوو، قسەیەکی بۆ کردووم هاوشێوەی ئەوەیە کە من بۆم باسی کردوون، سەبارەت بەمەسیحی دەجال، باسی بۆ کردم کەسواری کەشتیەکی دەریایی بووە لەگەڵ سێ پیاو لەهۆزی (لخم و جذام)، جا شەپۆلی دەریاکە رێگە گۆری کردن و یاری پێکردن بۆ ماوەی مانگێک، پاشان پەنایان برد بۆ دورگەیەک لەدەریاکە تاکو رۆژ ئاوابوون، لەنزیک کەشتیەکە دانیشتن و پاشان چوونە ناو دوورگەکە، جا ئاژەڵێکی تووکنیان پێ گەیشت لەبەر زۆری تووکەکەی پێش و پاشی ئاژەڵەکە یان لێک جیا نەدەکردەوە.
- **ووتیان :** ماڵ وێران! تۆ کێیت؟
- دەعبایەکە **ووتی :** من جەساسەم!!
- **ووتیان :** جەساسە چیە!
- **ووتی :** برۆن بۆ لای ئەو پیاوەی وا لەم پەرستگایەدایە، چونکە ئەو بۆ هەواڵی ئێوە تامەزرۆیە.
- **ووتی :** کاتێ کەباسی ئێمەی کرد دەربارەی پیاوەکە لێی ترساین نەوەک شەیتان بێت، جا رۆیشتین تا گەیشتینە پەرستگاکە کەبینیمان گەورەترین پیاو زۆر بەتووندی بەستراوەتەوە، هەردوو دەستەکانی لەملی و نێوانی هەردوو ئەژنۆکانی و گۆزەنگی بەئاسن.
- **ووتمان :** ئەی ماڵ وێران! تۆکێیت؟
- **ووتی :** ئەوا توانیتان هەواڵم بزانن جا پێم بڵێن ئێوە کێن؟
- **ووتمان :** ئێمە چەند کەسانێکی هۆزی عەرەبین، سواری کەشتیەکی

دەریایی بووین، شەپۆلی دەریا مانگێک یاری بەئێمە کرد پاشان پەنامان هێنایە بەر دوورگەکەی ئێوە، لەنزیکیەوە دانیشتین دوایی هاتینە نێو دوورگەکەو چاومان کەوت بە ئاژەڵێک کەزۆر تووکن بوو پێش و پاشی نەدەناسرایەوە لەبەر زۆری مووەکانی.

- پێمان ووت: ماڵ وێران! تۆکێیت؟
- ئەو گووتی : من جەساسەم.
- ووتمان: جەساسە چیە؟
- ووتی : برۆن بۆلای ئەم پیاوە لەپەرستگادا لەبەر ئەوەی زۆر بۆ هەواڵی ئێوە تامەزرۆیە جا بەپەلە هاتینە لای تۆ، لێشی دڵنیانین لەوانەیە شەیتان بێت.
- جاووتی : هەواڵم پێبدەن دەربارەی دارخورماکانی بەیسان؟
- ووتمان : دەربارەی چ شتێک دەپرسیت؟
- ووتی: پرسیارتان لێ دەکەم لەبارەی دارخورماکە ئایا بەردەگرێت؟
- پێمات ووتی : بەڵێ
- ووتی : هێندەی نەماوە بەرنەگرێت.
- ووتی ((واتە : دەجالەکە)) : هەواڵم پێبدەن دەربارەی دەریاچەی (طبرية)
- ووتمان : دەربارەی چ شتێک دەپرسیت؟
- ووتی : ئایا ئاوی تێدایە؟
- ووتمان : ئاوی گەلێک زۆرە.
- ووتی : خەریکە ئاوەکە بڕوات و نەمێنێت.
- ووتی : هەواڵم بدەنێ لەبارەی کانیاوەکەی (زغر)
- ووتمان : دەربارەی چی دەپرسیت؟
- ووتی : ئایا کانیاوەکە ئاوی تێدایە و خەڵکەکەشی بەئاوەکەی کشت و کاڵ دەکەن؟
- ووتمان : بەڵێ ئاوی زۆرە و خەڵکەکەش بەئاوەکەی کشت و کاڵ دەکەن.
- ووتی : هەواڵم بدەنێ دەربارەی پێغەمبەرە نەخوێندەوارەکە چی کردووە؟

- ووتمان : لەمەککە دەرچووەو لە (یەثریب) نیشتەجێ بووە؟
- ووتی : ئایا عەرەب شەڕیان لەگەڵ کرد؟
- ووتمان : بەڵێ
- ووتی : جا ئەو چی لەوان کرد؟
- ئێمەش هەواڵمان دایێ: کە ئەو سەرکەوتووە بەسەر ئەوانەی لێیەوە نزیکن لەعەرەب وە ئەوانیش گوێڕایەڵی بوون.
- پێی ووتن: مانای ئەمە ڕووی داوە؟
- ووتمان : بەڵێ
- ووتی : چاکتروایە ئەوان گوێڕایەلی بن، منیش خەبەرتان دەدەمێ من کێم؟
- ووتی: من مەسیحی دەجالم، خەریکە مۆڵەتی دەرچوونم پێبدرێت، دەرچم و بەزەویدا بڕۆم هیچ گوندو دێهاتێک نەهێڵمەوە کە دانەبەزم بۆی لەماوەی چل شەودا جگە لەمەدینە و (طیبة) نەبێت، واتە مەدینەی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت - چونکە ئەو دووشارە هەردووکیان لەمن قەدەغەکراون، هەرجارێ بمەوێ بچمە ناو یەکێکیان فریشتەیەک بەشمشێرەکەیەوە بەرهەڵستیم لێدەکات، چونکە لەسەر هەر ڕێگاو بانێکی مەدینە فریشتە پاسەوانی دەکات.
- پاشان فاتیمەی کچی قەیس - کە حەدیسەکەی دەگێڕایەوە -
- پاشان پێغەمبەر ﷺ - لەکاتێکدا بەدار دەستەکەی دەستی دەیدا لەدوانگەکە - فەرمووی: (ئەمە (طیبة)یە، ئەمە (طیبة)یە، ئەمە (طیبة)یە (واتە: مەدینەیە)، ئایا من لەو بارەوە قسەم بۆ کردوون؟ ))
- جا خەڵکەکە ووتیان : بەڵی
- پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((بەڕاستی قسەکەی (تەمیم)م پێخۆشبوو، وەسەرسامی کردم چونکە لەگەڵ قسەکەی مندا یەکدەگرێتەوە کەپێشتر پێم ووتبوون دەربارەی دەجال وە لەبارەی مەککەو مەدینە، جا ئاگادارین کەوا دەجاڵ لەدەریای شامە، یاخود لەدەریاری یەمەنە،

نەخێر بەڵکو بەرووی ڕۆژهەڵاتەوەیە، بەڵێ لەرۆژهەڵاتەوە دێت، بەڵێ لە ڕۆژهەڵاتەوە دێت.

- فاتیمە ووتی : ئەمەم لەپێغەمبەری خودا درووودی خوای لەسەر بێت لەبەر کردووە . (موسلیم ڕیوایەتی کردووە)
- هەندێک نوسراوم خوێندۆتەوە دەربارەی مەسیحی دەجال، قسەکان بەستنەوەی شوێنی بوونی مەسیحی دەجال و نێوان سێ گۆشەی بەرمۆدای بەناوبانگ دادەنێن کەوا هێشتا نهێنیەکە ڕاستیەکەی ڕۆن نەبۆتەوە.

## ڕاستی سێ گۆشەی بەرمۆدا وەپەیوەندی لەگەڵ مەسیحی دەجال:

قسەوگفت و گۆ لەبارەی (سێ گۆشەی بەرمۆدا) وەک قسەکردنێکە لەبارەی چیرۆکە ئەفسوناوی چیرۆکە خەیاڵیەکان.

### شوێنی جوکرافی :




ڕۆژ ئاوی ئۆقیانووسی ئەتلەسی رووەو باشووری ڕۆژهەڵات لەوولایەتی فلۆریدا لەوویلاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، وە ئەم ناوچە زیاتر شێوەیەکی سێ گۆشەی وەردەگرێت لەرۆژ ئاوای کەنداوی مەکسیک درێژ دەبێتەوە بۆ دوورگەی لیۆرد لەباشوور، پاشان بەرەو کەنداوی مەکسیک تادوورگەی باهاما دەکشێت.

سێ گۆشەی بەرمۆدا (پێک هاتووە لەکۆمەڵێک دوورگە کە ژمارەیان (٣٠٠) دوورگەی بچووکە، ژمارەی دانیشتوانەکانی (٦٥,٠٠٠ کەسە) .






نەخشەیەك شوێنی خۆراسان لەرۆژهەڵات رووندەكاتەوە، كە دەجاڵ لەوێدا دەردەكەوێت، شوێنی سێ گۆشەی بەرمۆداش لەرۆژئاوا كەوا هەندێ كەس باوەڕیان وایە مەسیحی دەجاڵ لەوێیە.

## خاڵی وونبوون لەبەر مۆدا




لەناوچەیەكی دیاریكراوی باكووری رۆژ ئاوای ئۆقیانووسی ئەتلەسی (دەریای سارجاسۆ)، ئاوەكەی بەبوونی جۆرێكی دیاریكراو لەلێشاوێكی دەریایی جیا دەكرێتەوە پێی دەڵێن (سارجاسام)، كەوا برێكی زۆر بارستایی لەسەر دەستەو دامەزراوەی كەشتیەكە بەرزدەكاتەوەو دەبێتە هۆی پەكخستنی جوولەو ماكینەی كەشتیەكە.

وە دەریای (سارجاسۆ) بەبێدەنگیەكی تەواو

دەناسرێتەوەو، تەوژمی هەواو بایە بەهێزو بەدەگمەنەکان لەوێدا هەڵدەکات.
وە ناوی لێنراوە (دەریای تۆقێنەر) یان (گۆڕستانی ئەتلەسی)، وە سەفەرو گواستنەوەی لێکۆلینەوەکان ئاماژە بەوەدەدات بەبوونی چەندەها کەشتی و پاپۆرو کەشتی ژێرئاو نوقم بوون لە قووڵایی دەریاداو، مێژووەکانیش بۆ ماوەی کاتە جۆراو جۆرەکان دەگەڕێتەوە.

## سەرەتای ئاشکرابوونی وونبوون لەبەرمۆدا:




لەساڵی ١٨٥٠ زایینی لەو ناوچەیەدا یان نزیکی ئەو ناوچەیە زیاتر لە (٥٠کەشتی) وون بووە، هەندێک لەپێشەنگ و بەرپرسی کەشتیەکان توانیوویانە لەساتە ترسناکەکاندا نامەو پەیام بنێرن، ئەمەش بەنادیارو ئالۆزی دەمایەوە هیچ کەسێک نەیدەتوانیت تێی بگات.

وە زۆربەی ئەو پاپۆرو کەشتیانەی وونبوون دەگەڕێتەوە بۆ وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کەشتی (ئەنسرجینت) کەوا وونبوو (٣٤٠کەس) لەسەر پشتی کەشتیەکە بوون، وە لەدوایی ئەو کەشتی ژێرئاو (ئەسکۆربیۆن) لەساڵی ١٩٦٨ زایینی وونبوو لەسەر پشتی کەشتیەکە (٩٩) کەس دەریاوانی تێدا بوو.



## دیاردەی وونبوونی فرۆکەکان:



چالاکی وونبوون گەیشتەئاسمانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی، بەجۆرێک دیاردەی ونبوونی فرۆکە ئەوانەی کەوا لە ئاسمانی ئۆقیانووسی ئەتڵەسی یان بەتایبەتی لەئاسمانی بەرمۆدا دەسوڕێتەوە.
لەساڵی ١٩٤٥ زایینی لەفلۆریدای ئەمریکا پێنج فرۆکە دەرچوون و ئەم پێنج فرۆکانە لەیەکتر نزیک بوون لەسەر شێوەی سێ گۆشە دەفڕین، بەرەو پارچەکانی کەشیتەک کەسەر ئاو کەوتبوون لەسەر ئۆقیانووسی ئەتلەسی، لە کات و ساتی چاوەڕێ کردنی فرۆکە خانە بۆ ناردنی پەیامێک لەو شوێنەی لێی دەرچووە دیاریکردنی ئەو فرگەیەی کەپێی دەگات ڕێنمایی کردنی نیشتنەوەی فرۆکەکە، لەو کاتەکە بەرپرسی فرۆکەخانە نامەیەکی غەریبی پێگەیشت لەفرۆکەوانەکە دەڵێت ((فەرماندە (ملازم تشارلز تیلۆر) بەرپرسی فرۆکەخانە، ئێمە لەحاڵەتێکی لە ناکاوداین، وا هەستدەکەین ئێمە بەتەواوەتی لەدەرەوەی هێلی ڕۆیشتنبین (ناتوانم زەوی ببینم، ناتوانم شوێنەکەم دەستنیشان بکەم) وابزانم ئێمە لەئاسماندا وون بووین، هەموو شتێک نامۆو شپرزەیە بەتەواوەتی، ناتوانم هیچ ئاڕاستیەک دەستنیشان بکەم تاوەکو ئەو ئۆقیانووسەی لەپێشماندایە لەبارێکی زۆر غەریبدایەو ناتوانم دەستنیشانی بکەم)) لەپاشاندا پەیوەندی نێوان فرۆکەخانەو فرۆکەوانەکە پچڕا.
هەروەها زۆر فرۆکەی دیکەش وونبوون.

## لێکدانەوەکان کەوا مەتەڵی ئەو سێکۆشەیە ڕاڤەدەکات:




- بیردۆزی بوومەلەرزەکان وەپەیوەندیەکەی بە رووداوەکانی سێگۆشەی بەرمۆدا، دەڵێت کەوا ڕوودانی بوومەلەرزە لەقووڵایی ئۆقیانووسدا شەپۆلی بەرزو ترسناک و لەناکاو دروستدەکات، وا لە کەشتیەکان دەکات نقوم بێت و بەماوەیەکی کەم بچێتە قوڵایی ئۆقیانووسەکەو،

بەنیسبەت فڕۆکەکانیش ئەوا ئەو لەرزین و شەپۆلانە لە ئاسماندا دروستدەکات، جا دەبێتە تێکچوونی پارسەنگی فڕۆکەکە لەوکاتەدا فڕۆکەوانەکە ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات.





لافاوی تسۆنامی لەساڵی ٢٠٠٤ لە ئەندۆنیسیاو دەوروبەری لەئەنجامی بوومە لەرزە یان رۆچوونی زەوی لەقولایی ئۆقیانووسدا

- بیردۆزی ڕاکێشانی موگناتیسی وەپەوەندی لەگەڵ رووداوی سێگۆشەی بەرمۆدا، ئامێری پێوانەکردن لەفڕۆکەکاندا لەکاتی رۆیشتنی بەسەر سێگۆشەی بەرمۆدا دەشلەژێت وەبەشێوەیەکی کوێرانەو عەشوائی دەجووڵێت، وەهەروەها لە قیبلەنوماکانی کەشتیەکەش کاردەکات و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی هێزێکی موگناتیسی یان هێزێکی ڕاکێشانی تووندو غەریب و نامۆ.



یەکێك لەشێوەکانی ئامێری پێوانەکردن لەفڕۆکەکاندا




یەکێك لەشێوەکانی قیبلە نومای کەشتیەکان

# رووداوەکانی پێش دەرچوونی مەسیحی دەجال:

## کەم بوونی عەرەب:



ام شریک دەڵێت کەوا گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو ((ليفرن الناس من الدجال في الجبال، قالت ام شريك: يا رسول الله فأين العرب يومئذ؟ قال هم قليل)) **واتە: ((خەڵک لەترسی دەجال بەرەو چیاکان رادەکەن)) ام شریک ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی عەرەب لەو رۆژەدا کەکوێن؟ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی ((ئەوان کەمن))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

## داستان و رزگارکردنی قوسطنطینیه (ئەستەمبۆل) :

لەمعاذی کوڕی جەبەل ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((عمران بيت المقدس خراب يثرب ، وخراب يثرب خروج الملحمة ، وخروج الملحمة فتح قسطنطينية ، وفتح القسطنطينية خروج الدجال)) **واتە: ((ئاوەدانکردنەوەی بيت المقدس کاول بوونی یەثریبی بەدوادا دێت، وە کاول بوونی یەثریب دەرکەوتنی داستانەکەی بەدوادادێت، دەرکەوتنی داستانەکە رزگارکردنی قوسطنطینەی بەدوادادێت، وەرزگار کردنی قوسطنطینیەش دەرکەوتنی دەجالی بەدوادا دێت))** ئەحمەد و ابوداود و ترمذی

## رزگارکردنەکان :

لەنافعی کوڕی عتبە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دابووین.. چوار ووشەم لێی لەبەر کرد کەبەدەستی ژماردی و فەرمووی ((تغزون جزيرة العرب فيفتحها الله ، ثم فارس فيفتحها الله ، ثم تغزون الروم فيفتحها الله ، ثم تغزون الدجال فيفتحه الله)) **واتە: ((هێرش دەکەنە سەر دوورگەی عەرەب و خوای گەورە سەرتان دەخات، پاشان هێرش دەکەنەسەر فارسەکان، خوای گەورە سەرتان دەخات، پاشان هێرش دەکەنەسەر دەجال، خوای گەورە سەرتان دەخات))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

## ڕاگرتنی باران بارین و ڕووەک و سەوزایی:

**لەپێش دەرچوونی دەجالدا سێ ساڵ ووشکە ساڵی و گرانی دەبێت.**

لەئەبـی امامە الباهلی رەزای خوای لەسـەر بێت کەوا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموویت ((إن قبل خروج الدجال ثلاث سـنوات شداد ، يصيب الناس فيها جوع شديد ، يأمر الله السماء في السنة الأولى أن تحبس ثلث مطرها ، ويأمر الأرض فتحبس ثلث نباتها ، ثم يأمر السـماء ، في الثانية فتحبس ثلثي مطرها ، ويأمر الأرض فتحبس ثلثي نباتها ، ثم يأمر الله السـماء ، في السـنة الثالثة ، فتحبس مطرها كله ، فلا تقطر قطرة ، ويأمر الأرض ، فتحبس نباتها كله ، فلا تنبت خضراء ، فلا تبقى ذات ظلف إلا هلكت ، إلا ما شاء الله )) **واتە: ((لەپێش هاتنی دەجال سێ ساڵ خەڵکی تووشی برسیەتی و نەهامەتی دەبێت کە برسیەتیەکی زۆری تێدایە، ساڵی یەکەم خوای گەورە فەرمان بەئاسمان دەکات سێیەکی بارانی ڕابگرێت و، فەرمان بەزەویش دەکات سێیەکی ڕووەکی بگرێتەوە، پاشان لەساڵی دووەم فەرمان بەئاسمان دەکات دوولەسەر سێی بارانی بگرێتەوە فەرمانیش بەزەوی دەکات دوو لەسەر سێی ڕووەکی بگرێتەوە، وە لەساڵی سـێیەمدا فەرمان بەئاسـمان دەکات هەموو بارانی بگرێتەوە، وەیەک دڵۆپی لێ نەبارێت، وە فەرمـان بەزەویـش دەکات هەموو ڕووەکی بگرێتەوە، وەهیچ سـەوزاییەکی لێ نەڕوێت، جا هەرچی ئاژەڵی سمدارە هەمووی لەناو دەچێت، مەگەر ئەوەی کەخوای گەورە نەیەویت لەناو بچێت))** ابن ماجە ریوایەتی کردووە.



٦٦ ٦٧

# بەرزبوونەوەی نرخی مارەیی ئافرەت پاشان دابەزینی - بەرزبوونەوەی نرخی ئەسپ و وولاخەبەرزە پاشان دابەزینی

خارجەی کوڕی الصلت البرجمی دەڵێت ((لەگەڵ عەبدوللا لەماڵەکەی دەرچووین و پێش نوێژیش لەکرنووش دابوو جا ئێمەش کرنووشمان برد پاشان ڕۆیشتین تاوەکو گەیشتین بەریزەکە ئینجا پیاوێک بەوێدا تێپەڕی و ووتی : سەلامت لێبێ ئەی باوکی عەبدولرەحمان، ئینجا ووتی: الله اکبر خوداو پێغەمبەرەکەی راستیان فەرمووە کاتێک نوێژەکەمان تەواو کرد ووتمان: ئەی باوکی عەبدولرەحمان وەک ئەوەی ئەو پیاوە بیناسیت سەڵام کردنەکەی تایبەت بوو بەتۆ؟ ووتی: بەڵێ پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت دەیفەرموو: لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە مزگەوتەکان ببنە جێگای حەوانەوەوکاری تایبەتی، وە پیاو تەنها سەلام لەپیاوێک دەکات کە بیناسێت، ئافرەت و پیاو پێکەوە، بازرگانی دەکات، وە هەروەها نرخی مارەیی ئافرەت و نرخی ئەسپ و وولاخە بەرزە بەرز دەبێتەوە پاشان دادەبەزێت و چیتر بەرز نابێتەوە)) حاکم ریوایەتی کردووە



٦٨

# لێک نزیک بوونەوەی بازاڕەکان

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە بەو سەردەمەی ئێمە کەوا دووریەکان لێک نزیک دەبێتەوە ڕۆیشتن لەبازاڕێکەوە بۆ بازاڕێکی دیکە ئاسان دەبێت بەماوەیەکی کورت مرۆڤ دەتوانێ لەبازاڕە جیهانیەکاندا بسووڕێتەوەو، بزانێت چی ڕوویداوە لەزیاد بوون و کورتهێنان، هەموو ئەمەش بەهۆی نزیک بوونەوەی خەڵکی زەویە وە پێشکەوتنی هۆکارەکانی گواستنەوە لەنێوان شارەکان بەفرۆکە یان بەئۆتۆمبیل یان بەشتی دیکە.



پێشکەوتنی هۆکارەکانی گەیاندن لەتەلەفۆنەکان و ئێستگەکانی هەوایی و بینراو دەنگی و ئەنتەرنێت.

لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لاتقوم الساعة حتى تظهر الفتن ويكثر الكذب وتتقارب الأسواق)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو فیتنەو ئاژاوە دەردەکەوێت و درۆ زۆر دەبێت و بازاڕەکان لێک نزیک دەبێتەوە))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە

### لەسێ ڕوودا بازاڕەکان لێک نزیک بوونەتەوە

- **یەکەم //** خێرایی زانست و زانیاری ئەمەش زیاد کردنی نرخ و کەمکردنی تێدا دەبێت.
- **دووەم //** خێرایی ڕۆیشتن لەبازاڕێکەوە بۆ بازاڕێکی تر، ئەگەر هاتوو ماوەی ڕێگاکەش زۆر دووربێت.
- **سێیەم//** نزیک کەوتنەوەی هەندێک لەهەندێکی دیکەدا لەنرخەکان، وە چاولێکەری هەندێک خەڵک لەهەندێکی تر لەزیادکردن و کەمکردن، وەخودای گەورەش زاناترە.

شێخ عەبدول عەزیز بن باز – ڕەحمەتی خوای لێبێت – لەحەدیسێکدا کەئەبوهورەیرە ڕیوایەتی کردووە لەبارەی نزیک بوونەوەی بازاڕەکان تەفسیر دەکات و دەڵێت (( نزیک بوونەوە لەتەفسیرکردنی ئەو نزیک بوونەوەی باسکراوە لەحەدیسەکەدا کەوا لەو سەردەمەدا

ڕوویداوه لەنزیک بوونەوەی نێوان شارەکان و هەرێمەکان و کورت بوونەوەی کاتی دووری نێوانیان بەهۆی داهێنانی فڕۆکەکان و ئۆتۆمبیلەکان و ئێستگەکانە و زۆرشتی دیکەش خودای گەورەش لەهەمووکەس زاناترە))

## ٦٩

# چاوتێبڕین و پەلاماردانی گەلان بەسەر گەلانی ئیسلام

لەنیشانەکان کەوا لەکۆتایی زەماندا ڕوودەدات و نزیکیشە لەرۆژی دوایی پەلاماردانی گەلانە لەسەر گەلی ئیسلام بەڵام خودای گەورە ئەم گەلەی پاراستووە .

ئەوەی لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبداتەوە دەبینێت کەوا گەلی ئیسلام چەندها جەنگی گەورەی تێدا بەرپابووە، موسیبەت و ناخۆشی زۆری تووش بووە، وەخوای گەورەش پاراستوویەتی و پشت و پەنای بووە، لەجەنگی خاچ پەرستەکان دیانەکان کۆبوونەوەو، خودای گەورەش موسلمانەکانی سەرخست بەسەریاندا، وە تەتەرەکانیش هێرشیان کردە سەر وولاتە ئیسلامیەکان وخودای گەورە بەرپەرچی فرت و فێلەکانی ئەوانی دایەوە، لەم سەردەمەی ئێمەشدا خاچ پەرستەکان و جوولەکەکان پشتگیری یەکتر دەکەن، و پشت و پەنا بەخوای گەورە لەگەڕانەوەی موسڵمانەکان و بۆ ئایینەکەیان بۆ ئەوەی سەرکەوتن بۆ ئەوان بێت.

﴿ وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ﴾ الحج/٤٠

**واتە// (سوێند بێت بێگومان خوا ئەوەکەسە سەردەخات کەپشتگیری ئایین و بەرنامەکەی دەکات و هەوڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خوا زۆر بەهێزو باڵادەستە)**

﴿ كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾ ﴾ المجادله / ٢١

**واتە// (خوا بڕیاریداوەکە : بێگومان هەر خۆم و پێغەمبەرەکانم سەرکەتوو دەبین، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی بەهێزو باڵادەستە)**

لەثەوبان ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت: (( يوشك الأمم أن تداعى عليكم كما تداعى الأكلة إلى قصعتها ، فقال قائل : ومن قلة نحن يومئذ ؟ قال : بل أنتم يومئذ كثير ، ولكنكم غثاء كغثاء السيل ، ولينزعن الله من صدور عدوكم المهابة منكم ، وليقذفن الله في قلوبكم الوهن، قيل : وما الوهن يا رسول الله ؟ قال :

حب الدنيا ، وكراهية الموت)) **واته: ((پێدەچێت گەلانی ناموسلمان پەلامارتان بدات وەک چۆن گیانلەبەرێک پەلاماری خواردنەکەی دەدات، جا یەکێک ووتی : ئایا لەبەر کەمی ئێمەیە ئەم ڕۆژە وامان بەسەر دێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر بەڵکو ئێوە لەو ڕۆژەدا گەلێک زۆرن، وەک کەف و پووشی سەر ئاو وان، خوای گەورە ترس لەدڵی دوژمنەکانتان دەردەهێنێت لەبەرامبەر ئێوەدا، وە (وهن) دەخاتە دڵتانەوە ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (وهن) چیە؟ فەرمووی: خۆشەویستی دونیاو ڕق لێبوونەوە لەمردن ))** ابوداود ریوایەتی کردووە.

القصعة : دەفرێکە خواردنی تێدادەخورێت، وەزۆربەی جار لەدار دروست دەکرێت.

الغثـــاء : ئەوەی لەگەڵ ڕووباردا دێت کەپووش و پەلاش و پیسی هەڵدەگرێت.

الوهـــن : پێغەمبەر ﷺ تەفسیری کردووە خۆشەویستی دوونیاو ڕق لێبوونەوە لەمردن.

ئەم حەدیسەش لەبەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیە وەنیشانەیەکە لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، بێگومان گەلە کافرەکان هێرش و پەلامارەدەکەنە سەر گەلە موسلمانەکان وەک چۆن گیانلەبەر هێرش دەکاتە سەر دەفری خۆراک، وەبەهۆی ئەو شکستی و نەنگیە لەبەر کەمی موسلمانان نیە، بەڵکو زۆرن، بەڵام ئەوان وەک پووش و پەلاشی سەر ئاو وان کە زێ و ڕووبار هەڵیان دەگرێت، کەهیچ کێشیان نیە، ئەمەش ئەمڕۆ باری میللەتی ئێمەیە، کەژمارەیان زیاتر لەهەزار ملیۆنە، بەڵام زۆریەکە (چەند)ە یە (چۆن)یەکە نیە.

ترس و دڵەراوکێ لەدڵی دوژمنەکانیان نامێنێت، ئەوان ترس دەخەنە ناو دڵی موسڵمانەکان، وە لەگەڵیاندا دەجەنگن و داگیریان دەرکەن، ئەمەش لەکاتێکدا بە کە (وهن) بەسەریاندا دەبارێت ئەویش خۆشەویستی دونیاو ڕق لێبوونەوە لەمردن.




میژووی داگیرکەری ڕۆژئاوا بۆ وولاتە عەرەبیەکان

# ٧٠
# خەڵک یەکتری پاڵدەدەن بۆ پێش نوێژی کردن



لەنیشانەکانی نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی دەرکەوتنی نەزانیەو بڵاوبوونەوەیە لەنێو خەڵکدا تاوەکو وای لێدێت کەسێک نادۆزیتەوە پێش نوێژی بۆ خەڵک بکات جالەکاتی نوێژی بەکۆمەڵدا هەندێک یەکتر پاڵدەدەن بۆ پێش نوێژی ئەوانیش ناچن لەبەر نەزانین بەحوکمەکانی شەرع و، کەمی ووردەکاریان لەخوێندنەوەدا.

لەسەلامەی کچی حور رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((إنَّ مِن أشراط الساعة: أن يتدافع أهل المسجد الإمامة، فلا يجدون إمامة يصلّي بهم)) واتە: ((لەنیشانەکانی رۆژی دوایی خەڵکانی ناومزگەوت یەکترپاڵ پێوەدەنین بۆ پێش نوێژی کردن، جا پێش نوێژو ئیمامێک نابیننەوە نوێژیان بۆ بکات)) ابو داود ڕیوایەتی کردووە.

لەعەبدوللای کوڕی عەمرو رەزای خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((زەمانێک بەسەر ئەو خەڵکەی دادێت لێی کۆدەبنەوەو، نوێژ لەمزگەوتەکان دەکەن، لەناویاندا ئیماندارێک نیە)) حاکم ریوایەتی کردووە.

لەوانەیە ئەم سەردەمە هێشتا نەهاتبێت سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە، هێشتا بازنەکانی زانست و زانایان لەهەموو جێگایەک هەن، وەمزگەوتەکان پڕ دەبن لە زانایان و قوتابی زانست و خوێنەرە ڕێک و پێکەکان.

# ٧١
# راست دەرچوونی خەونی ئیماندار



خەون و خەوبینینەکان لەخەودا واتاو یاسای هەیە، لەوانەیە راست بێت وەک رووناکی بەیانیان، وە لەوانەیە درۆبێت، لەوانەشە لێکدانەوەی خەونەکان و حەدیسەکان دیاری بکات، پێغەمبەرش ﷺ هەواڵی داوە لەبارەی خەوبینین کە پەیوەندی هەیە بەنیشانەکانی رۆژی دوایی و ئاماژە پێکردنی.

خەونی پیاوچاکانیش بەشێکە لەچل و شەش بەش لەپێغەمبەرایەتی لەعائیشەوە رەزی خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((لا يبقى بعدي من النبوة شيء إلا المبشرات قالوا : يا رسول الله وما المبشرات ؟ قال : الرؤيا الصالحة يراها الرجل أو تُرَى له)) واتە: **((لەدوای من هیچ شتێک نامێنێتەوە لەپێغەمبەرایەتی جگە لەموژدە بەخشەکان)) ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا مژدە بەخشەکان چیە؟ فەرمووی ((خەوبینینی پیاوچاکان کە دەیبینێت یان پێی نیشان دەدرێت))** بوخاری و ئەحمەد ریوایەتیان کردووە.

ڕاستە دەرچوونی خەون مزگێنی دەرە بۆ ئیماندار وە نیشانەیە لەسەر نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی و کۆتایی جیهان بەجۆرێک خەون و ڕاستی زیاترە و دەگونجێت بۆ واقیعی ئەمرۆ ئیمانداریش پاکترین کەسن لەناو خەڵکدا، وەک ئەوەی خەون هاوڕێ و هۆگری ئەو بێت وەکاتێک نامۆو غەریب دەبێت لەنێو خەڵکدا کەمجار خەونەکەی بەدرۆ دەردەچێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( إذا اقترب الزمان لم تكد رؤيا المسلم تكذب، وأصدقكم رؤيا أصدقكم حديثا ، ورؤيا المسلم جزء من خمس وأربعين جزءا من النبوة ، والرؤيا ثلاثة: فرؤيا الصالحة بشرى من الله ، ورؤيا تحزين من الشيطان ، ورؤيا مما يحدث المرء نفسه،

فإن رأى أحدكم ما يكره فليقم فليصل ، ولا يحدث بها الناس  قال : وأحب القيد وأكره الغل والقيد ثبات في الدين)) **واتە:** **((كاتێک قیامەت نزیک دەبێتەوە خەونی بڕوادار بەدرۆ دەرناچێت و ڕاسترینی خەونەکانتان لای ڕاست ترینی قسەکەرتانە، وە خەونی موسڵمانیش بەشێکە لەچل و پێنج بەش لەپێغەمبەرایەتیدا، وە خەونیش سێ بەشە، خەونی پیاوچاک و بڕوادار مزگێنیە لەلای خوداوە، خەونیش هەیە خەم و خەفەتە لەشەیتانەوە، و خەونیش هەیە کەسەکە خۆی کارەساتەکەی بەسەر دێت، جا ئەگەر یەکێکتان خەونێکی ناخۆشی دیت باهەڵسێت و تفێک بهاوێت بەلای چەپیدا ولای کەس باسی نەکات، وەکات و ماوەم خۆ ش دەوێت لەنوسیندا وە ڕقم لەڕق و کینەیە، وە ماوەش بەڵگەیە لەئاییندا))** ئەحمەدو موسلیم و ئەبوداودو ترمزی ریوایەتیان کردووە

**حافظ بن حجر** دەڵێت **((مانای خەوبینینی ئیماندار، لەکۆتایی سەردەمدا بەدرۆ دەرناچێت، کەوا زۆر بەسیفەتی روون تێیدا ڕوودەدات بەمانای پێویستی بە لێکدانەوە ناکات وە درۆی تێناچێت، بەڵکو ڕاست دەردەچێت و درۆدەرناچێت چونکە لەگەڵ واقیعەکە گونجاوە، بە جیاوازی خەونەکانی دیکە ئەمە لێکدانەوەکان شاراوەن وەبەئارەزووی خۆیان شی دەکەنەوە لەگەڵ واقیعدا کۆک نین ئەمەش دەبێتە درۆو ڕاست دەرناچێت.**

**حیکمەتیش لەتایبەتمەندیەتی ئەمەیە کۆتایی سەردەم کەوا ئیماندار لەو کاتەدا دەبێتە غەریب و نامۆ کەوا لە حەدیسێکدا هاتووەو ((لەسەرەتادا ئیسلام بەغەریبی هاتووەو وەبەغەریبیش دەگەڕێتەوە)) وەدەڵێن ئەنیس و هۆگری ئیماندارەو هاوکاریەتی وەخودای گەورەش ڕێز لەئیماندار دەگرێت بەخەونی چاک کەوا چەسپاوی دەکات لەسەر هەق وە بەم خەونەش مزگێنی پێدەدات))**

***لێرەدا دوو ڕێ تێچوون هەیە بۆ دیاریکردنی کات کەوا ڕاست دەرچوونی خەونی ئیماندار تێیدا ڕوودەدات :***

١. ئەمە ڕوودەدات ئەگەر هاتوو زانست و زانیاری نەمێنێت و نیشانە شەرعیەکان دیارنەمان بەهۆی فیتنەو کوشت و کوشتار ئەوا ئیماندار غەریب و نامۆ دەبێت ئەوا بەخەونە ڕاستەکانیان جێیان دەگریتەوە، هەر بۆیەش ئیبن و حەجەر باسیکردوە لەقەولەکەی سەرەوە.

٢. ئەمەش سەردەمی پێغەمبەری خوا عیسی علیه السلام ڕوویداوە چونکە خەڵکی ئەو سەردەمە چاکترین سەردەم بوون لەو ئوممەتەدا لەدوای سەحابە بەڕێزەکان وە ووتەکانیان و خەونەکانیان راسترینیان بوو کە درۆ دەرنەدەچوون.

# ٧٢
# زۆر بوونی درۆ

درۆ دەردێکی ترسناک و کوشندەیەو هێشتاش پیاو هەیە بەدوای درۆدا دەگەڕێت تاوای لێدێت لەلای خوای گەورە بەدرۆزن دەنوسرێت.

وە لەحەدیسێکدا ((يطبع المؤمن على الخصال كلها إلا الخيانة والكذب)) **واتە: ((پیاوی ئیماندار لەسەر هەموو ئاکارەکانی ڕادێت جگە لەناپاکی و درۆ))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

وە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچووبایە لای یەکێک لەخانەوادەکانی درۆی بکردایە، ئەوا هیچ قسەی لەگەڵدا نەدەکرد تاوەکو تەوبەی دەکرد.

وەلەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی درۆبڵاودەبێتەوە لەنێوخەڵکداو پیاو خۆی لەدرۆ ناپارێزێت لەقسەکردنداو لەکاتی گواستنەوەی هەواڵەکاندا لەنێوخەڵک لەهەواڵەکەی دڵنیا نابێتەوە، ئەمەش لەگەڵ ناشیرینی درۆکردن و خراپی کاریگەریەکەی و زۆربوونی لەناو خەڵکدا.

لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەربێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (( يكون في آخر الزمان دجالون كذابون ، يأتونكم من الأحاديث بما لم تسمعوا أنتم ، ولا آباؤكم ، فإياكم وإياهم ، لا يضلونكم ، ولا يفتنونكم)) **واتە: ((لەکۆتایی زەماندا هەندێک دەجالی درۆزن پەیدادەبن و دێتەلاتان فەرموودەتان بۆ دەخوێنێتەوە کە هیچ گوێتان لێ نەبووە نەئێوە نەباووباپیرتان جائاگاداری خۆتان بن لێیان گومڕاتان نەکەن و تووشی فیتنەتان نەکەن))** موسلیم ریوایەتی کردووە.

لەجابری کوڕی سەمرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((إن بين يدي الساعة كذابين فاحذروهم)) **واتە: ((لەنزیکی قیامەتدا چەندان درۆزن پەیدا دەبن جا ئاگاداری خۆتانبن))** موسلیم رایوایەتی کردووە

لەو سەردەمەدا ووتارو هەواڵ و چیرۆکی غەریب گەلێک زۆر هەنە لەبەر کەمی خۆپاراستنی خەڵک لەدرۆ وەلەبەر ئەمەش پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردۆتەوە کەهەموو شتێک بسەلمێندرێ ئینجا بگوازرێتەوە، هەروەها لەدڵنیابوون لە هەواڵەکان کاتێک دیانگوازینەوە تاوەکو نەکەوینە ناوکۆمەڵەی درۆزنان و هەروەها تاوەکو هەڵنەخلیسکێین و یاخی نەبین.

# ٧٣
# پەیدا بوونی ڕق و کینە و یەکتر نەدواندن لەنێو خەڵکدا



لەکاتی زۆر بوونی ناخۆشی و و میحنەت و فیتنەو ئاژاوەدا پەیوەندی نێوان خەڵک دادەبەزێت تاوەکو دەگاتە پچڕانی پەیوەندی و ناکۆکی نێوان دڵەکان وەخەڵکی یەکتر ناناسن ویەکتر نادوێنن جگەلە بەرژەوەندیەکانی دنیایی.

لەحوزەیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پرسیار کرا لە پێغەمبەرﷺ دەربارەی ڕۆژی دوایی جا فەرمووی ((علمها عند ربي لا يجليها لوقتها إلا هو، ولكن أخبركم بمشاريطها وما يكون بين يديها، إن بين يديها فتنة وهرجا، قالوا: يا رسول الله، الفتنة قد عرفناها فالهرج ما هو؟ قال بلسان الحبشة: القتل، ويلقى بين الناس التناكر فلا يكاد أحد أن يعرف أحدا)) **واتە: ((زانیاری هاتنی قیامەت و کاتی دیاریکراوی کەس نایزانێت جگە لەخوای گەورە نەبێت، بەڵام هەواڵتان پێدەدەم بەنیشانەکانی ئەوەی پێش قیامەت ڕوودەدات بێگومان بەرلەهاتنی قیامەت فیتنەو ئاژاوە پەیدا دەبێت لەگەڵ (هرجا) )) ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوا فیتنەمان زانی، بەڵام (هرج) چیە؟ فەرمووی ((بەزوبانی حەبەشە، کوشت و کوشتارە، وەرق و کینەو قسە نەکردن لەگەڵ یەکتر دەکەوێتە ناوخەڵک، تاوای لێدێت کەس کەس ناناسێت))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

ئەم حەدیسەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ واقیعی خەڵکی ئێستادا زۆر کەس هەیە خزم و نزیکی خۆی ناناسێت، تاوای لی هاتووە منداڵەکانیان لەشوێنێکی گشتیدا دەگەنە یەکتر نازانن کەئەمە خزمی یەکترو لەیەک بنەماڵەن، چونکە زۆربەی پەیوەندیەکانی خەڵک لەسەر بەر ژەوەندی تایبەتی دامەزراوە، وەزۆربەی پەیوەندیەکان دامەزراوە لە بەرژەوەندی دنیایی کەبەخێرایی دروست دەبێت و بەخێرایش تێک دەچێت و دەپچڕێت لەبەر ئەوەی لەسەر هەواو هەوەسی خەڵک دامەزراوە لەبەر بەرژەوەندیەکانیان، بەڵام دانەمەزراوە لەسەر ئیمان بەخواو بەبرایەتی.

دەبینێت پیاوێک لەبەر بەرژەوەندی دنیایی خۆی زوو پەیوەندی لەگەڵ کەسێک دروست دەکات وە زۆر خێراشە بۆ پچڕاندنی.

# ٧٤
# زۆر بوونی بوومەلەرزە





مەبەست لەزۆربوونی زەوی لەرزین پێش هاتنی ڕۆژی دوایی بەتەواوی و بەردەوامی، ئەمەش یان ڕەحمەتێکە بەو ئوممەتەو تەکفیرکردنە بۆ خراپەکان، کەوا لەئەبوموسای ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت هاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((أمتي أمة مرحومة لا عذاب عليها في الآخرة جعل الله عذابها في الدنيا القتل والزلازل والفتن)) واتە: **((ئوممەتی من ئوممەتێکی ڕەحم پێکراوە لەقیامەتدا سزاو عەزابی لەسەر نیە، خودای گەورە لەسەر دونیا عەزابی بۆ داناوە لەکوشتن و بوومەلەرزەو فیتنەو ئاژاوە))** ئەحمەد و حاکم ریوایەتی کردووە

یان سزادانی بەندەکان بەجۆرێک فەسادو خراپە زۆر دەکات وە بوومەلەرزەش سزاو عەزابێکە بۆ خەڵکی ئەم زەمانە.

لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لا تقوم الساعة حتى يقبض العلم، وتكثر الـزلازل)) واتە: **((قیامەت هەڵناستێت تاوەکو زانست و زانیاری هەڵدەگیرێت وبوومەلەرزەش زۆر دەبێت))** بوخاری رایوایەتی کردووە

لەعەبدوللای کوڕی حەواڵەی ئەزەدی ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت((يا ابن حوالة إذا رأيت الخلافة قد نزلت الأرض المقدسة فقد دنت الزلازل والبلابل و الأمور العظام والساعة يومئذ أقرب من الناس من يدي هذه من رأسك)) واتە: **((ئەی کوڕی حەواڵە گەر بینیت جیاوازی و ناکۆکی لەخاکی پیرۆز پەیدابوو ئەوابێگومان زەوی لەرزین و بەڵاکان نزیک دەبێت کارگەلێکی گەورە ڕوودەدات وەهاتنی قیامەت لەو ڕۆژەدا نزیک ترە لە خەڵک لەنزیکی دەستی من لەسەری تۆ))** ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە

# ٧٥ ٧٦
# زۆربوونی ئافرەت - کەم بوونی پیاو



لەنیشانەکانی رۆژی دوایی ئافرەت لەئاخری زەمان زۆر دەبێت و پیاویش کەم دەبێت وە دەڵێن هۆی زۆر بوونی ئافرەت ئەو فیتنەو ئاژاوەیە کەوا کوشتن تێیدا زۆر دەبێت لەناو پیاواندا چونکە پیاو خاوەنی شەڕو شۆڕن جگە لەئافرەت.

**ئیبنو حجر** دەڵێت **((دیاردەکە بۆ هیچ هۆکارێک ناگەڕێتەوە تەنها نیشانەیەکی ئارەزوو مەندانەیە کەوا قەدەری خوای گەورەیە لەکۆتایی سەردەمدا منداڵی نێرینە کەم لەدایک دەبێت و منداڵی مێینە زیاتر لەدایک دەبن))**

لەئەنەس کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لەسەر بێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((لاتقوم الساعة -أو قال- من أشراط الساعة : أن يرفع العلم، ويظهر الجهل، ويشرب الخمر، ويفشو الزنا، ويذهب الرجال، ويبقى النساءً، حتى يكون لخمسين أمرأة قيّم واحد)) **واتە: ((قیامەت هەڵناسێت یان دەفەرموویت ((لەنیشانەکانی رۆژی دوایی زانست بەرزدەکرێتەوەو نەزانین دەردەکەوێت و عەرەق بەئاشکرا دەخورێتەوە و داوێن پیسی بڵاودەبێتەوە وەپیاوان دەڕۆن و نامێنن، تەنها ئافرەت دەمێنێتەوە، تاوەکو وای لێدێت یەک پیاو کاروباری پەنجا ئافرەت رادەپەڕێنێت))** موسلیم و بوخاری ریوایەتیان کردووە، وە لەڕیوایەتێکی دیکەدا ((يظهر الزنا، ويقل الرجل، ويكثر النساء)) **واتە: ((داوێن پیسی دەردەکەوێت، وەپیاو کەم دەبێت، وەئافرەت زیاد دەبێت))**

لەهەڵسەنگاندنی ئەمرۆدا لەڕەگەزی لەدایک بووەکانی نێرینەو مێینەدا لەجیهان بەگشتی وەلەلێکۆڵینەوەی ئامارە جۆراو جۆرەکانی وولاتاندا لەژمارەی پیاوان بەرامبەر ئافرەتان بەدیار کەوتووە، کەوا ئەونیشانەیە لەزەمانی ئێمەدا دەرکەوتووەو هاتۆتەدی.

# ٧٧
# دەرکەوتنی داوێن پیسی و ئاشکراکردنی

لەگەڵ زۆر بوونی شتی خراپەکان و بڵاوبوونەوەی هیواو ئارەزووەکان لەکۆتایی زەماندا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کەوا لەنیشانەکانی رۆژی دوایی بڵاوبوونەوەی داوێن پیسیە تاوەکو وای لێدێت پیاو تووشی ئافرەت دەبێت لەسەر رێگادا بەئاشکرایی .

لێرەدا دوونیشانە هەیە: دەرکەوتنی داوێن پیسی، و بڵاوکردنەوەی، وە ئاشکراکردنی داوێن پیسیەکەو نەشارد نەوەی.

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( لا تقوم الساعة حتى لا يبقى على وجه الأرض أحد لله فيه حاجة ، وحتى توجد المرأة نهارا جهارا تنكح وسط الطريق ، لا ينكر ذلك أحد ولا يغيره ، فيكون أمثلهم يومئذ الذي يقول : لو نحيتها عن الطريق قليلا ، فذاك فيهم مثل أبي بكر وعمر فيكم)) **واتە: ((قیامەت هەڵناستێت هەتا: یەکێک لەسەر زەوی نامێنێت کە ترسی لەخوا هەبێت، تاوەکو بەرۆژی رووناک ئافرەت دەبینیت داوێن پیسی دەکات لەناوەراستی رێگادا هیچ کەسێک ئینکاری ئەوە ناکات وە نایگۆرێت باشترین کەسیش لەم رۆژەدا ئەو کەسەیە کە دەڵێت خۆزگە لە ناوەراستی رێگاکە لاتدەدا، وە ئەم کەسەش لەناو ئەوان وەک ئەبوبەکرو عومەرە لەناو ئێوەدا))** حاکم ریوایەتی کردووە، وەئەلبانی دەڵێت لەزنجیرەی لاوازەکانە، زۆر لاوازە.

وە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((إن أشراط الساعة : أن يرفع العلم، ويظهر الجهل، ويشرب الخمر، ويفشو الزنا)) **واتە: ((لەنیشانەکانی رۆژی دوایی زانست و زانیاری بەرزدەبێتەوە، و نەزانین بەدیار دەکەوێت و عەرەق بەئاشکرا دەخورێتەوەو داوێن پیسیش بڵاودەبێتەوە))** متفق علیه

لەریوایەتێکی دیکەدا ((يظهر الزنا، ويقل الرجال، ويكثر السناء)) **واتە: ((داوێن پیسی دەردەکەوێت، وە پیاوکەم دەبێتەوە، وە ئافرەت زۆر دەبێت))** متفق علیه.

ئەم دوونیشانانە دەرکەوتوون لەزەمانی ئێمەدا، لەکاتی نیشاندانی هەندێک کەناڵی ئاسمانی لەو کارە بەدرەوشتانە، وە وێنەی رووت، یان لەئەنتەرنێت وێنەو گرتەی ڤیدیۆیی بڵاودەبێتەوە کەوا چاوی ئیماندار لەبینینی شەرم دەکات.

پێویستە لەسەر ئیمانداری پیاوو ئافرەت چاکسازی دەروونی خۆیان بکەن و چاویان بنوقێنن و داوێنی خۆیان بپارێزن، زۆر ووریابن لەگەڵ تێکەڵبوونی خراپەکاران و داوێن پیسان، لەگەڵ بەردەوامی پاڕانەوە لەخودای مەزن و دلۆڤان لەخۆراگری و داوێن پاکی.

٧٨

# وەرگرتنی کرێ لەسەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز



خوێندنەوەی قورئان خواپەرستی و نزیک بوونەوەیە لەخودای گەورە، وە لەبنچینەدا کە خواپەرستی ناچێتە ناوبواری بەدەست هێنانی دونیا، بەڵکو بۆ دوارۆژە بەمەبەستی گەیشتن بۆلای خودای گەورە و میهرەبان.

لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا هەندێک خەڵک پەیدادەبن قورئان دەخوێنن و دەنگی خۆیان خۆش دەکەن، لەکۆڕەکانی پرسەو بۆنەکان بۆ ئەوەی لەسەر ئەم قورئان خوێندنە پارە وەربگرن.

**لەعیمرانی کوڕی حصین رەزای خوای لەسەر بێت کەبەلای پیاوێکدا تێدەپەڕێت کە ئەو پیاوە قورئانی دەخوێند لەسەر قەومێک و کاتێک کۆتایی پێهێنا داوای پارەی لێکردن.. عیمران ووتی (ان لله وانا اليه راجعون من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو** ((مَن قرأ القرآن فليسأل الله تبارك وتعالى بِهِ فإنهُ سيجيء قوم يقرؤن القرآن يسألون الناس به)) **واتە: (هەر کەسێک قورئان دەخوێنێت باداوای لەخودای گەورەو میرەبان بکات، بەڵام قەومێک دێت قورئان دەخوێنن داوای حەقەکە لەخەڵک دەکەن))** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە

لەجابری کوڕی عەبدوللا رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پێغەمبەرﷺ هاتەلامان و ئێمەش قورئانمان دەخوێندەوە لەناو ئێمەدا دەشتەکیو غەیرە عەرەبی لێبوو، فەرمووی ((أقرءوا، فكل حسن، وسيجيء أقوام يقيمونه كما يقام القدح، يتعجلونه ولا يتأجلونه))

**واتە: ((بیخوێنن، بەرێک و پێکی، وە قەومێک دێت قورئان دەخوێنن لەبەر خاتری ناوودەنگ و ناوبانگی خۆیان، وە پەلەدەکەن لەوەرگرتنی پارەی خوێندنەوەکە کەچی دوای ناخەن بۆ پاداشت وەرگرتن لەدوارۆژدا))** ابوداود ڕیوایەتی کردووە

# ٧٩

# لەناو خەڵكدا قەڵەوی زۆر پەیدا دەبێت

لەعیمرانی كوڕی حصین ڕەزای خوای لێبێت كەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (( خير أمتي قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم، ثم إن بعدهم قوماً يشهدون ولايستشهدون ويخونون ولا يؤتمنون ، وينذرون ولا يوفون ، ويظهر فيهم السمن)) **واتە: ((چاكترینی ئوممەت لەسەردەمی منە پاشان ئەوانەی لەدوای ئەوانەوە دێن پاشان ئەوانەی لە دوای ئەوانەوە دێن، ئینجا لەدوای ئەوان قەومێك دێت زولم و تاوان دەبینن بەڵام شایەتی نادەن وە ناپاكی دەكەن بەڵام دەستپاكی ناكەن، وە ماڵی خۆیان تەرخان دەكەن بۆ بەخشین بەڵام ڕاستگۆنین بەرامبەر نەزرەكەیان، وە قەڵەوی تیایاندا دەردەكەوێت))** متفق عليه.

وەلەوانەیە زۆر بوونی قەڵەوی لەئاخیری زەماندا هۆكارەكەی بڵاوبوونەوەی ڕابواردن و خۆشی بێت وە چێشتخانەو شوێنی خواردنەوەكان هەمەڕەنگ دەبن. زۆربوونی خواردەمەنی و شیرنەمەنی، وەكەمی جوولەی خەڵك بەلاشەكانی، و ئامێرەكان هەموویان لەخزمەتی خەڵكدا دەبێت و كەم كەس بەپێ دەڕوات و ناجولێت تەنها كەمێكیان نەبێت، بۆیە لاشەو بەدەن لەلایەن گەورەو بچووكەوە، زیاد دەكات، تاوەكو ئامارەكان ئەوەیان دەرخستووە كە شەشیەكی دانیشتوانی جیهان بەدەست زیاد بوونی كێشیان ئازار دەكێشن.

هەر لەبەر ئەمەیشە ئەمڕۆ داوو دەرمان زۆر بووە كەوا چاودێری دەكات لەسەر كەمبوونەوەی كێش، و قەڵاچۆكردنی قەڵەوی، و نەشتەرگەری بەستانی گەدە، وە زۆر نموونەی وەك ئەمانە.



٨١ ٨٠

# دەرکەوتنی قەومێک دەبینن بەڵام شایەدی بەهەق نادەن - وەدەرکەوتنی قەومێک ماڵی خۆیان نەزر دەکەن بەڵام دڵسۆزنین

ئەم دوو نیشانەیە لەحەدیسەکەی پێشووتر هاتووە ((..ثم إن بعدهم قوماً يشهدون ولايستشهدون ويخونون ولايؤتمنون وينذرون ولا يفون.. )) **واتە: ((.....پاشان دوای ئەوان قەومێک دێت زولم و ستەم و تاوان دەبینن بەڵام شایەدی بەهەق نادەن، وە ناپاکی دەکەن بەڵام دەست پاک نابن، بەرامبەر ئەمانەتەکان، ماڵی خۆیان نەزر دەکەن، بەڵام ڕاستگۆنین بەرامبەر نەزرکردنەکەیان))**



# ٨٢

# بەهێز لاواز دەخوات

((عن عائشة رضي الله عنها قالت : دخل عليّ رسول الله ﷺ ، وهو يقول: يا عائشة، قومك أسرع أمتي بي لحاقا ، قالت : فلما جلس ، قلت : يا رسول الله، جعلني الله فداءك، لقد دخلت وأنت تقول كلاما ذعرني ، قال : وما هو ؟ قالت : تزعم أن قومك أسرع أمتك بك لحاقا ، قال : نعم ، قالت: ومم ذاك؟ قال: تستحليهم المنايا ، وتنفس عليهم أمتهم، قالت: فكيف الناس بعد ذلك، أو عند ذلك؟ قال: دبى ، يأكل شداده ضعافه ، حتى تقوم عليهم الساعة )) واته: ((لەعائیشەوە رەزای خوای لێ بێت دەڵێ پێغەمبەر ﷺ هاتەلام، دەیفەرموو ((ئەی عائیشە قەومەکەی تۆ خێراترین ئوممەتی منن کەبەمن دەگەن)) ووتی کاتێک پێغەمبەر دانیشت ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خودا منت بەفیدا بکات کە هاتیتە ژوورەوە قسەیەکت کرد منت ترساند، فەرمووی ((کامەیان؟)) عائیشەووتی: تۆ دەفەرموویت قەومەکەی من خێراترین ئوممەتی تۆن دەگەن بەتۆ، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی ((بەڵێ)) ووتی، جا بۆ چی وایە؟ فەرمووی ((مردن زوو راویان دەکات و هێرشیان بۆ دێنێ وە ئوممەتەکانیان لەسەریان خۆیان گێف دەکەنەوە)) وتی: وتم ئەی خەڵکی دوای ئەوان چۆن دەبێت؟ فەرمووی ((کوللە بەهێزەکان لاوازەکان دە خوات تاوەکو قیامەت لەسەریاندا هەڵدەستێت)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە




ئەبو عەبدولرەحمان دەڵێت: فسره رجل هو الجنادب التي لم تنبت أجنحتها: واتە: (پیاو وەک ئەم کوڵلانەن کەهێشتا باڵیان نەرواوە)

(الدّبي) ئەو کوللەیەیە پێش ئەوەی بفڕێت.

(الجنادب) کۆی (جندب)ە، ئەویش کوللە یە.

لەو حەدیسەدا ئاماژە لەسەر ڕوودانی زوڵم و ستەمێکی مەزن و شەڕێکی گەورە دەکات تاوەکو وای لێدێت بەهێز لاواز دەخوات.

واته:

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

((سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم کتێبە کە قورئانە بۆ سەر بەندەی خۆی محمد درودی خوای لەسەر بێت دابەزاندووە، هیچ کەم و کوڕی و ناتەواییەکیشی بۆ ڕەوا نەداوە (١) کردوویەتی بەچاودێری هەرچی بەرژەوەندیەکانی ئادەمیزادەو ڕێک و ڕاستە لەهەموو شتێکدا، بۆ ئەوەی یاخیەکانی لەسزایەکی سەخت بێدار بکاتەوە کەلەلایەن خواوە (لەدونیاو قیامەتدا) یەخەیان پێ دەگرێت و مژدەش بدات بەوئیماندارانەی کەکارو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن بەوەی کەبەڕاستی پاداشتی زۆر چاکیان بۆ ئامادەدەیە (٢) بەردەوام و هەمیشە لەو بەهەشتە سازگارەدا دەمێنیتەوە (٣) هەروەها بۆ ئەوەی ئەوان بترسێنێت و بێداریان دەکاتەوە، کە دەیانووت خوامندالی بۆ خۆی بڕیارداوە!! (٤) جا ئەوانە نەخۆیان و نەباووباپیرانیان لەڕووی زانست و زانیاری تێگەیشتنەوە ئەو گوفتارە ناقۆلایە نالێن، ئەو بووختانەیان قسەیەکی زۆر گەورەو ناڕێکە کەلەدەمیان دەردەچێت، ئەوانە جگە لە درۆو گوفتاری نابەجێ هیچی تر نالێن (٥ ) جا تۆ لەوانەیە لەخەم و پەژارەدا لەسەرەنجامی ڕەوشی ئەوانەی کە باوەڕ بەم قورئان و فەرموودەیە ناهێنن خۆت لەناو بەریت و لەداخ و خەفەتدا بمریت (٦) بێگومان ئێمە هەرچی لەڕووی زەویدا هەیە کردوومانە بەهۆی ڕازاندنەوەی، تاتاقیان بکەینەوە کامیان کاروکردەوەی چاکترو ڕێک و پێکتر ئەنجام دەدات (نازو نیعمەتەکان بۆ چاکەبەکار دەهێنێت) (٧) بێگومان ئێمە سەرەنجام هەرچی لەسەر ئەم زەویەدا هەیە تەختی دەیکەین و دەیکەینە گۆڕەپانێکی ووشک و برنگ و ساف (٨) (بەڵگەیەکی تر لەسەر زیندوو بوونەوە ئەوەیە کە خوای گەورە دەپرسێت) ئایا وادانانێیت کەبەڕاستی یارانی ئەشکەوت و تابلۆ (کەناویانی لەسەر نوسراوە) لەنیشانەو بەڵگە سەر سورهێنەرەکانی ئێمەن؟! (لەسەردەمی پادشایەکی زۆرداری خوانەناسدا چەند لاوێکی ئیماندار هەست دەکەن کە ئیمان و ژیانیان لەمەترسیدایە بۆیە ڕوودەکەنە ئەشکەوتێک،

لەوێدا ماوەیەکی دوور درێژخوای گەورە خەویان لێ دەخات) (٩) کاتێک لاوەکان پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکەو نزایان کرد، جا ووتیان پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە رەحمەت و میهرەبانی تایبەتیمان پێ ببەخشەو لەسۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکە و رێگەی رزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا (١٠)

## دەڵێن هۆکاری خوێندنەکە :

سەرەتا سوورەتەکە خودای گەورە باسی کۆمەڵێک لەهاوەڵانی ئەشکەوتی (کهف) دەکات کەرزگارو پارێزراویان دەکات لەدەست زۆردارێداریکی خوانەناسدا کەوا دەیوویست سزایان بدات.

**وەدەڵێن :** کەوا ئەو دەئایەتانە لەسەر سورهێنەرەکانی چیرۆکی هاوەڵانی ئەشکەوتی (الکهف)ە، کە چۆن رزگاریان بووە، جا پیاوی موسڵمان لەکاتی سەرهەڵدانی دەجال بەبیری دێتەوە.

## خوێندنەوەی سورەتی الکهف بەتەواوی :

لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((مَن قرأ سورة الكهف كما أنزلت، ثمَّ أدرك الدّجال، لم يُسلَّط عليه أولم يكُن لَهُ عليهِ سبيل ))

**واتە: (هەر کەسێک سوورەتی (الکهف) بخوێنێتەوە وەک چۆن دابەزیوە، پاشان تووشی هەرکەسێک بێت، ئەوا بەسەریدا زاڵ نابێت یان هیچ رێگایەکی نابێت تووشی ببێت)** حاکم ریوایەتی کردووە.

## پەنابردن بۆ یەکێک لەدوو مزگەوتە پیرۆزەکە

لەبەر ئەوەی دەجال ناچێتە هەردوو شاری مەککە یان مەدینە





## پەناگرتن لەفیتنەی دەجال لەکۆتایی نوێژدا :



ئەمەش لەدوای شایەتمان و پێش سەلام دانەوە دەبێت، ئەمەش دەبێت بڵێیت ((اللهم انی اعوذ بك من عذاب النار و من عذاب القبر ومن فتنه المحیا والممات ومن فتنة المسیح الدجال))

**واتە :** (خوای گەورە من پەنابەتۆ دەگرم لەعەزابی دۆزەخ وە لەعەزابی قەبر، وە لەفیتنەی زیندوو بوونەوەو مردن وە لەفیتنەی مەسیحی دەجال). متفق علیه

## ئاشکراکردنی کاروکردەوەی دەجال بۆ خەڵکی بۆ خۆپاراستن لێی

لەصعب کوڕی جثمامە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ((لایخرج الدجال حتی یذهل الناس عن ذکره)) **واتە: ((دەجال دەرناچێت تاوەکو خەڵک باسەکانی لەبیر دەکات و لەمینەرەکاندا باسی لێوەناکرێت))** عبداللەی کوڕی ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

**واتە :** کەس باسی دەجال ناکات و هیچ کەسیش بەرهەڵستکاری نابێت و، ئەگەر لەنێوخەڵکدا لەبیرکرا، وە سیفەتەکانیشی لەیادکرا، وە ئاگاداربوون لێی – لەگەڵ زۆر بوونی فیتنە و ئاژاوە – دەجال دەردەکەوێت.

## خۆ چەکدار کردن بەزانستی شەرع :



زانستی شەرعی و بڕواهێنان بەخودای گەورە (عزوجل) چەکێکە بەڕووی هەموو فیتنەیەک، لەگەڵ ئەمەش فیتنەی دەجال، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت باسی چیرۆکی ڕووبەڕووبوونەوەی گەنجێکی قارەمانی ئیماندار دەکات لەئەهلی مەدینە لەگەڵ دەجالّدا کەبۆ ئێمە گرنگی زانست بەئیمان دەردەکەوێت لەخۆپاراستن لەفیتنەو ئاشووبەکاندا.

لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت

((يأتي الدجال ، وهو محرم عليه أن يدخل نقاب المدينة، بعض السباخ التي بالمدينة ، فيخرج إليه يومئذ رجل هو خير الناس))



وێنەیەك لەخاکی سەبخە

**واتە: ((بێگومان دەجال دێت وەلێی قەدەغەکراوە بچێتە دەرگاکانی مەدینە بۆیە لەدەوروبەری (السباخ) دادەبەزێت کەوانزیکی مەدینەیە، لەو رۆژەدا پیاوێک لەباشترین کەسی ئەو سەردەمەیە دەردەچێت بۆ لای دەجال.**

- فيقول: أشهد أنك الدجال ، الذي حدثنا عنك رسول الله صلى الله عليه وسلم حديثه

فيقول الدجال : أرأيت إن قتلت هذا ، ثم أحييته هل تشكون في الأمر ؟

- فيقولون : لا ، فيقتله ثم يحييه - وفي رواية: فيضربه بالسيف، فيقطعه جزلتين رمية الغرض - ثم يدعوه، فيقبل (أي: الساب) يتهلل وجهه يضحك.

فيقول - أي الشاب - والله ما كنت فيك قط أشد بصيرة مني الآن

وفي رواية : يخرج الدجال فيتوجه قِبَله - اي نحوه - رجل من المؤمنين فتلقاه المسالح (أي مسالح الدجال وهم حراسة وأعوانه).

فيقولون له: أين تعمد؟

- فيقول : أعمد إلى هذا الذي خرج!

فيقولون له: أوما تؤمن بربنا؟!

فيقول : ما بربنا خفاء!

فيقولون: اقتلوه



- فيقول بعضهم لبعض : ليس نهاكم
- ربكم ان تقتلوا أحداً دونه؟!
- فينظلقون به، فإذا رآه المؤمن يقول:
- أيها الناس هذا المسيح الدجال الذي
- ذكر رسول الله صلى الله على وسلم

فيأمر به الدجال فيُشبح (أي يُمد ليضرب)



وێنەیەکی تری نزیك لەخاکی سەبخە

فيقول : خذوه وشجوه.

ويوسع بطنه وظهره ضرباً

فيقول : أو ما تؤمن بي؟

فيقول: أنت المسيح الكذاب.

فيأمر به، فينشر بالمنشار من مفرقه حتى يفرق بين رجليه، ثم يمشي الدجال بين

- القطعتين.
- ثم يقول له: قم.

فيستوى قائماً

فيقول له - أي الدجل - : أتؤمن بي؟

- فيقول : ما ازدت فيك إلا بصيرة.

ثم يقول (أي: المؤمن) : أيها الناس، إنه لا يفعل بعدي بأحد من الناس.

- فيأخذه الدجال ليذبحه، فيجعل الله بين رقبته إلى ترقوته نحاساً فلايستطيع إليه
- سبيلاً فيأخذ برجليه ويديه، فيقذف به في النار التي معه فيحسب الناس انما قذفه

إلى النار وإنما ألقي به في الجنة. ثم قال : هذا أعظم الناس شهادة عند رب العالمين.

## واتە:

- گەنجەکە دەڵێت : شایەدی دەدەم کە تۆ دەجاڵیت کەوا پێغەمبەر ﷺ بۆمانی باس کردووە.
- جا دەجال بەو کەسانەدەڵێت کە لەگەڵیدان، ئایا ئەگەر ئێوە بینیتان کەوا ئەو گەنجە بکوژم وە زیندووشی بکەمەوە، ئایا هیچ گومانێکتان دەمێنێت؟
- دەڵێن : نەخێر
- جا دەیکوژێت، پاشان زیندووی دەکاتەوە – وە لەریوایەتێکی دیکەدا – بەشمشێر لێی دەدات، وە دیکاتە دووبەش لەبەر توندی لێدانەکەی، پاشان بانگی دەکات، گەنجەکە وەڵامی دەداتەوە، بەدەم پێکەنینەوە دێت بۆ لای .
- گەنجەکە دەڵێت : سوێند بەخوا هیچ کاتێک لەئێستا زیاتر لەپێش چاوم بەخراپی نەمبینیوی. لەریوایەتێکی دیکەدا ((دەجال دەردەچێت پیاوێکی گەنج لەبڕواداران دەڕوات بەرەو دەجال جا پاسەوانەچەکدارەکانی دەجال بەرەو ڕووی دەبنەوە.
- پێی دەڵێن : بەرەو کوێ دەڕۆیت یان کوێت مەبەستە؟
- کابرای ئیماندار دەڵێت : بەرەو ئەو کەسە دەڕۆم کەوەرکەوتووە! (واتە: دەجال)
- پێی دەڵێن: ئەوە تۆ ئیمان ناهێنی بەپەروەردگارمان؟!
- پیاوەکە دەڵێت: خودای ئێمە وون و نادیار نیە!
- دەڵێن: بیکوژن.
- جا هەندێک بەهەندێکیان دەڵێن: ئەی پەروەردگارتان قەدەغەی نەکرد کەکەس نەکوژن بەبێ ئەو؟!
- ئەو کاتە دەیبەن بۆلای دەجاڵ، کاتێک ئیماندارەکە دەجال دەبینێت دەڵێت: ئەی خەڵکینە ئەوە مەسیحی دەجالە کەوا پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە، ئینجا دەجال فەرمان دەکات درێژی بکەن بۆ لێدان.
- دەجال دەڵێت: بیبەن درێژیکەن، جا پشت و سکی لێک دەکێشتەوە بەلێدان.
- جا دەڵێت : ئیستاش ئیمانم پێ ناهێنیت؟
- پیاوەکە دەڵێت: تۆمەسیحی درۆزنیت.
- ئینجا دەجال فەرمان دەکات و بەمشار لەناوەڕاستی تا دوولاقەکانی لێک جیا دەکاتەوە، پاشان بەنێوان هەردوو پارچەکەدا دەڕوات.

- پاشان پێی دەڵێت : هەستەوە
- هەڵدەستێتەوە سەرپێ و ڕاست دەوەستێت.
- دەجال پێی دەڵێت : ئایا ئیمانم پێ دەهێنیت؟
- گەنجەکە دەڵێت: سوێند بەخوا زیاتر دڵنیایم بۆ زیاد بوو سەبارەت بەتۆ.
- پاشان ئیماندارەکە دەڵێت: ئەی خەڵکینە، لەدوای من دەجال ناتوانێت ئاوا لەکەس بکات، دەجالیش دەیگرێت بۆ ئەوەی سەری ببڕێت، بەڵام خوای گەورە وا دەکات لەگەردەنی تاکو دەفەی سینگی بەمس دەبەسترێت، لەبەر ئەوە توانای سەربڕینی نابێت، جا دوو دەست و خاچەکانی دەگرێت و فڕێی دەداتە ناو ئەو ئاگرەی کەلەگەڵیدایە، جا خەڵکەکە وادەزانین فڕێی داوەتەوە ناو ئاگر، بەلام فڕێی داوەتە ناو بەهەشت، پاشان پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت ((ئەمە شەهیدیەکەی لەهەموو کەس گەورەترە لەلای پەروەردگار)) موسلیم ریوایەتی کردووە.



سەرەنجام

ئەو حەدیسە بەڵگە لەسەر گرنگی فێربوونی زانستی شەرعی، چونکە ئەو گەنجە ئەگەر پێشتر ئەو زانستەی نەبووایە سەبارەت بەخەسڵەتی دەجال، ئەوادەجاڵی بۆ ئاشکرا نەدەبوو، بۆیە پێویستە لەسەر هەموو کەسێک خۆی چەکدار بکات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خەڵکی خراپەکارو گومڕا.

ئەم گەنجەش دڵنیای کردەوە کە ئەوە دەجاڵە، و ئەم جۆرە کوشتنەی بەهیچ جۆرەکەسێکی دیکە نەکردووە، چونکە ئەو گەنجە قوتابی بووە بێگومان حەدیسی پێغەمەری خوێندۆتەوە، ئاشکراشە کەوا دەجاڵ گەنجی مەبەستە.

## خۆئامادەکردن بۆ شەڕکردنی هەروەک ئیماندارەکان لەوزەماندا کردیان:

لەئەبوهوریرەوە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((فبينما هم (أي المسلمون) يعدون للقتال يسوون الصفوف، إذ أقيمت الصلاة فينزل عيسى ابن مريم..)) **واتە: ((لەکاتێکدا موسڵمانەکان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ شەڕکردن لەگەڵ دەجال و ڕیزی خۆیان یەکدەخەنەوە، لەکاتێکدا نوێژ دادەبەستن لەو کاتەدا عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت.))** موسلیم ریوایەتی کردووە

وەلە حذیفەی کوڕی ئەسید رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ لەبارەی دەرچوونی دەجال و خۆئامادەکردنی مەهدی و هاوەڵانی بەشەڕکردن لەگەڵیدا، دەفەرموێت: ((حتى يأتي المدينة ، فيغلب على خارجها ويمنع داخلها ، ثم جبل إيلياء (بيت المقدس) فيحاصر عصابة من المسلمين ، فيقول لهم الذين عليهم ما تنتظرون بهذا الطاغية أن تقاتلوه حتى تلحقوا بالله أو يفتح لكم ، فيأتمرون أن يقاتلوه إذا أصبحوا ، فيصبحون ومعهم عيسى ابن مريم)) **واتە: ((تاوەکو دێت بەرەو مەدینە بەسەر دەرەوەیدا زاڵ دەبێت، بەڵام ناومەدینەی لێ قەدەغە دەکرێت، پاشان دەچێتە چیای ایلیاء (بيت المقدس)، ئینجا کۆمەڵێک لەموسلمانان گەمارۆی دەدەن، ئیماندارەکان ڕووبەڕووی شەڕێکی توند دەبنەوە، جا بەوانە دەڵێت کە دژیانن چاوەڕێی چی دەکەن لەو خوانەناسە شەڕی لەگەڵدا بکەن تاوەکو دەگەن بەخودای گەورە یان بۆتان رزگار دەکات، جا فەرمانیان پێ دەکەن شەڕی لەگەڵدا بکەن، وەدەبینن عیسای کوڕی مەریەم لەگەڵیاندایە..))** حاکم ریوایەتی کردووە.

## موسلمان چی بکات لەکاتی گەیشتن بەدەجال :

ئەوەی هاتووە لە أبی امامە الباهلی رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((..وإنه مكتوب بين عينيه كافر يقرؤه كل مؤمن ، فمن لقيه منكم فليتفل في وجهه وليقرا فواتح سورة الكهف، وإنه يسلط على نفس من بني آدم فيقتلها ثم يحييها)) **واتە: ((...لەنێوچەوانیدا نوسراوە کافر هەموو ئیماندارێک دەیخوێنێتەوە، جاهەرکەسێک لەئێوە پێی گەیشت یا لەبەری رابکات، وەسەرەتای سوورەتی اصحاب الکهف بخوێنێت، چونکە دەجال زاڵ دەبێت بەسەر دڵ و دەروونی نەوەی ئادەم دەیکوژێت پاشان زیندووی دەکاتەوە))** حاکم ڕیوایەتی کردووە

أبو قلابە لەپیاوێک کەهاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە ریوایەتی کردووەو دەڵێت : کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((ثم ان من بعدكم، أو ان من ورائكم الكذاب المضل، وان رأسه من ورائه حُبُكٌ حُبُك وإنه سيقول، أنا ربكم، فمن قال: كذبت لست ربنا، ولكن الله ربنا، وعليه توكلنا، وإليه انبنا ونعوذ بالله منك، قال: فلا سبيل له عليه)) **واتە: ((پاشان لەپشت ئێوە یان لەدواوەی ئێوە درۆزنێکی گومراکەر پەیدادەبێت، کەوا سەری لەدواوە پارچەپارچەیە (دەڵێت : من خوای ئێوەم، جا هەر کەسێک بڵێت : درۆت کرد تۆ خوای ئێمە نیت، بەڵام خوای گەورە خوای ئێمەیە، وە پشت و پەنا بەو دەبەستین، وە بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە، وە پەنادەگرین بەخودای دلۆڤان لەتۆ، دەڵێت: هیچ شتێک ڕێگری ناکات ئیلا دەچێتە بەهەشت ))** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.

# تیاچوونی دەجاڵ

## لەووڵاتی شام :

لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت ((يأتي المسيح من قبل المشرق ، همته المدينة ، حتى ينزل دبر أحد ، ثم تصرف الملائكة وجهه قبل الشام ، وهنالك يهلك)) **واتە: ((مەسیحی دەجال لەڕووی ڕۆژ هەڵاتەوە دێت وە مەبەستی یەکەمی شاری مەدینەیە، هەتا کاتێک دەگاتە پێش چیای ئوحود فریشتەکان رووبەرووی دەبنەوە ڕووی پێ وەردەگێڕن بەرەو ووڵاتی شام، ولەوێ تیادەچێت))** موسلیم ریوایەتی کردووە.




## بکوژی دەجال
## عیسای کوڕی مەریەمە علیه السلام

مجمع کوڕی جاریە رەزای خوای لێبیت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویت ((يقتل ابن مريم الدجال بباب لدّ)) **واتە: ((عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لێبێت دەجال دەکوژێت لە (باب لد))** ترمذی ریوایەتی کردووە.

((باب لد)) شارۆچکەیەکە نزیک بیت المقدس یەکێکە لە ناحیەکانی فەلەستین.
وەلەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((فبينماهم (أي المسلمون) يعدون للقتال يسوون الصفوف إذ أقيمت الصلاة فينزل عيسى ان مريم.))
**واتە: ((لەکاتێکدا موسلمانەکان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ شەرکردن، وەریزی خۆیان رێک دەخەنەوە، وە قامەت دەکەن بۆ نوێژی بەیانی لەوکاتە عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت))**
موسلیم ریوایەتی کردووە

**وفي رواية** ((فينزل - يعنى عيسى عليه السلام - عند المنارة البيضاء شرقي دمشق بين مهرودتين (يعني ثوبين مصبوغين) واضعاً كفيه على اجنحه مَلَكين، إذا طاطا رأسه يقطر ماءاً، وإذا رفعه تحدر منه جمان كاللؤلؤ، فلا يحل لكافر ان يجد ربح نفسه إلا مات))
**واتە:** لەڕیوایەتێکی دیکە (عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێبێت) لەلای (منارە البیضاء) لەرۆژهەڵاتی دیمەشق لەنێوان دوو پۆشاکی رەنگ کراودا هەردوو دەستەکانی لەسەر باڵی دوو فریشتەداناوە کاتێک سەری بەرزو نەوی دەکات و دڵۆپە ئاوی سافی لێ دەتکێت، کەسەری بەرز دەکاتەوە دەنکەزیوی شێوەمرواری لێ دەتکێت، وە هیچ کافرێک نیە کەبۆنی عیسای بۆ بچێت ئیلا دەمرێت)) موسلیم ریوایەتی کردووە
بەمانای ئەو کافرانەی کەلەوبازنەدا کەلەنیوە تیرەکەدان بەئاستی بینینی چاوی عیسا علیە السلام هەموویان دەمرن.

پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوەلەکاتی دابەزینی عیسا علیە السلام موسڵمانەکان خۆیان ئامادەکردووە بۆ نوێژی بەیانی ئەوکاتە سەرکردەو پێشەوایان مەهدیە لەکاتێکدا پێشەوایەکەیان پێشیان دەکەوێت بۆ دەست پێکردنی نوێژی بەیانی لەوکاتەدا عیسا علیە السلام دادەبەزێتە سەریان، جا پێشەوایەکە (واتە: مەهدی) دەگەڕێتەوە دواوە لەشوێنی ئیمام چونکە عیسا لەو باشترە بۆیە دەیەوێت، باشترەکە ئیمامەتی بکات، جا عیسا دەستی لەنێوان، هەردوو شانی دادەنێت و پاشان پێی دەفەرمووێت: پێشکەوەو پێش نوێژیان بۆ بکە چونکە قامەتیان بۆ تۆکردووە ( وەئەمەش رێزێکە لەلایەن خودای میهرەبانەوە بۆ ئەو ئوممەتە کەوا پیاوێک لەئوممەتی محمد ﷺ هەیە، پێش نوێژی بۆ عیسا علیە السلام دەکات.

ئینجا پێشەوایەکەیان پێش نوێژیان بۆ دەکات (جا کاتێک ئیمام نوێژەکەی تەواو کردو هاتەدەرەوە لەنوێژەکە)، عیسا علیە السلام دەفەرمووێت: دەرگاکە بکەنەوە.
جا دەرگاکە دەکەنەوە دەجالیش لەپشت دەرگاکەیە حەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵدایەو هەموویان خاوەنی شمشێرو قەڵغانن.



کاتێک دەجال سەیری عیسا علیه السلام دەکات دەتوێتەوە، وەک چۆن خوێ لەناو ئاو دەتوێتەوە، جا ڕادەکات و عیساش علیه السلام لە(باب لد) دەیگاتێ (کەشوێنێکی ناسراوە لەفەلەستین ئێستا جولەکە بنکەیەکی سەربازی تێیدا دروست کردووە) لەوێ دەیکوژێت، جا ئەم پیس و خوانەناسە دەتاوێتەوە هەروەک چۆن خوێ لەناو ئاو دەتاوێتەوە، بەڵام عیسا علیه السلام، دەگاتە سەری و بەو ڕمەی لەدەستیەتی لێیدەدات و شوێنی لێدانی ڕمەکە خوێنی پێوە دەبێت و هەموویان دەیبینن.

پاشان خوای گەورە لەسەردەستی عیسا علیه السلام جوولەکە لەناو دەبات و هیچ شتێک نامێنێت کە جوولەکە خوی لەپشت بشارێتەوە، ئیلا خوای گەورە بەزمانی دەهێنێت تەنها داری (الغرقد) نەبێت (ئەمە جۆرە دارێکی جوولەکەکانە).





وێنەیەك لەداری غرقد

لەریواتێکی دیکەدا لەمجمع کوڕی جاریە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموویت ((حتى يأتي المدينة، فيغلب على خارجها ويمنع داخلها، ثم يأتي جبل إيليا (أي: بيت المقدس) فيحاصر عصابة من المسلمين، ويلقى المؤمن شدة شديدة، فيقول لهم الذين عليهم، ما تنتظرون بهذا الطاغية أن تقاتلوه حتى تلحقوا بالله أو يفتح لكم، فيأمرون أن يقاتلوه إذا أصبحوا، فيصبحون ومعهم عيسى بن مريم، فإذا رفع رأسه من ركعته قال: سمع الله لمن حمده، قتل الله المسيح الدجل، وظهر المسلمون، فيقتل الدجال ويهزم أصحابه حتى ان الشجر والحجر والمدر يقول: يا مؤمن هذا يهودي عندي فاقتله)) **واتە:** ((دەجال تاوەکو دێت بەرەو مەدینە بەسەر دەرەوەی شارەکە زاڵ دەبێت بەڵام ناو شاری لێ قەدەغەکراوە، پاشان دێتە چیای ئیلیا (واتـە: بيت المقدس) لەوێ دەجال کۆمەڵێک لەموسلمانانی گەمارۆداوە، وە ئیماندارەکان خۆیان تووند دەکەن، دەڵێن بەوانەی لەدژیان وەستاون، چاوەڕێی چی دەکەن لەو گومڕاو خوانەناسە تاوەکو دەگەن بەخوای گەورە، یان بۆتان ڕزگار دەکات، جا فەرمان دەکەن شەڕیان لەگەڵ بکەن ئەگەر شەڕ ڕوویدا، جا شەڕ دەست پێدەکات و عیسای کوڕی مەریەمیش علیه السلام، لەگەلیاندایە، جا کاتێک سەری بەرز دەکاتەوە لەرەکەعاتەکەی و دەڵێت : سمع الله لمن حمده، خودای گەورە مەسیحی دەجال دەکوژێت، وە موسڵمانەکان دەردەکـەون، دەجال دەکوژرێ و شوێنکەوتووانی دەدۆڕێن، تاوەکو داروبەردی ئەم ناوە دەڵێت : ئەی ئیماندار ئەوە جووەلەکەیە خۆی لەپشت من شاردۆتەوە وەرەبیکوژە)) حاکم ریوایەتی کردووە.

**وفي رواية** ((حتى يدركه بباب لد فيقتله )) **واتە:** لەریوایەتێکی دیکە : تاوەکو لەباب لد، دەگاتە دەجال و دەیکوژێت

پاشان عیسای کوری مەریەم علیه السلام دێتە ناو ئەو قەومەی کە خودای گەورە پاراستوونی لەدەجال، دەست بەڕوویان دادەهێنێت و باسی پلەو پایەکانیان بۆ دەکات لەبەهەشتدا، لەکاتێکدا خوای گەورە سروش بۆ عیسا دەنێرێت: من بۆ بەندەکانم یەئجووج و مەئجووجم دەرخست کەهیچ کەسێک توانای نیە شەڕی لەگەڵدا بکات جا ئەی عیسا بەندەکانی من کۆبکەرەوە بۆ کێوی تور لەوێ خۆتانی بۆ قایم بکەن.

## توندترین خەڵک دژ بەدەجال:

ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت: بێگومان من بەنی تەمیمم زۆر خۆشدەوێت، پاش ئەوەی سێ جار گوێم لەپێغەمبەر بوو ﷺ لەبارەی ئەواندا دەیفەرموو ((هم أشد أمتي على الدجال)) **واتە: ((ئەوان توندترین ئوممەتی منن دژ بەدەجال))** جا خێرو چاکەکانیان

هات، فەرمووی (ئەوە سەدەقەو چاکەی قەومی ئێمەیە) جاریەیەک لەبەنی تەمیم لەلای عائیشە بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((اعتقيها، فإنها من ولد اسماعيل)) **واتە: ((ئەی عائیشە ئازادی بکە چونکە ئەو جاریەیە لەنەوەکانی ئیسماعیلە))** متفق عليه.

لەعکرمەی کوڕی خالدەوە دەڵێت پیاوێک لەسەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕامەوە کەواچەند پیاوێک لەبەنی تەمیم لەلای پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت باسی خۆیانی بۆکرد، پیاوێک ووتی: پەلەمەکە لەئیش وکارەکانی بەنی تەمیم، جا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت سەیرێکی کردوو فەرمووی ((ما أبطأ قومٌ هؤلاء منهم)) **واتە: ((لەسەرەخۆ نابم (واتە: پەلەدەکەم) لەکارو باری قەومێک کەئەوانە لەوانن))**

وەجارێک پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کەلەبەنی تەمیم بوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((لاتقل لبني تميم إلا خيراً، فإنهم أطوَل الناس رمحاً على الدجال)) **واتە: ((هیچ شتێک لەبارەی بەنی تەمیم مەڵێن تەنها ئەگەر خێروچاکە بێت، چونکە ئەوان خۆڕاگرو توندترین خەڵکن کە شمشێریان هەردەم دژی دەجال دەبێت))** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.

تەمیمی کوڕی مری کوڕی تابخەی کوڕی ئەلیاسی کوڕی مضری کوڕی نزاری کوڕی معدی کوڕی عەدنان

| | | |
|---|---|---|
| عمرو | عمرو | زيد مناة |
| الحارث الحبط | العنبر | مالك |
| سعد | جندب | حنظلة |
| نبار | عدي | مالك |
| عمرو | جهمة | أبي سعود |
| جلدة | منذر | ربيعة |
| سيف | عبدالله | شهاب |
| اوس | الندا | زهير |
| عمرو | عمرو | شداد |
| يزيد | الحارث | نهشل |
| حصين | جندب | سنيع |
| عباد | عدي | عنبة |
| ناصر - النوصر | عبادة | مسعود |
| رحمة - آل رحمة | صلاءة | موسى |
| | مخرب | قاسم |
| | حمادة | وهيب |
| | | علو |
| | | محمد |
| | | محمد - آل محمد |

## درەختی بنەماڵەی بەنی تەمیم

## ئەوانەی دەرچوونی دەجال ڕەتدەکەنەوە:

هەر لەکۆنەوە هەندێک کۆمەڵ و تاخمی گومڕا دەرکەوتنی دەجال ڕەتدەکەنەوە، وەک مەعتەزیلەکان و جەهەمیەکان.

### وەئەوانەی ئەم باسە ڕەتدەکەنەوە :

### شێخ محمد عبده :

*محمد عبده کوڕی حسن خیرالله لەبنەماڵەی تورکمانیە، لەسەر دەمی خۆی موفتی (الدیار المصری) بووە، لەشاری ئەسکەندەریە لەساڵی ١٩٠٥ زاینی کۆچی دوایی کردووە، لەقاهیرە نێژراوە.*
*لەبارەی دەجال دەڵێت : دەجال تەنها دروشمێکە لەئەفسوون و فرت و فێڵ و قسەی پڕو پووچ و بێ مانا.*

### محمد فهیم ابوعیبە :

*لێکۆلەری کتێبی ابن کثیر (النهایة فی الفتن والملاحم)ە.*
*لەڕوونکردنەوەکەیدا لەسەر حەدیسەکانی دەجال کەلە کتێبەکەی ابن کثیر (النهایە فی الفتن والملاحم) دا دەڵێت (ئەمە دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی خراپەکاری و شەڕو فەساد) .*

### وەهەندێکی تر دەڵێن :

*دەجال دەردەکەوێت بەڵام فیتنەکانی بەهەشت و ئاگری لەگەڵدانیە، لەوانە : شێخ محمد رشید رضا – کەخاوەنی زانست و چاکیە بەڵام لەو مەسەلەیەدا هەڵەی کردووە – وە درۆی بەشتێک لەنیشانەکانی رۆژی دوایی کردووە کە هەڵەیەکی گەورەیە.*

### شێخ محمد رشید رضا :

*محمد رشید کوڕی علی رضا کوڕی محمد شمس الدین کوڕی محمد بهاء الدین کوڕی منلا علی خلیفە القلمونی)ە کە خەڵکی بەغدایە و بەئەسڵ حوسەینیە، لە (قلمون) لەدایک بووە و گەشەی کردووە، لەوێ لەتەرابلوس خوێندوویەتی، پاشان کۆچی کردووە، بۆ میسر لەساڵی ١٣١٥کۆچی، ئینجا هۆگری شێخ محمد عبده بووە و بووەتە قوتابی ئەو، بەکارەساتی ئۆتۆمبێل لەناکاوی مردووە، کەلەسوێس*

دەگەڕایەوە بۆ قاهیرە، هەر لەقاهیرەش نێژراوە.
بەناوبانگترین بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (المنار)ە کە ٣٢ بەرگی لێ دەرچووە، وە (تفسیر القران الکریم) دوازدە بەرگ، بەڵام تەواوی نەکرد.

**ئیبنو عەباس** ڕەزای خوای لەسەر بێت دەگێڕێتەوەو دەڵێت : (عومەری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لەسەر بێت ووتاری دەدا، جا سوپاسگوزاری خوای گەورەی کرد لەسەری ئینجا ووتی : ئایا ئێوە نازانن کەلەدوای ئێوە قەومێک پەیدا دەبێت درۆ بەڕەجم بەو کەسانەی زینادەکەن وە دەجال دەبەن، وە عەزابی قەبرو شەفاعەت و ئەو کەسانە دەخرێتە ناو ئاگرو بەڵام بەرشەفاعەت دەکەون و دێنە دەرەوە بەدرۆی دەخەنەوە) ئەحمد ریوایەتی کردووە.

## وەکۆتایی بەقسەکانم دەهێنم لەبارەی دەجال بەباسکردنی پێنج مەسەلە :

**١** ئەبی سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((ألا أخبركم بما هو أخوف عليكم عندي من المسيح الدجال؟ الشرك الخفي، أن يقوم الرجل فيصلي فيزين صلاته لما يرى من نظر رجل))
**واتە: (ئایا شتێکتان پێ بلێم بەوەی کەلێتان دەترسم لەکارێک لەلای من لەمەسیحی دەجاڵ گەورەتر؟! هاوبەش پەیداکردنی نادیارو شاراوە، کاتێک پیاوێک نوێژ دەکات نوێژەکەی خۆی دەڕازێنێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی تەماشابکات ))** ئەحمەد و ابن ماجه ڕیوایەتیان کردووە.
ڕیاکردن کارێکی زۆر ترسناکە ئەوەیە پیاوێک کارێکی جوان وچاک دەکات تەنها مەبەستیەتی خەڵک تەماشای بکات و حەمدوو سەنای بکەن، ئەمەش هاوبەش دانانێکی شاراوەیەو کارەکەی لێ بەفیڕۆ دەچێت، وە لەڕۆژی قیامەتدا بەخاوەنی ڕیاکاران دەوترێت: بڕۆن بۆلای ئەو کەسانەی لەدنیاداکارەکانی ئێوەیان تەمەشا دەکرد، جا سەیرکەن ئایا ئەوان لێرەدا هیچ پاداشتێکیان بۆ ئێوە هەیە)) ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

**٢** ئەبی ذر ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((غير الدجال أخوف على أمتي من الدجال، الأئمة المضلون)) **واتە: ((جگە لەدەجال شتێک دەمترسێنێ لەسەر ئوممەتەکەم، لەدەجاڵ گەورەتر، ئیمام و پێشەوا گومڕاکانە)** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە
پێشەوایەتی کردن و سەرکردایەتیەکی گومڕاکارانە زۆر ترسناکە لەسەر ئەم گەلە

مەزنە، ئەگەر هاتوو بەرپرسی خەڵک کاریگەرێکی گومرا کار بێت ئەوا ئەوەی ژێرەوەی خۆیشی گومرا دەبێت، وە پێشەوا گومرا کارەکانیش لەدنیادا پادشاکان و ئەمیرەکان و وەزیرەکانن، وەلەئاییینیشدا وەک زاناکان و بانگەوازکارانن، جا ئەگەر لەناو خەڵکدا پێشەوای گومرا دەرچوون ئەوا کارو کردەوەکانیان فەسادو خراپەکاری دەبێت.

٣ عمران کوری حصین رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لاتزال طائفة من أمتـي يقاتلون على الحق ظاهرين على من ناوءهم حتى يقاتل آخرم المسيح الدجال )) **واتە: (بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتی من شەرو جەنگ دەکەن لەسەر حەق و دیارن لەسەر ئەوانەی دژایەتیان دەکات تاوەکو شەر دەکەن لەگەڵ کۆتاییەکەیان کەمەسیحی دەجالە )** ئەحمەد و ابوداود ریوایەتیان کردووە.

دەرکەوتووە کە بزووتنەوەی جیهاد و خەبات کردن لەناو ئەو ئوممەتەدا بزووتنەوەیەکی یەک لە دوای یەکدا بووە، کەوا سەرەتایەکەیان و کۆتاییەکەیان، هەندێک لەگەڵ هەندێکی دیکەدا دابووە، ئەم بزووتنەوە جیهادیە ناپچرێت تاوەکو کۆتایی ئوممەتەکە شەڕ لەگەڵ دەجال دەکات.

٤ خۆ راگری و کۆڵنەدان لەبەرامبەر فیتنەوئاژاوەکاندا بنچینەیەکە لەبنچینەکانی شەریعەتدا بۆیە پێغەمبەر ﷺ کاتێک باسی فیتنەو ئاژاوەدەکات لەبارەی دەجال دەفەرمووێت ((یاعباد الله فاثبتوا)) **واتە: ((ئەی بەندەکانی خوا خۆراگربن))** موسلیم ریوایەتی کردووە.



٥ وە ئەگەرنا هەست بەرەشبینی و نەمانی باوەڕ بەو حەدیسانە دەکەین کەباس لەفیتنەو ئاشووبەکان دەکات، بەڵکو دەبێت سوور بین لەسەر زیاد کردنی ئیمان و بیرو باوەرو خۆراگری.

کاتێک وورد دەبینەوە لەو حەدیسانەی لەبارەی دەجال و ئەوانی دیکە دەبینن کەوا شەڕ کردن لەکۆتایی زەماندا بەچەکی سپی دەبێت، ئەویش شیروتیرو شمشێرو بەکارهێنانی ئەسپە.




**عیسا** (علیه السلام) پێغەمبەرێکە لەپێغەمبەرەکانی خودای گەورەو شکۆدار، لەپێغەمبەرە گەورەونزیکەکانە، خودای بەخشندەو بەتوانا بەوە ناوبانگی پێ دەرکرد کە لە دایکێکی بێ باوک لەدایک بوو، ئەویش مەریەمی دایکی عیسایە (علیه السلام) کەجیا کراوەتەوە بە ئافرەتێکی داوێن پاک، وە لەمیحرابدا خواپەرستی دەکرد و خودای گەورەش ڕزق و ئازووقەی دەدا.



خودای گەورە دەفەرموێت **كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ** (٣٧) آل عمران ٣٧

**میحرابی زەکەریا علیه السلام، ئەمە جارێکی تر نۆژەن کراوەتەوە، دڵنیاش نیە ئەمە ئەوە بێت کەوا لەقورئاندا باسکراوە.**

**واتە// ((هەرکاتێک زەکەریا دەچووە بۆ سەردانی لەشوێنی خواپەرستیەکەیدا**

**دەیبینی رزق و رۆژی و نازو نیعمەتی جۆراو جۆری لایە، زەکەریا ووتی: ئەی مەریەم ئەم هەموو رزق و رۆزییەت لەکوێ بوو؟! مەریەم لەوەلامیدا ووتی: ئەوە لەلایەن خواوەیە، ئەو بۆم دەنێرێت، بەراستی خوا بەهەرکەس بیەوێت رزق و رۆزیی بێ سنوورو بێ هۆکار دەبەخشێت))**

زەکەریا (علیه السلام) شوێنێکی پیرۆزی لەمزگەوت بۆ مەریەم دانابوو جگە لەو کەس نەدەچووە ژووری، کەوا شەو ورۆژ لەوێ خواپەرستی تێدا دەکرد جا هەر کاتێک پێغەمبەر زەکەریا دەچووە شوێنی خواپەرستیەکەی دەیبینی لەزستاندا میوەی هاوینە، وە لەهاویندا میوەی زستانەی لایە، لەمەریەی دەپرسی: (ئەم هەموو رزق و رۆزییەت لەکوێ بوو)) مەریەم دەیگووت : هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ (**ئەوە لەلایەن خواوەیە**)، واتە رزقێکە خوای گەورە رزقی دەدات إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ (**خوا بەهەرکەس بیەوێت زرق و رۆزیی بێ سنوورو بێ هۆکار دەبەخشێت**)

موژدەی فریشتەکان بۆ مەریەم، خودای گەورە دەفەرموێت وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٤٢) يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ (٤٣) آل عمران ٤٢ - ٤٣ **واتە//** ((**جوبریلی فریشتە ووتی: ئەی مەریەم بەراستی خوا تۆی هەڵبژاردووەو خاوێن و پاکیزەی کردوویت، هەڵی بژاردیت و رێزی داویت بەسەر هەموو ئافرەتانی جیهاندا (٤٢) ئەی مەریەم ملکەچ و فەرمانبەرداری پەروەردگارت بە، سوژدەو کڕنۆشی بۆ ببە لەگەڵ کڕنۆشبەراندا**))

خوای گەورە باسدەکات کە فریشتە مزگێنی بەمەریەم داوە کەوا خوای گەورە تۆی هەڵبژاردووە لەنێو هەموو ئافرەتانی زەمانی خۆی، بەوەی هەڵیبژاردووە بۆ هێنانەکایەی کورێک لێی بەبێ باوک، وە موژدەشی پێدرا کە دەبێتە پێغەمبەرێکی پیرۆز أَنِّي وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا آل عمران ٤٦ **واتە//** ((**جا عیسا لەبێشکەدا وە بەگەورەیش، قسەدەکات بۆ خەڵکی لەپیاو چاکانیشە**))

واتە هەر لەمنداڵیەوە بانگەوازی ئەوانی دەکرد بۆ پەرستنی خوای تاک و بێ هاوبەش،

هەروەها لەکاتی گەورە بوونیشی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کاتێک گەورە دەبێت دوعاو پاڕانەوەش بۆ دایکی دەکات، وەفەرمانی پێکراوە بەخواپەرستی و ملکەچی و سوژدەو کڕنۆشی زۆر بردن، بۆ ئەوەی ببێتەخاوەنی ئەو کەراماتەو سوپاس گوزاری ئەو نیعمەتەبکات، لەبارەی مەریەم وتراوە کاتێک هەڵدەستا بۆ نوێژ کردن ئەوەندە دەمایەوە تاوەکو پێیەکانی دەقلیشاو درزی دەبرد، ڕەحمەتی خودا لەمەریەم ڕەزای خوای لەسەر بێت وە دایک و باوکی بێت.

لەئەنەسەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((حسبك من نساء العالمين بأربع، مريم بنت عمران، وآسية امراة فرعون، وخديجة بنت خويلد، وفاطمة بنت محمد )) **واتە:** **(( ئەمە بەسە کە ئەم چوار ئافرەتە لەباشترین ئافرەتانی جیهانن، مەریەمی کچی عیمران، وە ئاسیەی خێزانی فیرعەون، وە خەدیجەی کچی خوەیلد، وەفاتیمەی کچی محمد ))** ترمذی ریوایەتی کردووە.

## چیرۆکی سکپڕبوونی مەریەم بەعیسا (علیه السلام)

کاتێک فریشتەکان قسەیان لەگەڵ مەریەم کرد بەپێدانی موژدە بەوەی کەوا خوای گەورە هەڵیبژاردووە، کە خودای مەزن و دلۆڤان منداڵێکی دواێن پاک و زیرەکی پێ دەبەخشێت دەبێتە پێغەمبەرێکی بەخشندەو پاک کەهەندێ موعجیزەی پێ دەبەخشرا، جا مەریەم سەری سوڕما لەبوونی منداڵێکی بێ باوک، چونکە ئەو هێشتا مێردی نەکردووە، جا فریشتەکان هەواڵیان پێدا، بەوەی کە خودای مەزن لەسەر هەموو شتێک بەتوانایە ئەگەر وویستی وابوو فەرمانێک بکرێت ئەو کاتە پێی دەڵێت (کن فیکون) ببە جا دەبێت.

ئەو کاتە مەریەم ملی بۆ ئەمە کەچ کردوو ڕووی کردە لای خوداو تەسلیمی فەرمانی خودای بەرزو بەتوانا بوو، وە زانیشی ئەمە بەڵاو کارەساتێکی گەورەیە بۆ ئەو، وە خەڵکی قسە دەکەن لەبارەی ئەو شتەی بەسەری هاتووە، چونکە ڕاستی فەرمانەکە نازانن، بەڵکو ئەوا دەڕواننە ئەو حاڵەتەی کەمەریەم تێیدایە بێ بیرکردنەوەو بێ بۆ چوونی ئەقل.

مەریەم ئەو کاتانە لەمزگەوت دەهاتە دەرەوە، لەکاتێکدا تووشی بێنوێژی یان بۆ پێداویستیەکی زەروری وەک ئاو خواردنەوە یان وەرگرتنی خۆراک دەبوو.

جا بۆ هەندێک ئیش و کاری خۆی دەرچوو، فَٱنتَبَذَتۡ **کەنارگیری دەکرد** بەتەنیا دوور لەکەس وکاری شوێنێکی لەڕۆژهەڵاتی مزگەوتی ئەقسا هەڵبژارد، جا خودای میهرەبان جوبریلی پاک و خاوێنی (علیه السلام) بۆ ڕەوانە کرد فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا **وەکو بەشەرێکی تەواو** خۆی خستە بەرچاوی، کاتێک مەریەم جوبریلی (علیه السلام) بینی

قَالَتْ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا **مەریەم ووتی: من پەنا دەگرم بەخوای میهرەبان لەتۆ کەسێکی بەتەقواو لەخواترس بیت**، کەوا تۆ پیاوێکی بەتەقواو لەخودا دەترسیت، جا پەنا گرتنەکەم قەبول بکە بەخوای گەورەو میهرەبان لەخۆت، لێم دوورکەوە قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا واتە: **جوبرەئیل ووتی: (مەترسە) دڵنیابە من تەنها نێردراوی پەروەردگاری تۆم، تامنداڵێکی خاوێنت پێ ببەخشم،** جوبریلی فریشتە قسەی لەگەڵدا کردوو ووتی: من ئادەمیزادنیم، بەڵکو من فریشتەم خودای گەورە منی ڕەوانە کردووە بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی منداڵێکی پاک و خاوێنت پێ ببەخشم، قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ **مەریەم ووتی: جا چۆن منداڵم دەبێت** وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا **لەکاتێکدا شووم نەکردووە و هیچ کارێکی فاحیشەو داوێن پیسیم نەکردووە!** قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ **دەفەرموویت: ئەو کارە لای من ئاسانە، جا جوبریل وەلامی سەر سوڕمانیەکەی دایەوە لەبوونی منداڵێک پێی، ووتی: ئەمە وەعدو بەڵێنی خودای دلۆڤانە، کەوا لەتۆ منداڵێک خەلق دەکات** هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ **ئەو کارە لای من ئاسانە**، کەبەبێ باوک ئەو منداڵە بهێنمە کایەوە، وە ئەو لەسەر هەموو شتێک بەتوانایە، وە هەروەها دەفەرموویت وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ **بۆ ئەوەی بیکەمە نیشانەو موعجیزەیەک بۆ خەڵکی**، بۆ ئەوەی ئەم دروستکراوە بەڵگەیە لەسەر تەواوی توانامان بەسەر هەموو جۆرە دروستکراوێک، ئەویش خودای بەرزو بەتوانایە.

- **دروستکردنی ئادەم بەبێ نێرومێ**
- **دروستکردنی حەوا لەپیاو بەبێ ئافرەت.**
- **وە دروستکردنی عیسا لەئافرەت بەبێ پیاو.**
- **وە دروستکردنی دروستکراوەکانی دیکە لەپیاو ئافرەت.**

خودای گەورە دەفەرموویت وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا التحریم/١٢ ( **مەریەمی کچی عیمرانیش کەداوێنی خۆی بەپاکی ڕاگرت، ئێمەش لەو ڕۆحەی کەبەدەستمانە، فوومان پێداکرد**

واتە جوبریل فووی کرد لەگیرفانی بەروانکەکەی مەریەم، جا فووەکە دابەزی بۆ دامێنی و

یەکسەر سکی پڕبوو، هەروەک ئافرەتێک لەکاتی جووتبوون لەگەڵ پیاوەکەی سکی پڕدەبێت، وەکاتێک لەرۆحەکە فووەکەی پێداکرد فریشتەکە توخنی دامێنی نەکەوت بەڵکو فووەکەی کردە گیرفانی لەکاتەدا فووەکە دابەزی بۆ دامێنی مەریەم و ڕێگای خۆی گرت، هەروەک خودای گەورە دەفەرموویێت : **فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا** واتە **لەو رۆحەی کەبەدەستمانە فوومان پێداکرد** هەروەها دەفەرموێت **فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا** مریم ٢٢ **دەستبەجێ مەریەم سکی پڕ بوو ( بەغەم و پەژارەوە) بەرەو شوێنێکی دوور رۆیشت.**

کاتێک مەریەم سەلامی خوای لێبێت سکی پڕ بوو،بەروانکەکەی لەبەری تەسک بۆوە، زانی کەخەڵکی لەبارەیەوە قسە دەکەن، جاکاتێک دیاردەی سکپڕی لێ بەدیارکەوت لەخەڵکی دوور کەوتەوەو کەنارگیری گرت و بەرەو شوێنێکی دوور ڕۆیشت.

## لەدایک بوونی عیسا (علیه السلام)




خودای گەورە دەفەرموێت **فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا (٢٣)** مریم / ٢٣

**ئینجا ژانی منداڵ بوون گرتی و بردی بۆلای قەدی دارخورمایەک (بەدەم ئاهوو ناڵەوە) دەیووت، خۆزگە پێش ئەو حاڵەتە بمردمایەو وەک شتێکی بی نرخ فەرامۆش بکرامایە.**

مەریەم لەبەر توندی ژانی سکپڕی شپرزەبوو چووە لای قەدی دارخورمایەک، لە (بیت لحم) جا تەمەننای مردنی بۆ خۆی دەکرد، چونکە دەیزانی خەڵک درۆو بوختانی پێدەکەن و باوەڕی پێناکەن، بەڵکو تاوانباری دەکەن لەوکاتەی بەمنداڵەوە کەلەدەستیەتی دێتەوە لایان، چونکە مەریەم لەلای ئەوان یەکێک بوو لەخواپەرستەکانی مزگەوت، وە لەبنەماڵەی پێغەمبەران و

ئاێنەکان بوو، خەم و خەفەتێکی زۆری هەڵگرت بەو هۆیەوە بۆیە تەمەنناى مردنی خۆی دەکرد پێش ئەوەی ئەو حاڵەتەی بەسەر هاتبایەو یاخود هەر دروست نەکرابایە.

**فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ واتە/ (ئەو منداڵەی کەلەدوایینی بەربۆوە لەژێریەوە بانگی دایکی کرد)، أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا واتە/ (دایەگیان خەفەت مەخۆ، ئەوەتە پەروەردگارت بەبەردەمتدا رووبارێکی جاری کردووە)**

کاتێک عیسا (علیه السلام) لەدایک بوو مەریەم زۆر خەفەتی دەخوارد بۆیە بەئیزنی خوا عیسا هاتە قسەو بەدایکی گوت دایەگیان خەفەت مەخۆ، ئەوەتا پەروەردگارت بەبەردەمتدا جۆگەلەیەکی ئاوی جاری کردووە.

**﴿ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ فَكُلِى وَٱشْرَبِى وَقَرِّى عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِىٓ إِنِّى نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾ ﴾** مریم/ ٢٥-٢٦

**واتە/ (ئەودارخورمایەش (کەپاڵت پێوە داوە) کەمێک ڕایوەشێنە خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێت (٢٥) ئینجا لەو خورمایە بخۆو، لەو ئاوەیش بخۆرەوە، خەمیشت نەبێت، ئەگەر کەسێکت لەخەڵکی بینی و (پرسیاری لێکردی)، ئەوا بە ئیشارەت تێی بگەیەنە پێی بڵێ بەڕاستی من بڕیارم داوەو نەزرم کردووە بە ڕۆژو بم بۆ خودای میهرەبانم، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ من هەرگیز قسە لەگەڵ کەسدا ناکەم (٢٦) ).**

خودای گەورە بەمەریەمی فەرموو: بخۆو بخۆرەوە، پاشان منداڵەکەت هەڵگرەو بڕۆ بۆ لای قەومەکەت ئەگەر یەکێکت دیت پرسیاری لێکردی ئەوا بەئیشارەت پێی بڵێ: من نەزرم کردووە بۆ پەروەردگاری خۆم بەڕۆژوبم، واتە بێدەنگ بم.

**﴿ فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ ﴾** مریم/٢٧-٢٨

**واتە/ (ئەوسا مەریەم منداڵی نازداری خۆی لەباوەش گرت و بردی بۆلای خزم و کەس و کاری (هەموو بەسەرسامیەوە) ووتیان: ئەی مەریەم بەڕاستی کارێکی نالەبارو ئابڕو بەرت ئەنجامداوە، (٢٧) ئەی خوشکی هاروون (لەبەر تەقواو خواناسی ئەو ناز ناوەیان پێدابوو) نەباوکت کەسێکی خراپ و (شەڕوال پیس بووە) نەدایکیشت ئافرەتێکی داوێن پیس بووە (٢٨) ).**

## عیسا علیه السلام لەناو پێشکەداقسەدەکات

کاتێک مەریەم حاڵی تەنگ و شپرزە بوو و قسەی خزم و کەس و کاریشی توووند بوو لەسەری خوای گەورە فەرمووی ﴿ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ﴾، **واتە/ مەریەم ئاماژەی بەمنداڵە ساواکەی دا**، تاوەکو قسە لەگەڵ ئەو بکەن و لەو بپرسن، لەوکاتەدا ووتیان: ﴿ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا ﴾ **واتە/ (چۆن قسە لەگەڵ منداڵی ناو بێشکەدا دەکرێت)** خزم و کەس و کارەکەی مەریەم ووتیان: چۆن دەکرێت لەگەڵ منداڵێکی شیرە خۆرەو لەناوبێشکەدا قسەو گفت و گۆ بکەین؟

لەوکاتە خودای مەزن و دلۆڤان عیسای علیه السلام هێناقسە ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (٣٠) وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا (٣١) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا (٣٢) وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا (٣٣) ﴾ مەریم/ ٣٠ – ٣٢

**واتە/ ((ئینجا منداڵی ساوا هاتە گفت و گۆ ووتی: بەڕاستی من بەندەی خوام، کتێبی ئینجیلی پێ بەخشیوم و کردوومی بەپێغەمبەری خۆی (٣٠) منی موبارەک و پیرۆزیش کردووە لەهەر کوێدا بم و ئامۆژگاری کردووم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەم و لەزەکاتیشدا درێغی نەکەم هەتا لەژیاندا بم (٣١) (هەروەها فەرمانی پێداوم) چاک رەفتار بکەم لەگەڵ دایکم داو نەیکردووم بەکەسێکی زۆرداروبەد رەفتار (٣٢) سڵاوی پەروەردگارم لەسەرە ئەو رۆژەی کە لەدایک بووم و ئەو رۆژەش کە دەمرم، ئەو رۆژەش کەزیندوو دەکرێمەوە (٣٣))**

ئەمە یەکەم قسەی عیسای کوڕی مەریەم کەووتی: ﴿ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ ﴾ **واتە/ (بەڕاستی من بەندەی خوام)** کەچی نەیووت من کوڕی خوام، چونکە خودای گەورە تاک و تەنهایەو هیچ هاوبەش و شەریکێکی نیە.

ئا ئەمەیە ڕاستی و حەقیقەتی عیسا (علیه السلام)، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ذَٰلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ (٣٤) مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ (٣٥) ﴾ مریم/ ٣٤ – ٣٥

واتە/ ( ئا ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە، هەر ئەوەشە قسەی ڕاست و دروست دەربارەی، کە ئەوانە (واتە جولەکەکان) گومان بەدەوریدا دروست دەکەن (٣٤) بێگومان ناگونجێت بۆ خودای گەورە، کەس بکاتە کوڕی خۆی، پاکی و بێگەردی شایستەی ئەوە، کاتێک هەر شتێک بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی تەنها ئەوەندەی دەوێت کە فەرمان بدات و بڵێت، ببە، دەستبەجێ دەبێت (٣٥))

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾ ال عمران/٥٩

واتە/ (بەڕاستی نموونەی دروست بوونی عیسا لەلایەن خودای گەورە، وەک نموونەی ئادەم وایە کە لەخاک دروستی کردو لەوەودوا فەرمانی پێداوپێی ووت: ببە (بەئینسان) ئەویش بوو )

خودای بەخشندەی میهرەبان نیعمەتی دایە عیسا علیه السلام و دەفەرموێت ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّۦنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ المائده/١١٠ – ١١١

واتە/ (دەفەرموێت خودای گەورە دەفەرمووێت، ئەی عیسای کوڕی مەریەم یادی ئەو نازو نیعمەتەی من بکەرەوە کە ڕژاندم بەسەر خۆت و دایکتدا، کاتێک من بەهۆی فریشتە جوبریلی پیرزەوە پشیتوانیم لێکردیت، ئەو کاتەی لەبێشکەداو بەپیریش بەڕەوانی قسەت بۆ خەڵکی دەکرد.

هەروەها کاتێک فێری نووسین و دانایی و تەورات ئینجیلم کردیت، کاتێکیش لەقوڕ وەک شێوەی باڵندەت دروست دەکرد بەفەرمانی من، ئەوجا فووت پیادەکرد،

**جا دەبوو بەباڵندە بەفەرمانی من وە کوێری و زگماکی و بەڵەکت چاک دەکردەوە بەفەرمانی من، کاتێکیش مردووەکانت بەزیندوویی بەفەرمانی من لەگۆڕ دەردەهێنایەوە، هەروەها یادی ئەوە بکەرەوە کەشەڕی نەوی ئیسرائیلم لێ لادایت، کاتێک بەبەڵگە ئاشکراکانە هاتی بەلایان، جا ئەوانە شیان کەبێ باوەڕ بوون ووتیان: ئەمە جگە لەوەی جا دوویەکی ئاشکرایە هیچ شتێکی تر نیە (١١٠) هەروەها کاتێک نیگام نارد بۆ هاوەڵە دڵسۆزو تایبەتیەکانی عیسا (حەوارییەکان) کەئیمان و باوەڕ بهێنن بە من و بەپێغەمبەرەکەم، ئەوانیش ووتیان، ئیمان و باوەڕی تەواومان هەیە، خوایە تۆش بەشایەت بە کەبەڕاستی ئێمە موسڵمانین (١١١)))**

موژدەی پێدانی عیسا بە محمد (سەلامی خوا لەهەردووکیان بێت) لەوبارەیەوە خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾﴾ الصف/٦

**واتە/ (بیریان بخەرەوە، کاتێک عیسای کوڕی مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی ووت: منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە بەڕاستی تەوراتیش دەسەڵمێنم کەلەپێش منداهاتووە، هەروەها مژدە دەریشم بەپێغەمبەرێک کە دوای من دێت و ناوی – ئەحمەد – ە، کەچی کاتێک بەبەڵگەو نیشانەی تێرو تەواو موعجیزەی ئاشکراوە پێی راگەیاند، ووتیان: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە)**

عیسا علیه السلام دوایین پێغەمبەری ئیسرائیلیەکانە، جا موژدەی دا بەقەومەکەی خۆی کە دوای ئەو دوایین پێغەمبەری هەموو جیهان دێت، هەتاوەکو ناوەکەیشی پێووتن، وەباسی سیفەت و خەسڵەتەکەی بۆ کردن تاوەکو بیناسنەوە وە شوێنی کەون ئەگەر بینیان، بۆ لابردنی هەموو بیانویەک لەسەر ئەوان وەهەم چاکەو بەخشندەشە لەلایەن خودای گەورە بۆ ئەوان .

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ

ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ الاعراف/ ١٥٧

**واتە/ (ئەوانەی کەشوێنی ئەو (محمد علیه السلام) پێغەمبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارەکە دەکەون ئەوەی کە دەستیان دەکەوێت نوسراوە لای ئەوان لەتەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێدەدات بەچاکەو، قەدەغەی گوناه و خراپەیان لێدەکات و هەرچیەک پاک و چاکە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات و ئەرکە قورس و سەنگینەان لەسەر شانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لەسەریان بوو لادەبات، چا ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوەو پشتیوانیان لێکردووەو پشتگیریان کردووەو شوێنی ئەو نوورە کەوتوون (کەقورئانە) و هاوڕێ لەگەڵیدا ڕەوانەکراوە، هەر ئەوانە سەرفرازو ڕزگارن)**

سەحابەیەکی پێغەمبەر ﷺ بێت ووتی : ئەی پێغەمبەری خوای باسی خۆتمان بۆ بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (( **دعوة أبي إبراهيم وبشرى عيسى، ورأت أمي حين حملت بي كأنه خرج منها نور أضاءت له قصور بصرى من أرض الشام** )) **واتە: (بانگەوزەکەی باوکە ئیبراهیمم و موژدەکەی برام عیسام، وە بینینی دایکم کاتێک سکی پڕ بوو بە من وەک ئەوە بوو نوورێک لێی دەرچوو، کە وا کۆشکەکانی بوصرا لەخاکی شام بۆی ڕووناک بووەوە )** ئەحمەد ریوایەتی کردووە .

# درەختی پێغەمبەران

# بەرز کردنەوەی عیسا علیه السلام بۆ ئاسمان

خوای گەورە دەفەرموویت ﴿ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ٥٤ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ٥٥ ﴾ ال عمران /٥٤ -٥٥ .

**واتە/(بەڵام دوژمنانی خوا ) پیلانیان گێڕا، خوایش پیلانەکانی پووچ کردنەوە، چونکە خوا چاکترین و بەدەسەڵاتترین زاتێکە لەهەڵوەشاندنی نەخشەو پیلانی دوژمنانیدا (٥٤) کاتێک خوا فەرمووی: ئەی عیسا من تۆ دەمرێنم پاشان تۆ پایەدارو بەرزو بڵند دەکەمەوە لای خۆم، لەدەستی ناپاکی ئەوانەی کەبێ باوەڕن ڕزگارت دەکەم وپاک راتدەگرم و بەرزی بڵندی دەبەخشم بەوانەی کە شوێنکەوتەی تۆن بەسەر کافراندا هەتا ڕۆژی قیامەت، لەوەودواش گەڕانەوەتان هەر بۆلای منە، ئەو سادادوەریی و فەرمانڕەوایی دادپەروارانەدەکەم لەنێوانتاندا لەو شتانەدا کە کێشەتان هەبووە و ڕاتان دەربارەی جیاوازبووە)**



وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموویت :﴿ وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا ١٥٧ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا

حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ ﴾ النساء/ ١٥٧ – ١٥٩

**واتە/(بەهۆی ئەو قسەشیان کە دەیانوت بەڕاستی ئێمە مەسیح پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەممان کووشتوە، کەچی لەڕاستیدا نە کووشتوویانەو نەلەقەنارەو خاچیان داوە، بەڵکو لێیان تێکچوو، و (کەسێکی تریان کوشتووە لەجیاتی ئەو)، بەڕاستی ئەوانەی کە بیرو بۆچوونی جیاوازیان لەو کێشەیەدا هەیە، خۆشیان لەگوماندان تیایداو ئەوانە هیچ زانستیەکی راستیان نیە لەو بارەیەوە، جگە لەشوێنکەوتنی گومان نەبێت و بەدڵنیاییەوە کە نەیانکوشتووەو بۆیان نەکوژراوە (١٥٧) نەخێر، بەڵکو خوابەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، خوا هەمیشەو بەردەوام بالا دەست و دانایە (١٥٨) هیچ کەسێک نیە لەخاوەنانی کتێب، کەباوەڕ نەهێنێت بەعیسا پێش ئەوەی گیانی دەربچێت، بەڵکو سوێند بەخوا هەر باوەڕ دەهێنێت پێی لەپێش مردنیداو لەڕۆژی قیامەتیشدا شایەتەبەسەریانەوە (١٥٩) ).**

جا خودای گەورە هەواڵی دا کە زاتی ئەو عیسای بەرزکردەوە بۆ ئاسمان پاش ئەوەی لەخەودا مراندی و دەربازی کرد لەوانەی دەیانویست ئازاری بدەن لەو جوولەکانەی کە درۆو بوختانیان پێ هەڵبەست لەلایەن یەکێک لەپادشا کافرەکانی ئەو سەردەمە.

بۆیە پادشاکە فەرمانیدا بیکوژن و لەخاچی بدەن جا لەو کاتەدا گەمارۆی ماڵەکەیاندا لە بیت المقدس، کاتێک لێی چوونە ژوورەوە خودای گەورە گەنجێکی لەهاوەڵەکانی خۆیان شوبهاند بەعیسا کەلەوێدا لەگەڵیاندا ئامادە ببوو، ئەو جا عیسای لەکەلێنێکی دیوارەکە لەو ماڵەدا بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، وەئەهلی بیت المقدس بینیان.

کە چوونە ژوورەوە ئەو گەنجەیان بینی، کە خودای گەورە بەعیسای شوبهاندبوو، جا بردیان واگومانیان برد کەعیسایە، لەخاچیان داو بزماریان لەسەری چەقاند وەک گاڵتە پێکردنێک پێی، ئەو کاتە هەموو (نصاریەکان) کەوا نەیان بینی بوو کە ئەمە عیسا نیە کەلە خاچ دراوە تەسلیمی جوولەکەبوون، بەو هۆیەوە کەوتنە ناو گومڕاییەکی ئاشکرا و خراپەکاریەکی زۆر، جا خوای گەورە بەفەرموودەکەی خۆی هەواڵی داو فەرمووی

﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾

**واتە/(هیچ کەسێک نیە لەخاوەنانی کتێب کەباوەڕ نەهێنێت بەعیسا پێش ئەوەی گیانی دەربچێت).**

واته لەکۆتایی زەماندا پێش هەڵسانی قیامەت عیسا دادەبەزێت بۆ سەر زەوی، بێگومان دادەبەزێت و بەراز دەکوژێت و خاچ تێکدەشکێنێت و جەزیەو سەرانە لادەبات و هیچ ئاینێک قەبووڵ ناکات جگە لەئیسلام.

## ناوذانی عیسا علیه السلام بەمەسیح :

مەسیح لەسەر کێشی (فعیل) هاتووە وەمەبەست لێی هەندێ جار (فاعل)ە واتە : الماسح (دەست پێداهێنەر)، وەهەندێ جاریش بە (مفعول) دێت واتە: ممسوح (سرِینەوە).

**عیسا : بەمەسیح واتە (سرِین) ناونراوە چونکە.**

- ئەو دەستی بەسەر هیچ دەردەدراو نەخۆشێک دانەدەهێنا ئیلا چاک دەبۆوە، ئەمەش شیاوە بەهۆی ئەو ناولێنانەوە.
- وەدەڵێن : بەمانای سرِینەوە (ممسوح) دێت، چونکە ئەو لەکاتی دەرچوونی لەسکی دایکی بەرۆن داپۆشرابوو.
- وەدەڵێن : چونکە ئەو بەزەویدا دەگەرِێت واتە عیسا لەیەک شوێن جێگیر نابێت و گەرۆکەو بەسیاحەت گەران هەموو زەوی دەگەرِێت.
- وە دەڵێن : چونکە چاڵایی پێیەکانی نەبوو، بنی پێیەکانی راست بوون.
- وە دەڵێن : (المسیح) بەمانای: راستگۆ دێت. تاج العروس للزبیدي (١٧٥٠/١)

## نەیانکوشتووە

عیسا علیه السلام نەمردووە، بەڵکو خودای گەورە بۆلای خۆی بەرزی کردۆتەوە، لێرەدا چەند ئایەت هەن ماناکەی لەسەر هەندێ کەس بەگومان لێک دەدرێتەوە، لەوانە فەرموودەکانی خوای گەورە.

١. خودای گەورە دەفەرموویت ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴾ ال عمران/ ٥٥

**واتە/ (کاتێک خودا دەفەرمویت: ئەی عیسا من تۆ دەمرێنم پاشان تۆپایەدارو بەرز و بڵند دەکەمەوە لای خۆم ، لەدەستی ناپاکی ئەوانەی کەبێ باوەرِن رزگارت دەکەم و پاک راتدەگرم وبەرزی و بڵندی دەبەخشم بەوانەی کە شوێنکەوتەی تۆن بەسەر کافراندا)**

فەرمووی خودای عزوجل ﴿ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ ﴾ التوفی لێرەدا بەمانا نووستن دێت، نەک بەمانای مردنی ئاسایی.

هەروەک خودای بەرزو بەتوانا دەفەرموویت ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ﴾ الزمر/٤٢

واتە: **(هەر خوایەکە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش کەنەمرد لەخەوەکەیدا هەرخوا بۆی دەنێرێتەوە)**

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ ﴾ الانعام/٦٠

واتە: **(هەر ئەو زاتەیە بەشەو خەوتان لێ دەخات و دەتانمرێنێت)**

وە لەفەرموودەی سەرەوەدا ﴿ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ ﴾ بەمانای: من بۆ لای خۆم دەتبەمەوەو گیانت دەکێشم.

٢. خودای عزوجل دەفەرموێت ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ ﴾ النساء/١٥٩.

**واتە/ ( هیچ کەسێک نیە لە خاوەنانی کتێب کەباوەڕ نەهێنێت بەعیسا پێش ئەوەی گیانی دەربچێت، بەڵکو سوێند بەخوا هەر باوەڕ دەهێنێت پێی لەپێش مردنیداو لەرۆژی قیامەتیشدا شایەدە بەسەریانەوە)**

فەرموودەکەی عزوجل : ﴿ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ **واتە پاش دابەزینی عیسا علیه السلام** لەکۆتایی زەماندا هیچ کەسێک لەخاوەنی کتێب نامێنێت ئیلا باوەڕ دەهێنێت بەعیسا پێش ئەوەی عیسا بمرێت لەدوای دابەزینی، چونکە عیسا علیه السلام هیچ ئاینێک قەبووڵ ناکات جگە لەئایینی ئیسلام نەبێت، وە هیچ کافرێک لەو کاتەدا خۆی نابینێتەوە ئیلا دەمرێت.

وە دەڵێن ﴿ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ **واتە پێش مردنی پیاوێک لەخاوەنانی کتێب،** وە هەر هەموویان لەکاتی گەیشتنی مردن لەخاوەنانی کتێب، لەکاتی مردنیدا بۆی ئاشکرا دەبێت کەعیسا بەندەیە، پێغەمبەرە، ئادەمیزادە، بەڵکو خوانیە، بۆیە خاوەنانی کتێب باوەڕ دەهێنێت بەعیسا پێش ئەوەی بمرێت، لەگەڵ ئەوەش ئەو باوەڕهێنانە سوودی نابێت، چونکە تەوبەکردن وەرناگیرێت پاش غەرغەرەکردنی ڕۆح.

| پرسیار | جیاوازی چیە لەنێوان ژیانی عیساو ژیانی پێغەمبەران؟ ئایا پێغەمبەرانیش زیندوونین هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ((الانبياء أحياء في قبورهم)) واتە: [[پێغەمبەران زیندوون لەناو گۆڕەکانیاندا]] |
|---|---|
| وەڵام | ژیانی عیسا علیه السلام ئێستا بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان ژیانێکی راستەقینە بەجەستەوەو بەگیان و بەرۆح بەڵام ژیانی پێغەمبەران کەوا ژیانێکی بەرزەخیە لەجۆرێکی تایبەتدا، بەڵام عیسا هێشتا نەمردوو، تاوەکو بچێتە بەرزەخ و ناوگۆڕ، ئەو ئێستا لەلای خودایە لەئاسمان بەگیان و بەجەستە.<br>بەڵام پێغەمبەرانی دیکە علیه السلام، سەکەراتی مردنیان بەچاوی خۆیانەوە بینیووەو رۆحیان لەجەستەیان جیاکراوەتەوە، ئەوانە ژیانێکی تایبەتیان بۆ فەراهەم کراوە لەناو گۆڕەکانیاندا. |

## بەڵگەکان لەسەر دابەزینی عیسا علیه السلام

پێشتر باسکرا کەوا عیسا علیه السلام خوای گەورە بۆ لای خۆی بەرزی کردەوە کاتێک جوولەکەکان هاتن بۆلای بۆ ئەوەی بیکوژن، وە بەڵگەکان ئاماژە بەوەدەدەن لە کۆتایی زەماندا بێگومان دادەبەزێت، وە دابەزینیشی لەنیشانەکانی رۆژی دواییە وەزۆر بەڵگەش هەن لەسەر دابەزینی لەکۆتایی زەماندا لەوانە:

### بەڵگە لەقورئاندا:

• خودای گەورەو میهرەبان دەفەرموویێت ﴿ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾ الزخرف/ ٥٧ – ٦١

واتە/ (کاتێکیش باسی کوڕەکەی مەریەم - عیسا - بەنموونە هێنرابێتەوە، دەستبەجێ قەوم و هۆزەکەی تۆ بەرهەڵستکار بوون و سەریان باداوەو تەسلیمی حەق نەبوون (٥٧) وتوویانە ئایا پەرستراوەکانی ئێمە شایەنی پەرستنن یان ئەو؟! واتە - عیسا - ئەو نموونانەیان بۆ تۆ نەدەهێنایەوە، تەنها بۆ موجادەلە نەبێت، بەڵکو ئەوانە کەسانێکن هەمیشە حەز بە دوژمنایەتی و ئاژاوەو ململانێی بێ سەروبن دەکەن (٥٨) ئەو عیسایە تەنها بەندەیەکی ئێمە بوو کەنازو نیعمەتی پێغەمبەرایەتیمان پیبەخشی و کردمانە نموونەیەکی چاک بۆ نەوەی ئیسرائیل تا شوێنی بکەون (٥٩) ئەگەر بمانویستایە ئێوەمان دەکردە فریشتەو لەزەویدا نیشتەجێمان دەکردن و هەموو فەرمانبەردار دەبوون (٦٠) بەڕاستی لەدایک بوونی عیسابەبێ باوک، بەڵگەیە لەسەر قیامەت، کەواتە بەگومان مەبن لێی و باوەڕی پێبهێنن و پێیان بڵێ: هەر پەیڕەوی لەزاتی من بکەن، هەر ئەوەشە ڕێگەی ڕاست و دروست(٦١)

فەرموودەکەی خودای گەورە ﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ ﴾ واتە: عیسا علیه السلام نیشانەیەکە لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، وە لەخوێندنەوەی (**وانه لَعَلَم للساعة**) بەفەتحەی (عین و لام)، بەمانای نیشانە، وە نیشانەیەکە بۆ ڕۆژی دوایی، بۆ نزیک بوونەوەی وەهاتنی قیامەت، ﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا ﴾ - واتە لێی بەگومان مەبن - ﴿ وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾ واتە : پەیڕەوی لەزاتی من بکەن، هەر ئەوەشە ڕێگەی ڕاست و دروست.

**ئیبن و عەباس** ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت ( **ئەمە نیشانەیە بۆ ڕۆژی دوایی واتە دەرچوونی عیسایە علیه السلام پێش هەڵسانی قیامەت**) ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە

هەروەها **تەبری** دەڵێت: (**ماناکەی دەرکەوتنی عیسا نیشانەیەکە دەزانرێت بەهاتنی ڕۆژی دوایی چونکە دەرکەوتنی لەنیشانەکانی هەڵسانی قیامەتە، وە دابەزینیشی بۆ سەر زەوی بەڵگەیە لەسەر نەمان و لەناوچوونی دونیاو پێشوازی کردن لەڕۆژی دوایی**) تفسير الطبري (٦٣١/٢١)

- هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِنْهُ مَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا (١٥٧) بَلْ رَفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٥٨) وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا (١٥٩) ﴾ النساء ١٥٧ – ١٥٩

**واتە/ (بەهۆی ئەو قسەیەشیان کەدەیانوت بەڕاستی ئێمە مەسیح پێغەمبەری خوا عیسای کوڕی مەریەممان کوشتووە، کەچی لەڕاستیدا نەکوشتوویانە و نەلەقەنارەو خاچیان داوە، بەڵکو تێکچووە، بەڕاستی ئەوانەی کەبیرو بۆچوونی جیاوازیان لەو کێشەیەدا هەیە، خۆشیان لەگوماندان تیایداو ئەوانە هیچ، زانستیەکی ڕاستیان نیە لەو بارەیەوە، جگە لەشوێنکەوتنی گومان نەبێت و بەدڵنیاییەوە کەنەیانکوشتووەو بۆ یان نەکوژراوە (١٥٧) نەخێر، بەڵکو خودا بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، خوا هەمیشە و بەردەوام باڵا دەست و دانایە (١٥٨) هیچ کەسێک نیە لەخاوەنانی کتێب، کەباوەڕ نەهێنێت بەعیساپێش ئەوەی گیانی دەربچێت، بەڵکو سوێند بەخوا هەر باوەڕ دەهێنێت پێی لەپێش مردنیدا، و لەڕۆژی قیامەتیشدا شایەدی بەسەریانەوە (١٥٩)**

وەلەفەرموودەکەی عزوجل ﴿ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ ﴾ وە فەرموودەی ﴿ قَبْلَ مَوْتِهِ ﴾ زۆربەی تەفسیرو لێکدەرەوەکان دەڵێن : هەردوو ڕاناوی (بِهِ) وە (مَوْتِهِ) مەبەست لێیان عیسای کوڕی مەریەمە علیه السلام.

ئەبو مالک لەبارەی فەرموودەکەی عزوجیل ﴿ وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ ﴾ دەڵێت ئەمەش لەکاتی دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم علیه السلام هیچ کەسێک نامێنێتەوە لەخاوەنانی کتێب ئیلا باوەڕی پێ دەهێنێت.

**ئیبن کثیر دەڵێت (خودای گەورە هەواڵی داوە کەوا کارو بارەکە وانیە، بەڵکو یەکێکی لەوانی بەعیسا چواند، لێکچووەکەیان کووشت کەچی ئەوان ئاگاداری ئەم کارە نەبوون، وەخوای گەورە هەواڵی داوەکە ئەو عیسای بەرزکردۆتەوە بۆ لای خۆی، کەوا ئەو ماوەو زیندووە، ئەو بێگومان پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت دادەبەزێت، کەوا حەدیسە متواترەکان بەڵگەیان لەسەری ماوە ئەگەر خوا حەز بکات بەم نزیکانە باسی لێوە دەکەین، کەوا**

ئەو مەسیحی گومڕا دەکوژێت و، خاچەکان تێکدەشکێنێت و بەرازەکان دەکوژێت، و جەزیەو سەرانە لادەبات، بەمانای، هیچ لەخاوەن ئاینەکان قەبووڵ ناکات، بەڵکو تەنها ئیسلام قەبووڵ دەکات یاخود شمشێرو، ئەم ئایەتە پیرۆزەش هەواڵی داوە کەوا هەموو خاوەنانی کتێب لەو کاتەدا باوەڕی پێ دەهێنێت وە هیچ کەسێک لەوان ناکۆکی و جیاوازی و ململانێ ناکات لەڕاست و دروستی عیسا علیه السلام) تفسیر ابن کثیر (٢/٤٥٤)

## بەڵگە لەسوننەت و حەدیسەکاندا:

- لەحەذیفەی کوڕی ئەسید ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ بەسەری کردینەوە لەکاتێکدا ئێمە زیکرو یادمان دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (( ما تذاكرون ؟ « قالنا : نذكر الساعة ، قال : « إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات - فذكر - الدخان ، والدجال ، والدابة ، وطلوع الشمس من مغربها ، ونزول عيسى ابن مريم صلى الله عليه وسلم ، ويأجوج ومأجوج ، وثلاثة خسوف : خسف بالمشرق ، وخسف بالمغرب ، وخسف بجزيرة العرب ، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن ، تطرد الناس إلى محشرهم )) **واتە: (ئەوە باسی چی دەکەن؟)) ووتمان : باسی قیامەت دەکەین، فەرمووی درووودی خوای لەسەر بێت ( قیامەت هەڵناستێت تا لەپێشیدا (دە) نیشانە دەبینن، دوو کەڵەکە، و دەجال، و دابە ( زیندەوەرێکە لەناوسکی زەوی دێتەوە دەرەوە)، و هەلاتنی ڕۆژ لەرۆژ ئاوا، و دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم علیه السلام، وە یەئجووج و مەئجووج، و سێ ڕووچوونی زەوی، ڕووچوونێک لەرۆژهەلات، وە ڕووچونێک لەرۆژ ئاوا، و ڕوو چوونێک لە دوورگەی عەرەب، و لەکۆتایی ئەوانە ئاگرێک لەیەمەنەوە دەردەچێت خەڵکی ڕاودەماڵێت بەرەو مەحەشەر** موسلیم ڕیوایەتی کردووە.
- لەئەبو هوریرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (والذي نفسي بيده ، ليوشكن أن ينزل فيكم ابن مريم حكما عدلا ، فيكسر الصليب ، ويقتل الخنزير ، ويضع الجزية ، ويفيض المال حتى لا يقبله أحد ، حتى تكون السجدة الواحدة خيرا من الدنيا وما فيها) **واتە: (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، واخەریکە عیسای کوڕی مەریەم علیه السلام دادەبەزێت و دەبێت بە فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر، خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێت و سەرانە هەڵدەگرێت سەروەت و سامان زۆر دەبێت تاوای لێدێت کەس پارە وەرناگرێت، هەتا بردنی سوجەدەیەک خێری زیاترە لەدونیاو ئەوەی تیایەتی )** متفق علیه

وەلەڕیوایەتێکی دیکەدا (والله ، لینزلن ابن مریم حكما عادلا ، فليكسرن الصليب ، وليقتلن الخنزير ، وليضعن الجزية ، ولتتركن القلاص فلا يسعى عليها ، ولتذهبن الشحناء والتباغض والتحاسد ، وليدعون إلى المال فلا يقبله أحد) **واتە: (سوێند بەخوا کوڕی مەریەم دادەبەزێت دەبێت بەفەرمانڕەوایەکی دادپەروەر، خاچ دەشکێنێت و بەراز دەکوژێت و سەرانە هەڵدەگرێت و کەنیزەک نامێنێت و ڕق و قین و حەسادەت نامێنێت، بەدوای کەسێک دەگەڕێن ماڵ و خێریان لێ وەربگرێت، وەک زەکات -- کەس وەری ناگریت))** موسلیم ڕیوایەتی کردووە



## ئاشکراکردن و لێکدانەوەی مانای حەدیسەکە :

**(یکسر الصلیب) خاچ :** ناسراوە، ئەمەیەکەوا دیانەکان وا دەزانن کە عیسا علیە السلام لەسەری لەخاچ دراوە، ئەمەش نیشانەی دیانەکانە بێگومان عیسا علیە السلام بەسەریدا زاڵدەبێت.

**(ویقتل الخنزیر)** بەراز گیانلەبەرێکی ناسراوە، کەوا خواردنی حەرامە لەئیسلامدا، جا عیسا علیە السلام فەرماندەکات بەکوشتنی وەزاڵدەبێت بەسەر بەرازەکاندا ئەمەش هێمایەکە لەحەرام کردنی خواردنەکەی.

بەراز گیانلەبەرێکی تەپیوو تەمەڵە، ڕووەک و گیانلبەرو لاشەی بۆگەن و شتی پیس دەخوات، هەروەها پاشەڕۆی خۆی و پاشەڕۆی گیانلەبەرەکانی دیکەش دەخوات، جا کوشتنی بەراز لەلایەن عیسا علیە السلام مانای ئەوە نیە کە خودای گەورە بەبێ حیکمەت ئەم گیانلەبەرەی خەڵق کردووە، وەمانای ئەوەش نیە هەر گیانلەبەرێک کەخودای گەورە حەلقی کردووە دەبێت بخورێت، ئەوەتا خودای گەورە، سەگ و گورگ و مێش و مێشوولەی دروست کردووە، نەوەک بۆ خواردنی، بەلکو بۆحیکمەتێکی تر لەژیاندا.

لەگەڵ ئەوەش خوای گەورە بەرازی دروست کردووە بۆ حیکمەتێک بەڵام بەراز لەهەموو ئاینەکان گۆشت خواردنی حەرام کراوە.

خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ

وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ البقرة / ١٧٣

(خوای پەروەردگار تەنها مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەرازو ئەو ماڵاتانەی کەناوی غەیری خوایان لەکاتی سەربڕیندا لەسەر هێنراوە، حەرامی کردووە لێتان، جا ئەگەر کەسێک پێویستی ناچاری کرد بەخواردنیان بێ زیادەڕەوی و لەسنوور دەرچوون، وە هیچ گوناهێکی لەسەر نیە، بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبوو بەزەیی و دلۆڤانە)

هەروەها دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ النحل / ١١٥

واتە: (خوای پەروەردگارم تەنها مردارەوەبوو ، خوێن ، و گۆشتی بەرازو، ئەو ماڵاتانەی کەناوی غەیری خوایان لەکاتی سەربڕیندا لەسەر هێنراوە، حەرامی کردووە لێتان، جاهەر کەسێک ئەگەر پێویستی ناچاری کرد بەخواردنیان بێ


بـــــــەراز

**زیادەڕەوی و لەسنور دەرچوون ئەوە بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبوو بەزەیی و دلۆڤانە)**
**(يضع الجزية)** جزیە بەمانای سەرانە: بڕیتیە لەوپارەوپوولانە کەوەردەگیرێت لەخاوەنانی کتێب کەوانیشتەجێن لەووڵاتی موسلمانان، ئەمەش بۆ پاراستنیان، وە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆیان، ئەمەش مەبەست دادپەروەریە، هەروەک چۆن زەکات لەبازرگانە موسلمانەکان وەردەگیرێت، پاش دابەزینی عیسا علیه السلام مانای ئەوە نیە کەوا عیسا علیه السلام رقیان لێ هەڵدەستێت لەسەر ئیسلام، بەڵکو هەموو گوێڕایەلی دەبن، ئەمەش چونکە ئەو دیانانەی کەوایان دادەنا بەوەی ئەوان شوێنکەتەی عیسان علیه السلام کاتێک عیسا دیانبینێت قسەیان لەگەڵدا دەکات و ئەوە بیروباوەڕە لەناو دڵیان لادەبات کەوا باوەڕیان وابوو عیسا کوڕی خوایە، وەباوەڕ دەهێنن بەئاینێکی ڕاست و دروست، کەوا خوای گەورە دەفەرمویێت ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾

**واتە: (پاش دابەزینی عیسا هەموو خاوەنانی کتێب باوەڕ دەهێنن پێش مردنی عیسا (علیه السلام) پاش ئەوەی گیانی دەکێشرێت پاش دابەزینی وە هەر کەسێک باوەڕ بەعیسا نەهێنێت شەری لەگەڵدا بەرپا دەکات)**

وەلەڕیوایەتێکدا (وتكون الدعوة واحدة)



**واتە: ((لەسەر دەمی عیسا علیه السلام بانگەواز یەک بانگەوازە))** ئەحمەد ریوایەتی کردووە، بەمانای ئیسلام هیچ ئاینێک و ڕێبازێکی دیکە ناهێڵێت، نەهیندۆسی وە نەئایینی بووزیەکان وە نەجوولەکەو دیانەکان وە نەسیخی و نە ئایینی مەجووسیەکان.

(تكون السجدة الواحدة خير من الدنيا وما فيها) **واتە:** خەڵکی ئارەزووەکانیان بەرز ڕادەگرن نوێژکردن و هەموو گوێڕاڵی و ملکەچ کردنێک ئەمەش بۆ بنیاتنانی هیواو مەبەستەکان و خۆپاک کردنەوەو خواپەرستی کردن لەدونیادا وە دڵنیابوونیان بەنزیک بوونەوەی قیامەت، چونکە لەوکاتەدا رزق و رۆزی فراوانە، وە هیچ موسڵمانێک لەناو عیبادەت خواپەرستیدا بیر لە دابینکردنی بژێوی ژیان ناکاتەوە.

(ولتتركن القلاص فلا يسعى عليها) **واتە:** القلاص : بریتیە لەووشترێکی مێینەی گەنج،

کەوا زۆر شیاوو پەسندەو بەنرخترین سامانەکانی عەرەبە، لەوکاتەدا خەڵک دەستبەرداری دەبێت و بەجێی دەهێڵێت و پشتگوێی دەخەن و خۆماندوو ناکەن بۆ پەروەردەکردنی نەبۆ خواردنی و نەبۆ بازرگانی پێکردنی .

لەجابرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ينزل عيسى بن مريم فيقول أميرهم المهدي، تعال صَلّ بنا، فيقول، لا، إن بعضهم أمير بعض، تكرمة الله هذه الأمة) واتە: **(بێگومان عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت جا پێشەواکەیان مەهدی دەڵێت، فەرموو وەرە پێش نوێژمان بۆ بکە، جا عیسا (علیه السلام) دەڵێت، نەخێر لەنێو ئێوە دا هەندێک پێشەوای هەندێکتانن، ئەمەش رێزێکە لەلایەن خودای گەورەوە بۆ ئەو ئوممەتە)**

حارس بن ابی ئوسامە ڕیوایەتی کردووە.

لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (منا الذي يصلي عيسى بن مريم خلفَه) واتە: **(ئالێرەدا کەوا عیسای کوڕی مەریەم نوێژی لەدواوەی دەکات مەبەست مەهدیە)** ئەبو نعیم ڕیوایەتی کردووە.

## بەڵگە لەسەر دابەزینی عیسا علیه السلام متەواتیرە (بەدوای یەک دادێن و زۆرن)

بێگومان ئەو هەواڵانەی لەلایەن پێغمبەرمان محمد دروودی خوای لەسەر بێت دەربارەی دابەزینی عیسا علیه السلام زۆرو زەبەندەن، وە ئەو زانایانەی باس لەهاتنە خوارەوەی عیسا علیه السلام دەکەن زۆرن و گەیشتۆتە پلەی متواتر ئەمانەش:

ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەل (طبقات الحنابله) / ٢٤١ – ٢٤٣

ئەبو حەسەنی ئەشعەری (مقالات الاسلاميه واختلاف المصلين) ٣٤٥/١

ئیمام گبری (تفسير الطبرى) ٢٩١/٣

وەئیمام ئیبن کثیر (تفسیر ابن كثير) ٢٢٣/٧

وە السفارینی (لوامع الانوار البهيه) ٩٤/١-٩٥

وە الشوکانی (التوضيح فى ماجاء فى المنتظر المهدى والدجال والمسيح)

**ئیبن کثیر** لەبارەی حەدیسەکانی هاتنە خوارەوەی عیسا علیه السلام دەڵێت **دەڵێت ((ئەو حەدیسانە متواترن لەلایەن پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت کەبەڵگەن لەسەر سیفەت و دابەزینی وە شوێنی دابەزینی، ئەو بێگومان لە شام، بەڵکو لەدیمەشق لەلای منارە سپیەکە دادەبەزێت، وەلەکاتی قامەت کردن بۆ نوێژی بەیانی دادەبەزێت،بەراز دەکوژێت و، خاچەکان دەشکێنێت و، سەرانە لادەبات و، هیچ قەبوول ناکات جگە لەئیسلام کەوا پێشتر لەهەردوو**

سەحیحەکە باسکرا، ئەمەش هەواڵێکە لەلایەن پێغەمبەر درووودی خوای لەسەر بێت بەجۆرێک بیانووەکانیان لادەبات و گومان لەناودڵ و دەروونەکانیان دەردەهێنێت، بۆیە هەموویان دەچنە ناوئایینی ئیسلام و شوێن عیسا علیه السلام دەکەون لەسەر دەستی ئەو)

لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾ ﴾ النساء /١٥٩

**واتە/ (هیچ کەسێک نیە لەخاوەنانی کتێب کەباوەڕنەهێنێت بەعیسا پێش ئەوەی گیانی دەبچێت، بەڵکو سوێند بەخوا هەر باوەڕ دەهێنێت پێی لەپێش مرنیدا، وە لەڕۆژی قیامەتیشدا دەبێتە شایەد بەسەریانەوە)**

وەهەروەها دەفەرمووێت ﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ ﴾ وە دەشخوێندرێتەوە بە **لَعَلَماً** واتە نیشانەیە وەبەڵگەیە لەسەر نزیک بوونەوەی رۆژی دوایی، چونکە ئەو لەپاش دەرکەوتنی مەسیحی دەجال دادەبەزێت، جا خوای گەورە لەسەر دەستی عیسا (علیه السلام) دەیکوژێت، وە یەئجووج و مەئجووجیش لەرۆژەکانی ئەودا دەردەکەوێت خودای گەورەو میهرەبان بەبەرەکەتی دوعای عیسا علیه السلام لەناویان دەبات. البداية والنهاية (١٧٩/٩)

هەموو زاناکان کۆک و یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کەوا دابەزینی عیسا علیه السلام نیشانەیەکە لە نیشانەکانی رۆژی دوایی، لەم بارەیەوە هیچ ناکۆکیان نیە تەنها ئەوانەی لەڕیزی ئیسلام دەرچوون و گرنگی و بایەخ بەم مەسەلەیە نادەن.



**?!**

**کێشە**

**ئایا ئەگەر عیسا علیه السلام دابەزێت حوکم بەشەریعەتی محمد ﷺ دەکات؟**

**یاخود بەشەریعەتێکی تازەوە دێت؟**

## وەڵام

**ئیمام السفارینی** لەبارەی دابەزینی عیسا علیه السلام لەکۆتایی زەماندا دەڵێت:

**((زانایان هەموویان یەکدەنگن لەسەر دابەزینی وە هیچ کەسێک لەئەهلی شەریعەت ناکۆک نین تێیدا بەڵکو مولحیدو لادەرەکان ئەمە رەتدەکەنەوە، ئەوانە بایەخ بەم ناکۆکیە نادەن و، هەموو زاناکان گەیشتوونەتەیەک ڕا کەوا عیسا دادەبەزێت و حوکم بەشەریعەتی محمد ﷺ دەکات، وەلەکاتی دابەزیینیدا بەشەریعەتێکی سەربەخۆ لەئاسماندا دانابەزێت))**

### وه صدیق حسن خان دەڵێت:

((حەدیسەكان لەبارەی دابەزینی عیسا علیه السلام زۆرن، ئیمام شەوكانی باسی بیست و نۆ حەدیسی كردووه لەنێوان (صحیح و حسن و ضعیف و منجبر)، لەوانه كەواباسكرا له حەدیسەكانی دەجال..وەلەوانەش باسكراوه لەحەدیسەكان مەهدی چاوەڕوانكراو، هەروەها هەندێك لەو حەدیسانەی كەسەحابەكان گێراپانەتەوه ئەمەش دەچێته سەر حەدیسەكان، بۆیه هیچ مەجالێكی بۆ ئیجتیهاد نەهێشتۆتەوه، پاشان باسەكەی گێرایەوەو وتی: هەموو ئەوانەی گێرمانەوه گەیشتۆته پلەی (تواتر) هیچ شتێكی پەنهانی تێدا نەشاردراوەتەوه)) كتاب الاذاعة (ص١٦٠)

### وه شێخ ئەحمەد شاكر دەڵێت :

((دابەزینی عیسا علیه السلام لەكۆتایی زەماندا هیچ ناكۆكیەكی لەنێوان موسڵمانان دروست نەكردووه، بۆ هێنانی هەواڵه ڕاستەكان لەلایەن پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت لەو بارەیەوه.. وەئەمەش زانراوه لە ئایین دا لەپێداویستیەكانەوه ئیمانی نیه هەركەسێك بەر هەڵستكاری بكات)) تفسير الطبري (٦/٤٦٠)

### وه شێخ محمد ناصر الدين الالبانی دەڵێت :

((بزانه كەوا حەدیسەكانی دەجال و دابەزینی عیسا علیه السلام زۆرو زەبەندەن، پێویسته باوەڕی پێ بهێنێت، وه هەڵمەخەڵەتێ بەو كەسانەی بانگەواز دەكەن كه ئەو حەدیسانه ئاحادن، چونكه ئەوانه نەزانن بەو زانسته، وه ئەوانه لەوان كەسان نین كه بەدوای ئەو ڕێگایەدا كەوتوون وه ئەگەر ئەمەیان كردو بینیان كه حەدیسەكان متواترەن كەوا پێشەواو ئیمامەكان شایەدی لەسەر ئەو نیشانەیه دەدەن، وەك الحافظ بن حجر وەزۆری دیكەش، بەداخەوه بۆ قسەو قسەلۆكی هەندێ كەس كەجورئەت دەكەن، باس لەو مەسەلەیه بكەن كەوا تایبەتمەندو پسپۆر نین لەو بارەیەوه، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر كارەكە ئایین و عەقیده و بیروباوەڕبێت)) شرح العقيدة الطحاوية (ص ٥٦٥)

### ٤ ئایا عیسا علیه السلام دادەنرێت لەئوممەتی محمد  ؟

**سەرەنجام**

عیسا علیه السلام پێغەمبەرێكه له (اولوالعزم)، له ناو پێغەمبەراندا. وه لەلای خودای میهرەبان شوێن پایەیەكی بەرزی هەیه، هەروەها پشكی شێری وەرگرتووه بەوەی بووەته هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، كەوا لەشەوی میعراجدا گەیشته پێغەمبەرمان دروودی خوای لەسەر بێت، وه ئیمانی پێ هێنا، وه لەسەر ئەو بیروباوەڕەش دەمرێت.

لەحەدیسی میعراجدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت: (ثم صَعد بي حتى أتى السماء الثانية، فاستفتح) **واتە: ((پاشان جوبریل منی بەرزکردەوە تاوەکو ئاسمانی دووەم هات، ئاسمانەکە کرایەوە واتە جوبریل علیه السلام داوای لەپاسەوانەکان کرد کەوا ئاسمانەکە بکەنەوە.**

- قيل : من هذا؟
- قال: جبريل .
- قال: ومن معك؟
- قال: محمد
- قيل : وقد أرسل إليه؟
- قال : نعم
- قيل : مرحبا به، ولنعم المجيء جاء
- ففتح، فلما خلصتُ، فإذا يحيى، وعيسى وهما ابنا خالَة.
- قال: هذا يحيى وعيسى، فسلّم عليهما، فسلّمت فردّا.
- ثم قالا: مرحباً بالأخ الصالح، والنبي الصالح.

**واتە:**

- **فریشتەکان ووتیان ئەوە کێیە؟**
- **ووتی : جوبریلە**
- **فریشتەکە ووتی : ئەی ئەمە کێیە لەگەڵتدا؟**
- **جوبریل ووتی : (محمد)ە**
- **ووتیان: ئایا داوایان کردووە؟**
- **جوبریل ووتی : بەڵێ**
- **ووتیان : بەخێربێن، بەڕاستی باشترین کەسە کەوا هاتووە.**
- **جا ئاسمانەکە کرایەوە، کاتێک دەربازبووم، (یەحیا و عیسا)م بینی هەردووکیان کوڕە پوورن.**
- **جوبریل ووتی: ئەوە یەحیاو عیسایە، سەلامیان لێبکە، جا سەلامم لێیان کردو ئەوانیش وەلامیان دایەوە.**
- **پاشان ووتیان: بەخێرهاتن دەکەین لەبرای پیاوچاک و ڕاستگۆ، وە پێغەمبەری پیاوچاک و ڕاستگۆ) متفق علیه.**

## بیروباوەڕی گاورەکان لەبارەی دابەزینی عیسا (علیە السلام)

گاورەکان بیروباوەڕیان وایە کە عیسا علیە السلام کوڕی خوایە، وەباوەڕیان وایە کەوا ئەو کوژراوەو لەخاچ دراوە، پاشان لەدوای سێ ڕۆژ لەخاچ دانەکەی بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، وەئێستا دانیشتووە لەتەنیشت باوکیەوە – کەخودایە – وە ئەو لەئاخری زەماندا دادەبەزێت، ئێمە پێشتر باسی بەرزبوونەوەی عیسامان کرد علیە السلام کەوا ئەو نەکوژراوە وە نەلەخاچیش دراوە، بەڵام بەویان چوواند.

### خاوەنانی کتێب ڕێککەوتوون لەسەر سەلماندنی هەردوو مەسیحەکە:

١. مەسیحی هیدایەت دەرو ڕێگای ڕاست نیشاندەر لەکوڕەکانی (داوود) علیە السلام ئەویش عیسایە علیە السلام.
٢. وەمەسیحی گومڕا، خاوەنانی کتێب دەڵێن ئەوە لەنەوەکانی (یوسف)ە علیە السلام، ئەویش مەسیحی دەجالە. (شیخ الاسلام ابن تیمیة) (١٨٧/٢)

### بیروباوەڕی گاورەکان ناکۆکە لەگەڵ بیروباوەڕی موسڵمانەکان لەبارەی عیسا علیە السلام.

١. بیروباوەڕی گاورەکان وایە کە عیسا کوڕی خوایە، ئەمەش نارەواو نادروستەو، ڕاستەکەی ئەوەیە کەوا ئەو مرۆڤە، بەندەیە، پێغەمبەرە.
٢. گاورەکان باوەڕیان وایە کەوا جوولەکە عیسایان علیە السلام کوشتووەو، لەخاچیان داوەو، ئەمەش نارەواو نادروستە، ڕاستیەکەی کە ئەوان نەکوشتوویانە و نەلەخاچیشیان داوە.
٣. گاورەکان باوەڕیان وایە کەعیسا (علیە السلام) پاش ئەوەی لەخاچ درا لەدوای سێ ڕۆژ بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان، ئەمەش نارەواو نادروستە بەڵکو بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان بەبێ لەخاچ دان و بەبێ کوشتن.

## ئەو بارودۆخەی کەوا عیسا علیه السلام تێیدا دادەبەزێت:

موسڵمانەکان دەردەچن بۆ ئەوەی شەڕێکی گەورە لەگەڵ گاورەکان بەرپابکەن،.. وە شاری قوستەنتینیە رزگار دەکەن و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ حوکم کردنی گاورەکان.
ئەوە ئاشکرا دەبێت کە موسڵمانەکان بەتەهلیل و تەکبیر ئەو شارەیان ئازاد کردووە، نەک بەچەک، لەو کاتەدا شەیتان بانگ دەکات کەوا دەجال دەرکەوتووە، بۆیە موسڵمانەکان لەقوستەنتینە دەگەڕێنەوە دیمەشق، چونکە پێگەو سەربازگەی موسڵمانەکان لەدیمەشقە، پاش ئەمە بەڕاستی مەسیحی دەجالی گومڕا دەردەکەوێت، هەموو زەوی دەسووڕێتەوەو فیتنەیەکی گەورە دەنێتەوە.

لەڕیوایەتێکی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ بەدرێژی قسە لەبارەی دەجالەوە دەکات و دەفەرموویێت (يأتي سباخ المدينة ، وهو محرم عليه أن يدخل نقابها ، فتنتفض المدينة بأهلها نفضة أو نفضتين ، وهي الزلزلة ، فيخرج إليه منها كل منافق ومنافقة ، ثم يولي الدجال قبل الشام ، حتى يأتي بعض جبال الشام فيحاصرهم ، وبقية المسلمين يومئذ معتصمون بذروة جبل من جبال الشام ، فيحاصرهم الدجال نازلا بأصله ، حتى إذا طال عليهم البلاء ، قال رجل من المسلمين : يا معشر المسلمين ، حتى متى أنتم هكذا وعدو الله نازل بأرضكم هكذا ، هل أنتم إلا بين إحدى الحسنيين ، بين أن يستشهدكم الله أو يظهركم ، فيبايعون على الموت بيعة يعلم الله أنها الصدق من أنفسهم ، ثم تأخذهم ظلمة لا يبصر امرؤ فيها كفه ، قال : فينزل ابن مريم فيحسر عن أبصارهم ، وبين أظهرهم رجل عليه لأمته يقولون : من أنت يا عبد الله ؟ فيقول : أنا عبد الله ورسوله ، وروحه ، وكلمته ، عيسى ابن مريم ، اختاروا بين إحدى ثلاث : بين أن يبعث الله على الدجال وجنوده عذابا من السماء ، أو يخسف بهم الأرض ، أو يسلط عليهم سلاحكم ، ويكف سلاحهم عنكم ، فيقولون : هذه يا رسول الله ، أشفى لصدورنا ولأنفسنا ، فيومئذ ترى اليهودي العظيم



الطويل ، الأكول الشروب ، لا تقل يده سيفه من الرعدة ، فيقومون إليهم فيسلطون عليهم ، ويذوب الدجال حين يرى ابن مريم كما يذوب الرصاص ، حتى يأتيه أو يدركه عيسى فيقتله.) **واتە: ( دەجال دێتە خاكی سەبخە** (كەوا زەوییەكی سوێرەو هیچی لێ شین نابێت) **لەشاری مەدینە، بێگومان لێی قەدەغە كراوە بچێتە ژووری دەرگاكان، جا شاری مەدینە جارێک یادووجار دەهەژێت، هەرچی دووڕوو هەیە لەپیاو ئافرەت لەمەدینە دەچێتە دەرەوە، پاشان دەجال ڕوو دەكاتە شام تاوەكو دەگاتە هەندێک لەچیاكانی شام، جادەجال ئەو موسڵمانانەی لەسەر لووتكەی چیاكان بوون گەمارۆیان دەدات، ئەو كاتە دەجال لەچیاكان دێتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بەڵاو ناخۆشی لەسەر چیاكان تووشی موسلمانەكان بێت لەبەر درێژی مانەوەیان، یەكێک لەپیاوە موسڵمانەكان دەڵێت، هەتا كەی ئێوە ئاوا دەمێننەوە؟ لەكاتێكدا دوژمنی خوا دابەزیوەتە سەر خاكی ئێوە؟!**

**ئایا ئێوە لەنێوان دوو خۆشیدا نین، لەنێوان ئەوەی كەخودای گەورە شەهیدتان دەكات یان سەرتان دەخات؟ بەجۆرێک بەیعەتی مردن دەدەن تەنها خوای گەورە دەزانێت كەوا ئەو ڕاستیەی لەناو دڵ و دەروونیانەوەیە، لەوكاتەدا خۆیان ئامادە دەكەن بۆ نوێژی بەیانی لەكاتی قامەت كردن تاپیاوێک دەردەكەوێت پۆشاكی جەنگی پۆشیووە، پێی دەڵێن تۆكێیت ئەی بەندەی خوا؟ دەفەرموێت: من بەندەی خواو پێغەمبەری ئەوو ڕۆحی ئەوم من عیسای كوڕی مەریەمم، لەنێوان یەكێک لەوسێیانە هەڵبژێردراوە، لەنێوان ئەوەی خوای گەورە ڕەوانەی كردووە بۆ سەر دەجال وە سەربازەكانی لەئاسماندا، یان لەزەوی بیانباتە خوارەوە، یاخود بە چەكەكانتان بەسەریاندا زاڵ ببن، وەچەكی ئەوان لەسەر ئێوە دادەبەزێت، ئەوانیش دەڵێن: ئەمەیە – ئەی پێغەمبەری خوا – دڵ و دەروونمان چاک بكەو خاوێنی بكەوە، لەو ڕۆژەدا ئەو جوولەكە گەورەیە چلێس و زۆر خۆرو شەراب خۆرە لەترسی عیسا علیه السلام دەستەكانی شمشێریان پێ ڕاناوەستێ و بەرگەی ناگرێت، جا موسڵمانەكان هێرش دەكەنە سەریان و بەسەر یاندا زاڵ دەبن، وەدەجالیش كاتێک عیسای كوڕی مەریەم دەبینێت وەک خوێ لەناو ئاو دەتوێتەوە تاوەكو دەگاتە سەر دەجال و دەیكوژێت)** معمر ریوایەتی كردووە.

لەباسەكانی پێشوودا چیرۆكی كوشتنی دەجال لەلایەن عیسا علیه السلام بەدرێژی باسكراوە سەیری نیشانەی ژمارە (١) بكە لەنیشانەكانە گەورەكانی ڕۆژی دوایی.

# عیسا علیه السلام چۆن و لەکوێ دادەبەزێت؟

عیسا علیه السلام لەلای منارە سپیەکە لەرۆژهەلاتی دەیمەشق دادەبەزێت، دوو پۆشاکی لەبەر دایە بەڕووەکێکی ڕەنگ زەرد پێی دەوترێت (الورس)، پاشان زەعفەران داپۆشراوە، هەردوو دەستەکانی لەسەر شانی دوو فریشتە داناوە.







**ئیبن کثیر دەڵێت : (ئەوەی بەناو بانگە لەشوێنێک دادەبەزێت لەلای منارە سپیەکەی رۆژهەلاتی دیمەشق، لەوکاتەدا دادەبەزێت قامەت کراوە بۆ نوێژی بەیانی جا پێشەوای موسلمانان مەهدی پێی دەڵێت، ئەی رۆحی خودا، فەرمووپێشکەوە، جا عیسا علیه السلام دەفەرموویێت: تۆ پێش کەوە چونکە قامەت بۆ تۆکراوە)**

وە لەریوایەتێکی دیکەدا : **(بعضكم على بعض أمراء، يكرم الله هذه الأمة)** **واتە:** ( ئێوە هەندێکتان لەسەر هەندێکتان فەرمانڕەوان ئەوە ڕێزێکە خوای گەورە لەو ئوممەتەی ناوە)

**ئیبن کثیر دەڵێت : (بینایەی منارەکە لەزەمانی ئێمەدا لەساڵی ٧٤١کۆچی لەبەردی سپی نوێ کرایەوە، بینایەکەش لەسەر پارەو پوولی گاوەرکان بوو نەوانەی منارەکەیان سووتاند کەلەو جێگایەدا بوون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر حەدیسەکانی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت کەوا دەرکەوتووە، بەجۆرێک خودای گەورە بەپارەی گاورەکان ئەو منارە سپیە نۆژەن دەکاتەوە تاوەکو عیسای کوڕی مەریەم لەسەری دابەزێت، جا بەراز دەکوژێت، وە خاچ دەشکێنێت، وەسەرانەیان لێ قەبوول ناکات)** النهاية في الفتن و الملاحم (١٩٢/١)

من خۆم سەردانی دیمەشقم کرد لەلایەن منارە سپیەکە لەرۆژهەلاتی دیمەشق لەساڵی ١٩٩٢ز - ١٤١٢ک، لەلای خەڵکی ئەو منارەیە بەناوبانگە بەوەی کە عیسای کوڕی مەریەم علیە السلام لەسەری دادەبەزێت و، وێنەی منارەکەشم گرت، ئەمەش دەکەوێتە دەروازەی بازارەکە نەک لەسەر مزگەوتەکە!! ( وە ئەو گەڕەکە زۆربەی دانیشتووانیان گاورە، ئایا ئەوە ئەو منارەیە کەعیسا علیە السلام لەسەر دادەبەزێت، یاخود منارەیەکی ترە، ئەمەتەنها خودای گەورە باشتر دەزانێت.


ئەو منارەیەی کەوا لەدەروازەی بازارەکەدایە

دەڵێن دابەزینی عیسا علیە السلام لەسەر یەکێک لەمنارەکانی مزگەوتی ئەمەوی دەبێت لەدیمەشق - وەخودای گەورەش لەهەموو کەس بەرزترو زاناترە.


مزگەوتی ئەمەوی لەدیمەشق

# سیفەت و ڕووخساری عیسا علیه السلام

پێغەمبەر ﷺ وەسفی عیسای علیه السلام کردووە، وە ئەو بارو دۆخەشی ئاشکرا کردووە کەعیسا تێیدا دادەبەزێت، بۆ ئەوەی کارەکە ئاشکرا و ڕوون بێتەوەو نەشێوێت، ئەو پیاوە:

- پیاوێکی چوارشانەیە واتە نەدرێژەو نەکورتە.
- ڕەنگی دەم وچاوو ڕووخساری بەرەو سوورو سپی دەچێت.
- سینگی پان و فراوانە.
- قژی خاوە – وەک ئەوە وایە سەری دڵۆپە ئاوی لێ بتکێت بەڵام تەڕیش نەکرابێت.
- نزیکترین کەس کە لەعیسا علیه السلام دەچێت عەروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفییە ڕەزای خوای لەسەر بێت.

لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ليلة أسري بي لقيت موسى عليه السلام، ولقيت عيسى، فنعته النبي ﷺ فقال: رَبْعَة أحمر، كأنما خرج من ديماس – يعني : الحمام ..) **واتە: ( لەشەو ڕۆیەکەم دا بەموسا علیه السلام گەیشتم.... وەپاشان بەعیسا علیه السلام گەیشتم، پێغەمبەر ﷺ باسی دەکات و دەفەرمووێت ( زۆر سوورو سپی بوو، وەک ئەوە وابوو لەگەرماو هاتبێتە دەرەوە ..)** متفق علیه.

ئیبن و عەباس ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (رأيت عيسى، وموسى، وابراهيم عليهم السلام، فأما عيسى، فأحمر جعد، عريض الصدر...) **واتە: ( عیسا، و موسا، و ئیبراهیم)م بینی بەڵام عیسا سورێکی قژ لوول بوو، سینگی پان و فراوان بوو. )** بوخاری ریوایەتی کردووە .

لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (لقد رأيتني وأنا في الحجر وقريش تسألني عن مسراي ، فسألوني عن أشياء من بيت المقدس لم أثبتها ، فكربت كربا ما كربت مثله ، فرفعه الله لي أنظر إليه . قال : فما يسألوني عن شيء إلا أنبأتهم به وقد رأيتني في جماعة من الأنبياء فإذا موسى قائم يصلي ، فإذا رجل ضرب جعد كأنه من رجال شنوءة ، ورأيت عيسى قائما يصلي أقرب الناس به شبها عروة بن مسعود الثقفي ، وإذا إبراهيم قائم يصلي أشبه الناس به صاحبكم – يعني نفسه – فحانت الصلاة وأممتهم فلما فرغت من الصلاة ، قال لي قائل : يا محمد هذا مالك خازن النار فسلم عليه فالتفت إليه فبدأني بالسلام) **واتە: (لەلای بەردە ڕەشەکە لە کەعبە منیان بینی، قورەیشەکان پرسیاریان لێکردم لەبارەی شەوڕۆیەکەم؟ جا پرسیاریان لێکردم لەبارەی ئەو شتانەی لەبیت المقدس دا هەبوو منیش لەبیرم نەما بوو، جا تووشی خەم و پەژارەیەک بووم قەت وا**

تووشی ئەو خەم و پەژارە نەببووم، دەفەرموویت: ئینجا خوای گەورە بیت المقدسی بۆ من بەرزکردەوە، تەماشام دەکرد، هەرپرسیارەکیان لێدەکردم ئیلا پێیانم دەووت، وەکۆمەڵێک لەپێغەمبەرانم بینی، موسام بینی دەیوست نوێژ بکات، پیاوێک بوو هەروەک پیاوەکانی بنەماڵەی (شنوءە) دەچوو، عیسام بینی هەڵسابوو نوێژ بکات، نزیکترین کەسێک بەو چووبایە عروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی بوو، ئیبراهیمم بینی هەڵسا بۆ نوێژ کردن، ئەوەی زۆر لەو دەچوو، هاوەڵی ئێوەیە – واتە خۆی پێغەمبەر ﷺ – کاتی نوێژ کردن هات و ئیمامەتیم بۆ یان کرد، کاتێک لەنوێژەکە تەواو بووم یەکێک ووتی: ئەی محمد ئەوە مالیکی فریشتە دەرگەوانی دۆزەخە، سەلامی لێبکە، ئاوڕم لێ دایەوە، جا ئەو زوو تر سەلامی لێکردم) موسلیم ریوایەتی کردووە.



هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (أراني الليلة في المنام عند الكعبة ، فإذا رجل آدم ، كأحسن ما يرى من أدم الرجال تضرب لمته بين منكبيه ، رَجِلُ الشعر ، يقطر رأسه ماء ، واضعا يديه على منكبي رجلين وهو يطوف بالبيت ، فقلت : من هذا ؟ فقالوا : هذا المسيح ابن مريم ، ثم رأيت رجلا وراءه جعدا قططا أعورعين اليمنى ، كأشبه من رأيت من الناس بابن قطن ، واضعا يديه على منكبي رجل يطوف بالبيت ، فقلت : من هذا ؟ فقالوا : هذا المسيح الدجال)

**واتە:** (شەوێک لەخەومدا لەلای کەعبە بینیم، پیاوێک کەئادەم بوو، لەجوانترین شێوە بوو لەناو پیاوان مەیلەو ئەسمەربوو، پرچی بۆ ناو شانەکانی هاتبووە خوارەوە، پیاوێک پرچی دلۆپ دلۆپ ئاوی لێ دەچۆڕا، هەردوو دەستەکانی خستبووە سەر شانی دووپیاو، کە ئەو لەنێوانیاندا بوو، لەکەعبەدا دەسوڕایەوە، جا ووتم ئەوە کێیە؟ ووتیان: مەسیحە کوڕی مەریەم، پاشان لەدوای ئەو پیاوێکم بینی ڕووخساری لەپشیلە دەچوو، چاوی ڕاستەی کوێر بوو، لەیەکێک دەچوو لەناو خەڵکدا بە (ابن قطن) کەبینیم – واتە عبدالعزى بن قطن بن عمرو الخزاعي- هەردوو دەستەکانی لەسەر شانی دووپیاو دانابوو، لەکەعبە دەسووڕایەوە، جا ووتم، ئەوە کێیە؟ ووتیان ئەوە مەسحیی دەجالە) متفق علیه.







**هەندێک شتەکان بەگومان وەردەگرن کەواچۆن عیسای کوڕی مەریەم علیه السلام لەگەڵ دەجال کۆدەبێتەوە، وە دەجال ئەگەر عیسا ببینێت دەتوێتەوە وەک قورقوشم چۆن دەتوێتەوە؟ بەڵکو چۆن دەجال دەچێتە ناوکەعبە، لەگەڵ ئەوەی کەعبە لێی قەدەغەکراوە بچێتە ناوی ؟**

وەڵام ئەمە خەوبینینە، کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت بینیوویەتی ئەمە شتێک نیە لە واقیع ڕووی دابێت.

## ئیش و کارەکانی عیسا علیه السلام وە ئەوەی ڕوودەدات لەسەردەمی ئەودا:

پاش دابەزینی عیسا علیه السلام وە کوشتنی دەجال و سەقامگیربوونی کاروباری ئیمانداران، دەبێت عیسا علیه السلام بەچەند گرنگیەک هەڵسێت، کەلەسەردەمی ئەودا ڕوودەدا:

- **دامەزراندن و پتەوکردنی ئیسلام، ملکەچ کردنی خەڵکی بەشەریعەت، وە زاڵبوون بەسەر گشت ئاینە لادەرەکان.**

لەئەبی هوریرەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (والذي نفسي بيده، ليوشكن ان ينزل فيكم بن مريم حكماً عدلاً، فيكسر الصليب، ويقتل الخنزير، ويضع الجزية)
**واتە: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، خەریکە عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت بۆتان دەبێت بەفەرمانڕەوایەکی ڕاست و دادپەروەر، ئینجا خاچەکان دەشکێنێت، و بەراز دەکوژێت، وسەرانە لادەبات )** متفق علیه.

- **بەرزکردنەوەی (کلمة الله)، وە بەتاڵ کردنی بانگەوازی جوولەکەو دیانەکان، وەلابردنی سەرانە.**
- **کوشتنی مەسیحی دەجال.**
- **فەرمانڕەوایی کردن لەنێوان خەڵکدا وە بڵاوکردنەوەی دادوەری و ئاشتی.**

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (الأنبياء كلهم إخوة لعلات ، أمهاتهم شتى ، ودينهم واحد ، وأنا أولى الناس بعيسى

ابن مريم إنه ليس بيني وبينه نبي ، وإنه نازل إذا رأيتموه فاعرفوه ، رجل مربوع إلى الحمرة والبياض بين ممصرين كأن رأسه يقطر ، وإن لم يصبه بلل ، فيقاتل الناس على الإسلام ، فيدق الصليب ، ويقتل الخنزير ، ويضع الجزية ، ويهلك الله في زمانه الملل كلها إلا الإسلام ، ويهلك المسيح الدجال ، وتقع الأمنة في الأرض حتى ترتع الأسد مع الإبل ، والنمار مع البقر ، والذئاب مع الغنم ، ويلعب الصبيان بالحيات ، لا تضرهم ، فيمكث في الأرض أربعين سنة ، ثم يتوفى ، فيصلي عليه المسلمون) **واتە:** **(پێغەمبەران بران لەخەم و پەژارەو ناخۆشیدا، دایکیان جیاوازو جۆراو جۆرن و ئاییینیان یەکە، و من لە هەموو کەس لەپێشترم لەعیسای کوڕی مەریەم، چونکە لەنێوان من و ئەودا هیچ پێغەمبەرێک نیە، ئەو بێگومان دادەبەزێت، جا ئەگەر بینیتان پیاوێکی چوارشانەیەو ڕووخساری بۆلای سوورو سپی دەچێت، دوو پۆشاکی مەیلەو زەردی لەبەردایە، سەری وەک ئەوەیە دلۆپ ئاوی لێ بتکێت کەچی تەڕیش نیە، لەخاچەکان دەدات، و بەراز دەکوژێت، وە جەزیەو سەرانە لادەبات. وە بانگەوازی خەڵکی دەکات بۆ ئیسلام، لەزەمانی ئەودا خودای گەورە مەسیحی دەجال لەناو دەبات و، ئەمن و ئاسایش لەسەر زەوی ڕوودەدات هەتا شێر لەگەڵ ووشتر یاری دەکات، پڵنگ لەگەڵ چێل و، گورگ لەگەڵ مەڕو، منداڵ یاری لەگەڵ مار دەکات، بێ ئەوەی زیانیان پێ بگەیەنێت، چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، پاشان دەمرێت و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن)** ئەحمەد و حاکم ڕێوایەتیان کردووە.



- **بڵاوبوونەوەی هەرزانی و ئاسایش لەسەر زەوی**
- **ڕۆیشتنی پادشای قوڕەیش**

لەئەبی امامە الباهلی ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت (فيكون عيسى ابن مريم عليه السلام في أمتي حكما عدلا ، وإماما مقسطا ، يدق الصليب ، ويذبح الخنزير ، ويضع الجزية، ويترك الصدقة ، فلا يسعى على شاة ، ولا بعير ، وترفع الشحناء ، والتباغض ، وتنزع حمة كل ذات حمة ، حتى يدخل الوليد يده في الحية،

فلا تضره ، وتفر الوليدة الأسد ، فلا يضرها ، ويكون الذئب في الغنم كأنه كلبها، وتملأ الأرض من السلم كما يملأ الإناء من الماء ، وتكون الكلمة واحدة ، فلا يعبد إلا الله ، وتضع الحرب أوزارها ، وتسلب قريش ملكها ، وتكون الأرض كفاثور الفضة ، تنبت نباتها بعهد آدم حتى يجتمع النفر على القطف من العنب فيشبعهم ، ويجتمع النفر على الرمانة فتشبعهم ، ويكون الثور بكذا وكذا من المال، وتكون الفرس بالدريهمات)



**واتە:** (عیسای کوڕی مەریەم دەبێتە فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر، وەپێشەوایەکی مافپەروەر دەبێت، خاچ دەشکێنێت و، بەراز دەکوژێت و ، سەرانە لادەبات، وەخێر و سەدەقە ناهێڵێت لەبەر زۆربوونی سەروەت و سامان، خەڵکی خۆیان سەرقاڵ ناکەن بۆ بەخێو کردنی مەڕو ماڵات و ووشتر، ڕق و قین و حەسادەت و تووڕەبوون ناهێڵێت، وە ژەهری هەموو گیانلەبەرێکی زیانبەخش لادەبات – بەمانای هەموو مارو مێروولەیەک بێ زیان دەبن – تاوەکو وای لێدێت ئەگەر منداڵ دەست بخانە تاو دەمی مار، ئەوا زیانی پێ ناگەیەنێت، وەمنداڵی بچووک یاری لەگەڵ شێر دەکات و زیانی پێ ناگەیەنێت، وەگورگ لەگەڵ مەڕدا دەبێت وەک ئەوە سەگەو پاسەوانی لێ دەکات، وە زەوی پڕ دەبێت لەئاشتی هەروەک چۆن دەفر پڕ دەبێت لەئاو، هەموو تەنها یەک ووشە دەبێت، جگە لەخوا هیچ شتێک ناپەرسترێت، شەڕو جەنگ بارگرانیەکەی لا دەچێت وەقورەیش پادشاکەی دەردەکات، زەوی وەک دەفرێکی زیوی لێدێت ڕووەک شین و دەبێت وەک و سەردەمی ئادەم، تاوەکو وای لێدێت کۆمەڵەکەسێک لەسەر یەک هێشوو ترێ کۆدەبنەوە، و لێی دەخۆن وە هەمووشیان تێر دەبێن، وە کۆمەڵەکەسێک لەسەر یەک هەنار کۆدەبنەوەو تێری لێ دەخۆن، مانگاو گامێش بە ئەوەندەو ئەوەندە پارەیە، وە ئەسپێک بەچەند درهەمێک دەکڕدرێت) ابن ماجەو ابن خزیمە و ضیاء المقدسی ریوایەتیان کردووە.

- **لابردنی تووڕەیی، وەنەمانی ئیرەیی و حەسادەت و ڕق و قین لەناو دڵی خەڵکدا:**

لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت ( طوبى لعيش بعد المسيح يؤذن للسماء في القطر , ويؤذن للأرض في النبات , حتى لو بذرت حبك على الصفا لنبت , وحتى يمر الرجل على الأسد فلا يضره , ويطأ على الحية فلا تضره , ولا تشاح , ولا تحاسد , ولا تباغض) **واته: (ئافەرین و خۆشی بۆ ژیانێک کە لەدوای مەسیح دێت، مۆڵەت دەدرێت بەئاسمان کەبباریت، وە مۆڵەت دەدرێت بەزەوی کەبڕوێت و سەوز بێت، تەنانەت ئەگەر دەنکە تۆوێک لەسەر بەردی ڕەق بچێندرێت شین بێت، وە پیاو بەلای شێردا دەڕوات زیانی پێ ناگەیەنێت، وە پێ بنێت بەسەر ماردا زیانی پێ ناگەیەنێت، نەڕق و قین دەمێنێت، و نەحەسوودی و تووڕە بوون و ناکۆکی)** دلیمی ریوایەتی کردووە

- **وەستانی شەڕو کوشتار**



داس

لەئەبوهوریرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (ينزل ابن مريم إماما عادلا ، وحكما مقسطا ، فيكسر الصليب ، ويقتل الخنزير ، ويرجع السلم ، ويتخذ السيوف مناجل ، وتذهب حمة كل ذات حمة ، وتنزل السماء رزقها ، وتخرج الأرض بركتها ، حتى يلعب الصبي بالثعبان ، فلا يضره ، ويراعي الغنم الذئب ، فلا يضرها ، ويراعي الأسد البقر ، فلا يضرها) **واته: (عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت پێشەوایەکی ڕاست و مافپەروەر وەفەرمانڕەوایەکی دادپەروەر دەبێت، خاچ دەشکێنێت، و بەراز دەکوژێت، و ئاشتی دەگەڕێتەوە، داس جێگای شمشێر دەگرێتەوە، مارو گیانلەبەرە ژەهردارەکان بێ زیان دەبن، ئاسمان ڕزق و ڕۆزی خۆی دەهێنێتە خوارەوە، وەزەوی بەرەکەتی خۆی دێنێتە دەرەوە، تاکو منداڵی بچووک یاری بەمار دەکات، گورگ و مەڕ پێکەوە دەلەوەڕێن بێ ئەوەی زیانی پێ بگەیەنێت، وەشێرو مانگاپێکەوە دەلەوەڕێن بێ ئەوەی زیانی پێ بگەیەنێت (٣)** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

## پلەوپایەی ئەو کەسانەی لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەم دان علیه السلام

لەثەوبانەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت ( عصابتان من أمتي أحرزهما الله من النار : عصابة تغزو الهند ، وعصابة تكون مع عيسى ابن مريم عليهما السلام) **واتە: ( دووکۆمەڵ هەن لەئوممەتی من خوای گەورە دەیان پارێزێت لەئاگر، کۆمەڵێک غەزای هندستان دەکەن، کۆمەڵێکیش لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەم دان)** نسائی ریوایەتی کردووە


تاج محل : بەناو بانگترین شوێنەوارەکانی هیندستان




## حیکمەت لەهاتنەخوارەوەی عیسا علیه السلام نەک یەکێکی دیکە:

لەوانەیە پرسیار بکەی، لەبارەی هەڵبژاردنی عیسا علیه السلام لەدابەزینی بۆ سەرزەوی جگە لەپێغەمبەرێکی دیکە لەئاخیری زەماندا؟

هەندێک لەزانایان باسی حیکمەتی دابەزینی عیسا علیه السلام جگە لەیەکێکی دیکە بەم فەرموودانە دەکەن:

- بەرپەرچدانەوەیەکە لەسەر جوولەکەکان کەوا دەزانن ئەوان عیسایان کوشتووە، بۆیە خودای گەورە درۆکانیان ئاشکرا دەکات، وە هەر عیسایە کەئەوان و سەرکردەکەیان

کەدەجالە دەکوژێت، وە الحافظ بن حجر ئەو قەولەی لەهەموو قەولەکانی دیکە پێ چاکترو دروستتربووە لەوانی دیکە.

- عیسا علیه السلام لەئینجیلدا بینراوە ئوممەتی محمد ی لەهەموو ئوممەتەکان چاکتر داناوە. هەروەک خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموێت ﴿ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ ﴾ الفتح/ ٢٩

**واتە: (نموونەو پێناسەشیان لەئینجیلیشدا وەک رووەکێک وایە کە لەسەرەتاوە چەکەرە بکات، جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت، پاشان ئەستوور بێت و رابوەستێت لەسەر قەدەکەی)**

بۆیە عیسا علیە السلام لە خوا دەپاڕێتەوە کە ئەو لەئوممەتی محمد حیساب بکات، خودای گەورەش نزاکەی قەبوول دەکات، بۆیە دەیهێڵێتەوە تاکۆتایی زەمان و دادەبەزێت و دەبێتە نوێ کەرەوەی دینی ئیسلام، کەوا محمد دروودی خوای لەسەر بێت بۆی رەوانە کراوە.

- هۆی دابەزینی عیسا علیە السلام لەئاسماندا بۆ ئەوەی ژیان و ئەجەلی لەزەویدا کۆتایی پێبێت و لەزەویشدا بنێژرێت، ئەی گوایە لەخۆڵ دروست نەکراوە دەبێت هەر لەزەویشدا بمرێت، وەهەر لەوێشدا بنێژرێت، بۆیە دابەزینەکەی رێکەوتە لەگەڵ دەرکەوتنی دەجال جا عیسا علیە السلام دەیکوژێت.



- ئەو دادەبەزێت بۆ پووچەڵ کردنەوەی درۆی گاورەکان، و دەرخستنی درۆکانیان بەوەی بانگەواز دەکەن گوایە عیسا علیە السلام کوڕی خوایە، جا خودای گەورە لەسەردەمی ئەودا هەموو ئایین و ڕێچکە خوارو خێچەکان لەناو دەبات جگە لە ئیسلام نەبێت، ئەو کاتە عیسا علیە السلام. خاچ دەسکێنێت و، بەراز دەکوژێت و سەرانە لادەبات.

- لەنێوان عیسا و محمد علیهما الصلاه والسلام، جۆرە پەیوەندەیەک هەیە بەگوێرەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر درروودی خوای لەسەر بێت کەدەفەرموێت ( أنا أولى الناس بعيسى ابن مريم، ليس بيني وبينه نبي) ئەحمەد ریوایەتی کردووە **واتە: ( من لەهەموو کەس لەپێشترم لەعیسا، چونکە لەنێوان من و**

ئەودا هیچ پێغەمبەرێک نیە) جا پێغەمبەرمان دروودی خوای لەسەر بێت تایبەتمەندترین کەسە و نزیکترین کەسیشە لەعیسا علیه السلام، چونکە عیسا علیه السلام موژدەی هاتنی (محمد پێغەمبەری خوا)ی داوە کە دوای ئەو دێت، و عیسا داوای لەخەڵک کردووە باوەر بە محمد دروودی خوای لەسەر بێت بهێنن و بەراستی بزانن).

هەروەک خودای گەورەو میهرەبان دەفەرمووێت ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ الصف/ ٦

( بیریان خەرەوە، کاتێک عیسای کوڕی مەریەم بەنەوەی ئیسرائیلی ووت، منیش بەڕاستی پێغەمبەری خوام بۆ سەر ئێوە، ڕاستی تەوراتیش دەسەلمێنم کەلەپێش منداهاتووە، هەروەها موژدە دەریشم بەپێغەمبەرێک کەدوای من دێت و ناوی - ئەحمد -ە کەچی، کاتێک بەبەڵگەو نیشانەی تێرو تەواو بەموعجیزەی ئاشکراوە پێی ڕاگەیاندن، ووتیان ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە)

لەحەدیسێکی دیکە: ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هەواڵی خۆتمان بدەریێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی( نعم، أنا دعوة أبي إبراهيم، وبشرى أخي عيسى) ئەحمەد ریوایەتی کردووە
**واتە:** ( بەڵی من داواکەی باوکە ئیبراهیمم، وە موژدەکەی برام عیسام)

## پێغەمبەرمان ﷺ داوا لەئێمە دەکات سەلامی ئەو بەعیسا علیه السلام ڕابگەیەنین

ئەبوهورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ( يوشك المسيح عيسى ابن مريم أن ينزل حكما قسطا ، وإماما عدلا ، فيقتل الخنزير ، ويكسر الصليب ، وتكون الدعوة واحدة « ، فأقرئوه ، أو أقرئه السلام من رسول الله صلى الله عليه وسلم ، وأحدثه فيصدقني ، فلما حضرته الوفاة ، قال : أقرئوه مني السلام) **واتە:** ( خەریکە عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت و دەبێتە فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر، جا بەراز دەکوژێت، و خاچ دەشکێنێت، بانگەوازەکە دەبێتە یەک بانگەواز بەپیریەوە بڕۆن و سەلامی لێبکەن یاخود سەلامی پێغەمبەری خوای پێ رابگەیەنن جا قسەی لەگەڵ بکەن و بڕوام پێ دەهێنن)
جاکاتێک ئەبو هورەیرە لەسەرەمەرگدا بوو ووتی ( سەلامی من بەعیسا ڕابگەیەنن) ئەحمەد ریوایەتی کردووە

وەلەڕیوایەتێکی دیکەدا لەئەبوهورەیرە رەزای خوای دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ( أني لأرجون إن طال بي عمر أن ألقي عيسى بن مريم فإن عجل بي موت لقيه منكم فليقرئه مني السلام) **واتە: ( من تەمەننا دەکەم تەمەنم درێژ بێت بۆ ئەوەی بەعیسای کوڕی مەریەم بگەم، وە ئەگەر مردن پەلەی لێ کردم هەر کەسێ لەئێوە پێی گەیشت سەلامی منی پێ ڕابگەیەنن)** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە

## ماوەی مانەوەی عیسا علیه السلام لەسەر زەوی لەپاش دابەزینی

عیسا علیه السلام چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، خەڵکی لەوکاتەدا بەخۆشی و ئاشتی و دادپەروەری دەژین، ئەمەش بەڵگە لەسەری کەوا لەحەدیسێکدا هاتووە، و ئیمامی هورەیرە گێراویەتەوە.

لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (الأنبياء إخوة لعلات أمهاتهم شتى ودينهم واحد، وأنا أولى الناس بعيسى بن مريم لأنه لم يكن بيني وبينه نبي..الى أن قال: فيمكث - أي عيسى - أربعين سنة لم يتوفى ويصلى عليه المسلمون) ئەحمەدو حاکم ڕیوایەتیان کردووە **واتە: (پێغەمبەران هەموویان بران و دایکیان جیایە و ئایینەکەیان یەکە، وەمن لەهەموو کەس لەپێشترم لەعیسای کوڕی مەریەم چونکە لەنێوان من و ئەوا هیچ پێغەمبەرێک نەبووە. تا ئەو شوێنەی دەفەرموێت ( جا عیسا چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە پاشان دەمرێت وئینجا موسلمانانان نوێژی لەسەر دەکەن)**

ئەبو هورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت لەتەفسیری فەرموودەی خودای عزوجل ﴿وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ﴾ دەڵێت (دەرچوونی عیسا، لەسەر زەوی چل ساڵ دەمێنێتەوە، وە ئەم چل ساڵە هەروەک چوار ساڵ دەبێت، حەج و عەمرە دەکات ) عبدبن حميد ڕیوایەتی کردووە

## حەج کردنی عیسا علیه السلام

لەئەبو هورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (والذي نفسي بيده لَيُهِلَّنَّ بن مريم بفج الروحاء حاجاً أو معتمراً أو ليثنيهما) موسلم ڕیوایەتی کردووە

**واتە: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە عیسای کوڕی مەریەم تەهلیلە دەکات لبيك اللهم لبيك – لەشوێنێک لەنێوان مەککەو مەدینە بەناوی فج الروحاء بۆ حەج یا عەمرە یان هەردووکیان پێکەوە دەکات)**

لەریوایەتێکی دیکەدا، لەئەبوهوەیرە رەزای خوای لەسەر دەڵێت کە وا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (ليهبطن عيسى ابن مريم حكما عدلا ، وإماما مقسطا وليسلكن فجا حاجا ، أو معتمرا أو بنيتهما وليأتين قبري حتى يسلم ولأردن عليه) حاكم ڕیوایەتی کردووە، **واتە: (بێگومان عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت و بەدادپەروەری و ڕاستی حوکم دەکات، وە لەفج بەتەهلیلە بۆ حەج یاعەمرە دەچێت یاخود هەردووکیان پێکەوە دەکات، وە پاشان دێتە سەر قەبری من و سەلامم لێ دەکات من وەڵامی دەدەمەوە) ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێت (ئەی کوڕەبراکانم ئەگەر بینیتان پێی بڵێن : ئەبوهورەیرە سەلامت لێ بدەکات)**








## یەئجوج و مەئجوج

دوو هۆزی گەورەن، یان دووگەلن لەنەوەی ئادەم، کەواله حەدیسی پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت، وە هەروەها لەهەندێ کتێبدا هاتووە، هەندێک دەڵێن کورتەباڵاو و بچووکن، هەندێکی تر دەڵێن زۆر گەورەن، وەهەندێکی دیکە دەڵێن گوێ یەکیان لە گوێ یەکەی تر درێژترەو ئەوی دیکە دادەپۆشێت، وە زۆر شتی لەمانەش ووتراوە بەڵام ئەمانە هیچ بنچینەیەکیان نیە.

بەڵکو ئەوانە لەنەوەی ئادەمن و لەسەر سروشتی نەوەی ئادەمن، بەڵام ئەوانە لەکاتی (ذو القرنین)دا قەوم و نەتەوەیەکی خراپە کاربوون لەسەر زەوی، جا دراوسێکانیان داوایان لە ذو القرنین کرد کە لەنێوان ئەوان و لەنێوان یەئجوج و مەئجوجدا بەربەستێک دابنێت، تاوەکو قەدەغەیان بکات لەگەیشتن پێیان، و لەسەر زەویدا خراپەکاریان لەگەڵدا نەکەن جا ذو القرنین ئەو کارەی کرد.

پێغەمبەریش دروودی خوای لەسەر بێت هەواڵی داوەکەوا لەکۆتایی زەماندا، لەپاش دابەزینی عیسا علیه السلام بەسەر خەڵکدا دەردەکەون و لەزەیدا بڵاودەبنەوەو عیسای کوڕی مەریەم و ئەو ئیماندارانەی کەلەگەڵیدا گەمارۆ دەدات لەچیای بیت المقدس، بارودۆخەکە لەسەر موسڵمانان زۆر توند دەبێت.

لەو کاتەدا خودای بەخشندەی میهرەبان کرمێک دەنێرێت بۆ سەر یەئجوج و مەئجوج و لە گەردنیان دەخوات هەموویان بەجارێک دەمرن، جا خودای گەورەو بەتوانا عیسا علیه السلام و هاوەڵەکانی لەشەڕی یەئجوج و مەئجوج دەپارێزێت و رزگاریان دەکات.

ئەمەی دێت درێژی باسکردنی یەئجوج و مەئجوجە لەڕووداوەکاندا.

## چیرۆکی دروستکردنی بەربەست لەسەر یەئجوج و مەئجوج

لەچیرۆکی پادشای ساڵح و چاکە خواز ذی القرنین خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ ﴾ الكهف: ٩٢ - ٩٧

**واتە/ (لەوەودوا هەر دەستبەرداری هۆکارەکان نەبوون، بەشوێنیاندا گەڕا (٩٢) هەتا کاتێک گەیشتە نێوان هەردوو بەربەستەکە، کەلەنێوانیاندا قەومێک هەبوو کە لەهیچ قسەیەک تێ نەدەگەیشتن (٩٣) کاتێک دەسەڵاتی (ذي القرنین)یان بینی ووتیان : ئەی (ذي القرنین) بەڕاستی یەئجوج و مەئجوج تووی خراپەو تاوان دەچێنن لەزەویدا، ئایا خەرجیەک و پارەکت بۆ کۆبکەینەوە، تا بەربەستێک لەنێوان ئێمەو ئەواندا دروست بکەیت؟ (٩٤) (ذي القرنین) ووتی: ئەو دەسەڵات و زانیاری و شتانەی پەروەردگارم پێی بەخشیووم چاکترە بۆ من (لەپارەو سامان) جا ئێوە بەهێزی بازوو یارمەتیم بدەن تا بەربەستێکی بەهێز لەنێوان ئێوەو ئەواندا دروست بکەن (٩٥) پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و (کەلەکەی بکەن) هەتا ئەمبەرو ئەوبەری کێوەکەی پڕکرد، ئەوسا فەرمانیدا، تا بە (موشەدەمە) فوو بکەن لەو ئاگرەی کەلەژێریدا کرابۆوە، هەتا کاتێک هەمووی کرد بەئاگر، ئینجا (ذي القرنین) ووتی : ئادەی مسی تواوەم بۆ بهێنن تابیکەم بەسەریدا (٩٦) ئەو سا ئیتر (یەئجوج و مەئجوج) نەتوانیشیان سەربکەون، نەتوانیان کوناو دەری بکەن(٩٧) )**

## یەکەم : ذو القرنین کێیە؟

پادشایەکی ئیمانداری دەستپاک و ڕاستگۆیە، هیچ پێغەمبەرێک نەبوو باسی ئەوەی نەکردبێت کە ئەو خاوەنی زانست و زانیاریەکی بێ سنوور بووە، بۆیە ناونراوە ذی القرنین چونکە بەرۆژهەڵات و رۆژ ئاوای ڕاگەیاندووە کەوا قۆچی شەیتان لەوێوە دەردەچێت و ئاواش دەبێت، ئەو ئەسکەندەری مەکدۆنی نیە،، ئەسکەندەر دەسەڵاتدارێکی کافربوو، وە زەمانەکەی ئەسکەندەر لەگەڵ ذی القرنین، ماوەی نێوان ذی القرنین و ئەسکەندەری مەکدۆنی زیاتر لەدوو هەزار ساڵ بوو، خوای گەورەش لەهەموو کەس زاناترە.

خودای گەورە لەسوورەتی الکهف باسی چیرۆکەکەی دەکات، کەوا هەموو زەوی دەسوڕێتەوە، لێرەدا دەوەستین لەگەڵ ئەو ئایەتانەی پەیوەندی هەیە بەچیرۆکەکەی لەگەڵ یەئجوج و مەئجوج دا.

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴾ واتە : بەرێگەی سێیەمدا رۆیشت لەنێوان رۆژ هەڵات و رۆژئاوادا، تا گەیشتە رووەو باکور بەجۆرێک چیاکان زۆر بڵندو دژوار بوون.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴾ واتە: تاوەکو لەگەڵ سەربازەکانی گەیشتە ناوچەیەک لەنێوان دووچیای بەرز بەبرینی زەویەک کەلەدوای ئەو دا ئەرمینیاو ئازەربایجان دێت.




هەردوو بەربەستەکەش : دووچیای زۆر بەرزو گەورەن، لەنێوان هەردوو چیایەکەدا دۆل و دەروازەیەک هەیە لەوێوە یەئجوج و مەئجوج دەردەچن بۆ وولاتی تورکیا، جا خراپە و تاوان بڵاو دەکەنەوەو زەوی کشت و کاڵ و منداڵی ساوا لەناو دەبەن .

جا کاتێک تورک هێزو دەسەڵات لەذی القرنین دەبینن، هێزو تواناو ڕاستگۆییان لێ رەچاوکرد، پێشنیاریان کرد کەوا بەربەستێک لەرووی یەئجوج و مەئجوج دا دروست بکات کەوا لەم رێڕەوەدا هێرشیان دەکەنە سەر، ئەمەش بەرامبەر سەروەت و سامان کە ئەوان بۆی کۆدەکەنەوەو لەبەرامبەر پاداشت و کارەکەی بیدەنێ.

بەڵام ذی القرنین پادشایەکی دەستپاک و دونیا نەویستە خۆی تەرخان بەدروستکردنی بەربەستەکە بەبێ پارەو پوول، بەڵکو تەنها داوای پاداشت و چاکە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دەکات، سەیری کرد کەوا باشترین ڕێگا بۆ دروستکردنەکەی پڕکردنەوەی ڕێڕەوەکەی نێوان دووچیایەکەیە، داوای لەقەومەکە کرد، کەوا یارمەتی بدەن.

﴿ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴾ واتە ( ئێوە بەهێزو بازوو یارمەتیم بدەن تابەربەستێکی بەهێز لەنێوان ئێوەو ئەواندا دروست بکەم)

ئینجا لەنێوان هەردوو چیایەکە ئاسنی ڕیزکرد پاشان ذی القرنین پێی ووتن ﴿ ٱنفُخُوا ﴾ واتە : بە (موشەدەمە) فووبکەن لەئاگرەکە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا ﴾ واتە: تاوەکو ئەو ئاسنەکەڵەکە بووە کە وەک ئاگری لێبێت لەبەر توندی گەرمیەکەی ﴿ قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴾واتە (ئادەی مسی تواوەم بۆ بێنن تاکو بیکەم بەسەریدا)، بۆ ئەوەی مسەتواوەکە لەگەڵ ئاسنە گەرمەکە بەیەکتر بنووسێن، وەک و شاخێکی پتەوی لێدێت، بۆیە یەئجوج و مەئجوج ناتوانن بەسەر شاخەکەیان بەربەستەکە بکەون، وەناشتوانن هیچ کونێک لە بەربەستەکە بکەنەوە لەبەر توندو تۆڵی بەربەستەکە. وە بەهۆی ئەو بەربەستە توندو ئەستوورەوە ذی القرنین ڕێگای لەسەر یەئجوج و مەئجوج داخست.



وێنە بەربەستێکی نزیك لەوەسفی بەربەستەکەی ذو القرنین، کەوا ذو القرنین دروستی کردووە

## یەئجوج و مەئجوج کێن؟

- دەڵێن : یەئجوج و مەئجوج : دوو ناوی ئەعجەمین وەک طالووت جالووت.
- وە دەڵێن : یەئجوج و مەئجوج ماناکەی هەر لەئاخاوتنەکەیان وەرگیراوە، بەمانای گەرمایی زۆر، ئەگەر گڕی سەند، ئەوانە ئوممەتێکی پیسن هەموو شتێک دەسوتێنن و وێرانی دەکەن لەسەر زەویدا.
- وە دەڵێن : لەئاوی سوێر وەرگیراوە کەئەویش زۆر سوێر بێت.
- وەدەشڵێن : لەسوور بوونەوە هاتووە، ئەویش لەبەر زۆر توندی ڕاکردن و غارداندا.

## ئایینی یەئجوج و مەئجوج چییە؟ وەئایا پەیامی پێغەمبەر محمد درودی خوای لەسەر بێت پێیان گەیشتووە؟

### یەئجوج و مەئجوج لەنەوەی ئادەمن..

الحافظ حجر وا دادەنێت کە: ئەوان دوو هۆزن لەنەوەکانی (یافث کوڕی نوح) کەلەکتێبی (فتح الباری لابن حجر) ١٠٦/١٣ باسکراوە.

ئەو دوو هۆزە لەنەوەکانی ئادەم و حەوان ئەمەش بەڵگەی لەسەرە لەوەی کە لە عمران کوڕی حصین دا هاتووە رەزای خوای لەسەر بێت لەگەڵ هەندێک لەسەحابەکانی لەڕێگادا دەرۆیشتن و لەکاتێکدا لەنێوان سەحابەکان جیابووەوەو بەدەنگی بەرز ئەو دوو ئایەتەی خوێند ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ٢ ﴾ الحج / ١-٢

**واتە/ (( ئەی خەڵکینە لەپەروەردگارتان بترسن و خۆتان لەخەشمی بپارێزن چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاول بوونی بوونەوەر کارەساتێکی زۆر گەورەیەو رووداوێکی سامناکە (١) لەو رۆژەدا کەکارەساتەکە دەبینن هەموو**

شیردەرێک لەشیرەخۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەموو سکپڕو دووگیانێکیش کۆرپەلەکەی دادەنێت، خەڵکی دەبینێت وەکو سەرخۆشن، لە ڕاستیدا سەرخۆشیش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکەو سەری لێ شێواندوون (٢))





وێنەیەکی ژمارەکە (نیشانە) کەوا لەسەر لایەکی گیان لەبەرێك دیارە

تاکو گەیشتە کۆتایی ئایەتەکان، کاتێک سەحابەکان گوێیان لەمەبوو بەپەلەچوون بۆ لای و زانیان دەیەوێت شتێک بڵێت ئینجا سەحابەکان لێی کۆبوونەوەو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (أتدرون أي يوم ذاك ؟ ذاك يوم ينادى آدم فيناديه ربه تبارك وتعالى يا آدم ابعث بعثاً الى النار فيقول : يا رب وما بعث النار؟ قال : من كل ألف تسع مائة وتسعة وتسعين إلى النار وواحد إلى الجنة ، قال عمران: فأبلس أصحابه: حتى ما أوضحوا بضاحكة، فلما رأى ذلك قال «أعملوا وأبشروا، فوالذي نفس محمد بيده إنكم لَمَعَ خليقتين ما كانتا مع شيء قط إلا كثرناه، يأجوج ومأجوج ومن هلك من بني أدم وبني إبليس»، قال: فأسريَ عنهم، ثم قال : «أعملوا وأبشروا، فوالذي نفس محمد بيده ما أنتم في الناس إلا كالشامة في جنب البعير أو الرقمة في ذراع الدابة») **واتە:** (ئایا دەزانن ئەمە چ ڕۆژێکە؟ ئەو ڕۆژەیە خوای گەورە بانگی ئادەم دەکات ئەی ئادەم وەفدێک ڕەوانەبکە بۆ ناو ئاگر، ئادەم دەڵێت، ئەی پەروەردگارا وەفدی ئاگر چۆنە و چەندە؟ خودای گەورە دەفەرموێت، لەهەر هەزار کەس نۆسەدو نەوەدو نۆیان بۆ ناوئاگرە وە یەک کەس بۆ بەهەشتە) جا عمران ووتی سەحابەکانی پێغەمبەر دروودی

**خـوای لـەسـەر بێت هـەموویـان بێ دەنـگ بـوون لـەبـەر ئـەو هـەواڵـە کت وپڕەو ناخۆشە، هەتاکو وای کرد پێبکەنن، کاتێک ئەمەی بینی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: کاری چاکە بکەن و موژدەتان لێبێت، سوێند بەو کەسەی گیانی (محمد)ی بەدەستە ئێوە دوو میللەتتان تێدایە کەوا لەسەر هیچ پرۆگرام و شتێک نین تەنها خەریکی زۆر بوونی خۆیان بوون، کەئەوانیش یەئجوج و مەئجوجن جا لەوان لایداو رۆیشت و فەمووی موژدەتان لێبێت، سوێند بەوکەسەی گیانی (محمد)ی بەدەستە ئێوە هیچ نین لەچاو ئەوان وەک خاڵێکی رەش وان لەتەنیشت ی ووشترێک یان بازنەیەکی بچووک لەقۆڵی گیانلەبەرێک لەبەر زۆری ژمارەی ئەوان )** ئەحمەدو ترمذی ریوایەتیان کردووە.

## زۆری ژمارەیان

لەعەبدوللای کوڕی عەمرو رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت **(إن يأجوج و مأجوج من ولد آدم، ولو أرسلوا لأفسدوا على الناس معايشهم، ولن يموت منهم رجل إلا ترك من ذريته ألفاً فصاعداً، وإن من ورائهم ثلاث أمم، تاول وتاريس ومسك)**

**واتە: (یەئجوج و مەئجوج لەنەوەی ئادەمن، وە ئەگەر ئەمانە بنێردرێن بۆ ناوخەڵک ئەوا ژیان گوزەرانیان لێ تێک دەدەن، وەلەوانە یەک پیاویش نامرێت تاوەکو لەدوای خۆیان هەریەکە هەزار نەوە بەجێ نەهێڵن، وە لەدوای خۆیان سێ ئوممەت پەیدا دەبن، تاول و تاریس و مسک)** تەبەرانی ریوایەتی کردووە

**لەعەبدوللای کوڕی عەمرو** رەزای خوای لێبێت دەڵێت : **(خودای عزوجل مەخلووقات و دروستکراوی خۆی دابەش کردووە بۆ (دە)بەش، جا (نۆ)بەشی کردۆتە فریشتەو (یەک) بەشیش بۆ دروستکراوەکانی دیکەو، فریشتەکانیشی کردۆتە (دە) بەش بەڵام ئەم فریشتانە بەشەووبەرۆژ تەسبیحات دەکەن و، بەشێکیش بۆ ناردنی پەیامەکانیەتی و، مەخلووقاتەکانیشی کردۆتە (دە) بەش، لەمانە (نۆ)بەشی کردۆتە جنۆکە، وە (یەک) بەشیشی کردۆتە نەوەی ئادەم، وە نەوەی ئادەمیشی کردۆتە (دە) بەش، لەمانە (نۆ) بەشی کردۆتە یەئجوج و مەئجوج، وەبەشەکەی دیکەشی کردۆتە خەڵکانی دیکە)** حاکم ریوایەتی کردووە

ئەم فەرموودەیە تەنها قەولی عەبدوللای کوڕی عەمرو عاصە رەزی خوای لەسەر بێت وە ئەم حەدیسە بەرزنەکراوەتەوە لەلایەن پێغەمبەر ﷺ، وە حوکمی بەرزکردنەوەشی نیە، چونکە زانراوەکەوا گەڵێ جار لەلایەن ئیسرائیلیەکانەوە حەدیسەکەی وەردەگیرێ و قسەی خۆیانیش دەخەنە ناو حەدیسەکە، سەبارەت بەحەدیسەکەی سەرەوە نووسەر دەڵێت: (بەڵام) من دڵنیام ئەو قەولە هی خۆیەتی.

## سیفەت و تایبەتمەندێتی دروست بوونیان

لەخالیدی کوڕی عبدوللای کوڕی حرملە ئەویش لەپووریەوە دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ ووتاری دەدا لەکاتێکدا سەری پەنجەی بەستابوو لەبەر ئەوەی دووپشک پێوەی دابوو جا فەرمووی: (إنكم تقولون لا عدو!، وإنكم لن تزالوا تقاتلون حتى يأتي يأجوج ومأجوج، عراض الوجوه، صغاراً العيون، صهبُ الشعاف، ومن كل حدب ينسلون، كان و جوههم المجان المطرقة) **واتە: ( ئێوە دەڵێن دووژمنمان نیە! و ئێوە بەردەوام شەڕتانە لەگەڵ دوژمندا تاوەکو یەئجوج و مەئجوج دێن، کەدەم و چاو پانن، چاویان بچووکە پرچیان لەسەریان خڕ دەکەنەوە وەلەسەر هەموو بەرزایی و گردۆلکەیەک دێنە خوارەوە، دەم و چاویان هەر دەڵێی قەڵغانەو موویان کەمە))** ئەحمەدو تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە



قەلغان
بریتیە لەو شتەی کەوا جەنگاوەر لەدەستی دەگرێ بۆ خۆپاراستن لەلێدانی شیرو تیر

((صهبُ الشعاف)) واتە ڕەنگی موویان ڕەشەو سووریشی تێدایە

((كان و جوههم المجان المطرقة)) المجن : واتە: قەلغان، دەم و چاویان بەقەڵغان دەچێت، : وەک و پێستەیە، لەبەر زۆری گۆشتی دەم و چاویان.

((ومن كل حدب ينسلون)) واتە : لەهەموو شوێنە بەرزەکان دەردەچن و بەخێرایی لەزەوی بڵاو دەبنەوە .

## چۆن بەربەستەکە کون دەکەن؟

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کەوا یەئجوج و مەئجوج دوو هۆزن هەموو جۆرە فەسادی و خراپەکاریەکیان پێیە، تاوەکو ذو القرنين بەربەستەکەی دروستکرد، وە ئەم بەربەستە بووە ڕێگریەک لەنێوان ئەوان و نێوان خەڵکەکەتی تر، ئەوانە بێگومان لەناو بەربەستەکانیان خواردن و خواردنەوەیان لایە، وە ئەوانە ژیان و گوزەرانێکی تایبەتیان هەیە، تاکو ئێستاش یەئجوج و مەئجوج کۆشش دەکەن، لەپێناوی تێکدانی ئەو بەربەستە، ئەوانە هەردەم لەهەوڵی هەڵکۆلینی بەربەستەکەدان و کۆشش دەکەن.

لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ لەبارەی بەربەستەکە دەفەرموویێت (ثم يحفرونه كل يوم حتى إذا كادوا يخرقونه ، قال الذي عليهم : ارجعوا فستخرقونه غدا « ، قال : « فيعيده الله عز وجل كأشد ما كان ، حتى إذا بلغوا مدتهم وأراد الله تعالى قال الذي عليهم : ارجعوا فستخرقونه غدا إن شاء الله تعالى واستثنى « ، قال : « فيرجعون وهو كهيئته حين تركوه ، فيخرقونه ويخرجون على الناس ، فيستقون المياه ويفر الناس منهم ، فيرمون سهامهم في السماء فترجع مخضبة بالدماء) **واتە: ( هەموو ڕۆژێ یەئجوج و مەئجوج ئەم بەربەستە هەڵ دەکۆڵن تاوای لێدێت زۆری نامێنێت کونی بکەن جا گەورەکەیان پێیان دەڵێن: بگەڕێنەوە بەیانی کونی دەکەین، جا خوای گەورە بۆ بەیانی لەجاران توندتری دەکاتەوە تاکو ئەو ڕۆژەی کاتی دیاری کراوی دێت و خوای گەورە وویستی لەسەر دەبێت کەبیانئێرێ بۆ ناوخەڵک جاگەورەکەیان پێیان دەڵێت: بگەڕێنەوە انشاء الله بەیانی کونی دەکەین دەفەرموویێت : جا دەگەڕێنەوە، دەبینن وەک و خۆی ماوە کە بەجێیان هێشتبوو، ئینجا هەڵی دەکۆڵن، و کونی دەکەن و بۆ نێو خەڵک دەردەچن و ئاوەکان دەخۆنەوەو، خەڵک لەبەریان ڕادەکات و تیرەکانیان دەهاوێژن بۆ ئاسمان بەخوێنی سوور دەگەڕێنەوە)** ئەحمەد و ترمذی ریوایەتی کردووە .

## لەحەدیسەکەدا سێ سوود هەیە:

- **یەکەم** : خودای گەورە لێیان قەدەغە دەکات کەوا شەو ڕۆژ بەردەوام بن بۆ هەڵ کۆڵینی بەربەستەکە، جا ئەگەر ئەو کارەیان کرد لەوانەیە کونی بکەن.
- **دووەم**: خودای گەورە لێیان قەدەغە کردووە کەوا هەوڵبدەن بەسەر بەربەستەکە بکەون بەپەیژە یان هەر ئامێرێک، خودای گەورە ئەو زانست و ئیلهامەیان نەداوەتێ و لەوانەشە هەوڵیان دابێت بەڵام نەیان توانیوە سەرکەونە سەر بەربەستەکە.
- **سێیەم** : ئەم قەولە: انشاء الله سەریان ناخات تاوەکو کاتی دیاری کراوەکە دێت و قیامەت نزیک دەبێتەوە.
- وە لەحەدیسەکەدا هاتووە : لەناو ئەواندا تێیان دایە شارەزایی لەپیشەسازی هەیە و، هەیە فەرمانڕەوایەو، هەیە دەسەڵاتدارەو، هەشیانە ملکەچی سەرووی خۆیان دەکات، وە هەشیانە خودای گەورە دەناسێت و دڵی جێگیر دەبێت، بەهێزو توانای و ویست و فەرمانی خودای گەورە .
- ڕەنگە ووشەی – انشاء الله – لەسەر زمانی ئەو دەسەڵاتدارە بێت و بەبێ ئەوەی ماناکەی بزانێت، ئینجا نیەت و مەبەستی دێتە دی بەبەرەکەتی خودای مەزن و دلۆڤان.

## ئەو دەقانەی هاتوون لەبارەی یەئجوج و مەئجوج

*ئایەتەکان*

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ ﴾
﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَـٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا ﴿٩٨﴾ ۞ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِى بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَجَمَعْنَـٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ ﴾ الكهف: ٨٣ - ٩٩

واتە/ (( واتە : دەربارەی (ذو القرنين)یش پرسارت لێ دەکەن، بڵێ گۆشەیەک لەبەسەرهاتی ئەوتان بۆ باس دەکەم (٨٣) ئیمە تواناو دەسەلاتمان لەزەویدا پێ بەخشیووە بۆ هەر شتێکی پێویستی ئەو سەردەمە هۆکارەکەیمان بۆ ڕەخساندبوو (٩٤) ئەویش سوودی تەواوی لەهۆکارەکان وەردەگرت (٨٥) (خۆی و لەشکرەکەی) کەوتەڕێ هەتا کاتێک گەیشتە ناوچەکانی خۆرئاوا، ڕۆژئاوادەبێت، لەو ناوەدا ڕێی کەوتە لەقەومێکی (خواناس و بێ دین) ئێمەش پێمان ووت، ئەی ذو القرنين یان ئەوەیە بەسزا لەناویان دەبەیت، یان چاکەیان لەگەڵ دەکەیت (٩٦) ذو القرنين ووتی: بێ گومان ئەوەی ستەمکار بێت ئێمە سزای دەدەین، لەوەودوایش کە گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری سزایەکی زۆر سەخت و گرانی دەدات (٨٧) بەڵام ئەوەی ئێمە ئیمان و باوەڕ بهێنێت و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئەوا پاداشتی چاک بۆ ئەوە، لەمەو دوا قسەی خۆش و فەرمانی ئاسان و کاری سووکی





دەدەین بەسەردا (٨٨) لەوەوە دوا کەڵکی تەواوی لەهۆکارەکان وەرگرت و بەشوێنیاندا گەڕا (٨٩) هەتا کاتێک گەیشتە ناوچەی خۆرهەڵاتی (دوور)، بینی ڕۆژ هەڵدێت لەسەر قەومێک کەپەناگەیەکیان نیە تا لەتینی خۆیان بپارێزن (٩٠) هەر بەو شێوەیە ڕەفتاری کرد، کە لەگەڵ خەڵکی خۆرئاوادا کردی، بێگومان ئێمە بەتەواوی ئاگاداربووین لەوکارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدا (٩١) لەوەو دوا هەر دەستبەرداری هۆکارەکان نەبوو، بەشوێنیاندا گەڕا (٩٢) هەتا کاتێک گەیشتە نێوان هەردوو بەربەستەکە، کەلەنێوانیاندا قەومێک هەبوو کەلەهیچ قسەیەک تێ نەدەگەیشتن (٩٣) کاتێک دەسەڵاتی (ذو القرنين ) یان بینی و تیان: ئەی ذو القرنين بەڕاستی یەئجوج و مەئجوج تۆوی خراپەو تاوان دەچێنن لەزەویدا، ئایا خەرجیەک و پارەیەکت بۆ کۆبکەینەوە تا بەربەستێک لەنێوان ئێمەو ئەواندا دروست بکەیت ؟ (٩٤) ذو القرنين ووتی : ئەو دەسەڵات و زانیاری و شتانەی پەروەردگارم پێی بەخشیووم چاکترە بۆ من (لەپارەو سامان) جا ئێوە بەهێزی بازوو یارمەتیم بدەن تا بەربەستێک لەنێوان ئێوەو ئەواندا دروست بکەم (٩٥) پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و (کەڵەکەی بکەن) تا ئەمبەرو ئەوبەری هەردوو کێوەکەی پڕ کرد، ئەوسا فەرمانیدا، تا بە (موشەدەمە) فوو بکەن لەو ئاگرەی لەژێریدا کرابۆوە، هەتا کاتێک هەمووی کرد بەئاگر، ئینجا ذو القرنين ووتی: ئادەی مسی تواوەم بۆ بێنن تا بیکەم بەسەریدا (٩٦) ئەوسا ذو القرنين ووتی: دروستکردنی ئەو بەربەستە ڕەحمەتێک بوو لەلایەن پەروەردگارمەوە، ئینجا کاتێک پەروەردگارم بڕیاری تێکدانی بدات، ووردو خاشی دەکات، بێگومان بەڵێنی پەروەردگارم حەقیقەت و ڕاستەقینەیە (٩٨) لەو ڕۆژە بەدواوە وازیان لێهێنان تاوەک شەپۆل بەناو یەکدابێن، یاخوود وازمان لێهێنان بۆ ئەو ڕۆژەی (کەبەربەستەکە دەشکێت و بەپەلە) وەکو لێشاو دێنە دەرەوە و شەپۆل دەدەن بەناو یەکدا، ئەوسا فوو دەکرێت بەکەڕەنادا بەو هۆیەوە هەر هەموو خەڵکی بەتەواوی کۆ دەکەینەوە (٩٩) )

- خودای عزوجل دەفەرموویت ﴿ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴾ واتە : لەقسەی ئەوانە تێناگەن تەنها ئەو کەسەی قەسەیان لەگەڵدا دەکات ئەگەر بەدەنگی بەرزو لەسەرە خۆو بەدەنگی گەورە.
- خودای گەورە دەفەرموویت ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الانبياء/ ٩٦ واتە : هەتا ئەو کاتەی بەربەستەکەی ذو القرنين لەسەر دوو تیرەی یەئجوج و مەئجوج دەکرێتەوە ئەوانە لەهەموو کون و کەلێنێکەوە بەڵیشاو پەیدا دەبن و زۆر دەبن.

## حەدیسەکان :

- لەدایکی ئیماندارانەوە زینەبی کچی جەحش رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ رۆژێک هاتە ژوورەکەی و ترس دایگرتبوو فەرمووی (لا إله الا الله، ويل للعرب من شر قد اقترب! فُتح اليوم من ردم يأجوج وماجوج مثل هذه، وحلق بإصبعه الإبهام والتي فليها فقالت : يارسول الله، انهلك وفينا الصالحون؟ قال: نعم إذا كثر الخبث؟ ) **واتە: هاوار بۆ عەرەب لە شەرێک کەنزیک بۆتەوە! ئەمرۆ یەئجوج و مەئجوج کونێکیان لەبەربەستەکە کردۆتەوە بەقەدەر ئەوەندە) بازنەیەکی بەپەنجە گەورەو شایەدمانی دروست کرد، جا زەینەبی کچی جەحش خێزانی پێغەمبەر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئێمە بەهیلاک دەچین لەکاتێکدا پیاوی چاکمان تێدایە؟ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی ( بەڵێ،ئەگەر خراپەکاران زۆر بوون)** متفق عليه

- ئەبوو هورەیرە رەزای خوای لێبێت دەڵێت ( لەبەر بەرستەکەی یەئجوج و مەئجوج بەقەدەر ئەوەندە کونێک کراوەتەوە، بازنەیەکی بەپەنجەکانی دروست کرد) موسلیم ریوایەتی کردووە.

- لەئەبی سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (يقول الله تعالى : يا آدم ، فيقول : لبيك وسعديك ، والخير في يديك ، فيقول : أخرج بعث النار ، قال : وما بعث النار ؟ ، قال : من كل ألف تسع مائة وتسعة وتسعين ، فعنده يشيب الصغير ، وتضع كل ذات حمل حملها ، وترى الناس سكارى وما هم بسكارى ، ولكن عذاب الله شديد « قالوا : يا رسول الله ، وأينا ذلك الواحد ؟ قال : أبشروا ، فإن منكم رجلا ومن يأجوج ومأجوج ألفا . ثم قال : والذي نفسي بيده، إني أرجو أن تكونوا ربع أهل الجنة فكبرنا ، فقال : أرجو أن تكونوا ثلث أهل

الجنة فكبرنا ، فقال : أرجو أن تكونوا نصف أهل الجنة فكبرنا ، فقال : ما أنتم في الناس إلا كالشعرة السوداء في جلد ثور أبيض ، أو كشعرة بيضاء في جلد ثور أسود)

واتە: (خوای گەورە دەفەرموویت: ئەی ئادەم، ئەویش دەڵێت: گوێڕایەڵم و لەخزمەتدام و چاکەش لەدەستی تۆ دایە ئەی خودای میهرەبان، خوای گەورە دەفەرموێت : نێردراوی ئاگربێنە، ئادەم دەڵێت: نێردراوی ئاگر کێن؟ خوای گەورە دەفەرمووێت : لەهەمو هەزار کەسێک نۆسەدو نەوەدو نۆکەس بنێرە، ئالەو کاتەدا منداڵی بچووک پیر دەبێت، هەموو دووگیانێک سکەکەی دادەنێ، خەڵکی دەبنیی هەموو سەرخۆشن بەڵام سەرخۆش نین، بەڵکو سزای خوا قورس و سەختە) جا ووتیان ئەی پێغەمبەری خودا، جا کامەمان ئەوتاکە کەسەین؟ پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی ( مژدەتان لێبێت لەئێوە پیاوێک و لەیەئجوج و مەئجوجیش هەزار کەس پاشان فەرمووی : (( سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئومێدەوارم ئێوە چواریەکی بەهەشت بن)) ئێمەش سوپاسگوزای خوابووین (الله اکبر) مان کرد، جا پێغەمبەر درووردی خوای لەسەر بێت فەرمووی (من خوازیارم ئێوە سێیەکی بەهەشت بن) ئێمەش سوپاسگوزاری خوا بووین (الله اکبر) مان کرد، دیسان پێغەمبەر درووردی خوای لەسەر بێت فەرمووی (خوازیارم ئێوە نیوەی ئەهلی بەهشت بن) دیسان سوپاسگوزاری خوا بووین و (الله اکبر) مان کرد بۆ جاری سێیەم پێغەمبەر درووردی خوای لەسەر بێت فەرمووی (نموونەی ئێوە لەناو خەڵکیدا وەک موویەکی ڕەش وان لەپێستی گایەکی سپی، یاخود وەک موویەکی سپی وان لەپێستی گایەکی ڕەشدا) متفق علیه

- لەعمرانی کوڕی حصین ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێ : پێغەمبەر ﷺ لەهەندێک سەفەرەکانیدا لەنێو هاوەڵەکانیدا دەسوڕایەوە بەدەنگی بەرز ئەم دوو ئایەتی دەخوێندەوە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ۝١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ۝٢﴾ واتە ( ئەی خەڵکینە لەپەروەردگارتان بترسن و خۆتان لەخەشمی بپارێزن چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاول بوونی بوونەوەر کارەساتێکی زۆر گەورەیەو ڕووداوێکی سامناکە (١) لەو ڕۆژەدا کەکارەساتەکە دەبینن هەموو شیردەرێک لەشیرەخۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەموو سکپڕو دووگیانێکیش کۆرپەلەکەی

**دادەنێت، خەڵکی دەبینێت وەکو سەرخۆشن، لە ڕاستیدا سەرخۆشیش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکەو سەری لێ شێواندوون (٢).**

- پێغەمبەر ﷺ لەدرێژەی فەرموودەکانی لەبارەی نیشانەکانی رۆژی دوایی و دابەزینی عیسا (علیه السلام) وەحوکم کردن لەنێو خەڵکدا دەفەرمووێت **(فبينما هو كذلك إذ أوحى الله الى عيسى ، أني قد أخرجت عباداً لي، لا يدان لأحد بقتالهم فحرّر عبادي إلى الطور)** **واتە: (لەو کاتەی خودای گەورە، وەحی دەنێرێت بۆ عیسا علیه السلام پێی دەفەرموێت: من جۆرە بەندەیەکم (کەیەئجوج و مەئجوجن) دەرخستوون، کەکەس توانای شەڕ کردنی نیە بەرامبەر ئەوان، لەبەر ئەوە بەندەموسڵمانەکان ببە کێوی تور لەوێ کۆیان بکەوەوەو بیان شارەوە)**



چیای تور لەفەلەستین کە ٨٢٦ مەتر بەرزە لەسەر رووی زەوی



وێنەیەك لەسەر کێوی تور شاری قودس دەردەکەوێت

- لەنەواس کوڕی سەمعان رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت **(ويبعث الله يأجوج ومأجوج ، وهم من كل حدب ينسلون ، فيمر أوائلهم على بحيرة طبرية فيشربون ما فيها ، ويمر آخرهم فيقولون : لقد كان بهذه مرة ماء )**
**واتە: (ئینجا خودای گەورە یەئجوج و مەئجوج دەنێرێت، وە ئەوانە لەهەموو بەرزایی و کون و کەلەبەرێکەوە بەلێشاو بڵاو دەبنەوە، جا سەرەتایەکەیان بەلای ئاوی تەبەریە تێدەپەڕێت و، ئاوەکەی دەخۆنەوە، کۆتاییەکەیان کەدەگاتە سەر دەریاچەی تەبەریە دەڵێن، پێشتر لێرە ئاو هەبووە)** موسلیم ریوایەتی کردووە

**دەریاچەی طبریە:** هەندێ جار بەدەریای جەلیل ناو دەبرێت یاخود دەریاچەی جلیل، کەوا دەریاچەیەکی بچووکە، دەکەوێتە باکووری فەلەستینی داگیرکراو، کە ڕووباری ئوردنی لێ دەڕژێت، وە بەردەوام ئەم ڕووبارە لەبەری دەڕوات لەناوەڕاستی چاڵایی ئوردن، قەبارەکەی : درێژی دەریاچەی تەبەریە نزیکەی (٢٣) کیلۆمەترە، وە فراوانترینی پانیەکەی (١٣) کیلۆمەترە. وەقووڵاییەکەی لە (٤٤) مەتر تێپەڕناکات، (٢١٠) مەتریش لەسەر ڕووی زەوی نزمترە.





دەرچوونی ڕووباری ئوردن لەدەریاچەی


دەریاچەی تەبەریە

پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت (ثم يسيرون حتى ينتهوا إلى جبل بيت المقدس فيقولون : لقد قتلنا من في الأرض ، فهلم فلنقتل من في السماء ، فيرمون بنشابهم إلى السماء فيرد الله عليهم نشابهم محمرا دما ، ويحاصر عيسى ابن مريم وأصحابه حتى يكون رأس الثور يومئذ خيرا لأحدهم من مائة دينار لأحدكم اليوم ، فيرغب عيسى ابن مريم إلى الله وأصحابه « « ، « « فيرسل الله عليهم النغف في رقابهم فيصبحون فرسى موتى كموت نفس واحدة ، ويهبط عيسى وأصحابه فلا يجد موضع شبر إلا وقد ملأته زهمتهم ونتنهم ودماؤهم ، فيرغب عيسى إلى الله وأصحابه ، فيرسل الله عليهم طيرا كأعناق البخت ، فتحملهم فتطرحهم بالمهبل ويستوقد المسلمون من قسيهم ونشابهم وجعابهم سبع سنين ، ويرسل الله عليهم مطرا لا

يكن منه بيت وبر ولا مدر ، فيغسل الأرض فيتركها كالزلفة « « قال : « « ثم يقال للأرض أخرجي ثمرتك وردي بركتك فيومئذ تأكل العصابة الرمانة ، ويستظلون بقحفها ويبارك في الرسل حتى إن الفئام من الناس ليكتفون باللقحة من الإبل ، وإن القبيلة ليكتفون باللقحة من البقر ، وإن الفخذ ليكتفون باللقحة من الغنم فبينما هم كذلك إذ بعث الله ريحا فقبضت روح كل مؤمن ويبقى سائر الناس يتهارجون كما تتهارج الحمر فعليهم تقوم الساعة )

**واتە:** (پاشان لەڕۆیشتن بەردەوام دەبن تاوەکو کۆتاییان دێت بۆلای چیای الخمر (الخمر: لەشاری (فتح)ە بەدارو درەخت داپۆشراوە ئەمەش چیای (بیت المقدس)ە (واتە فەلەستین)ە، ئینجا یەئجوج و مەئجوج دەڵێن : ئەوا ئەوەی لەسەر زەوی بوو کوشتمان، بابڕۆین ئەوەی لەئاسمانیشدایە بیکوژین جا تیرەکانیان بۆ ئاسمان دەهاوێژن، لەوکاتە تیرەکانیان بەخوێن بۆ لایان دەگەڕێتەوە، جا عیسای پێغەمبەرو هاوڕێکانی گەمارۆ دەدرێن، تاوای لێدێت یەک سەر گا باشترە بۆ یەکێکیان لەسەد دینار لەم ڕۆژەدا، ئینجا عیسای پێغەمبەرو هاوڕێکانی، داوای یارمەتی لەخودای گەورە دەکەن، خودای گەورەش کرمێک دەنێرێت بۆ سەرملیان هەرهەموویان بەجارێک وەک مردنی یەک دەمرن، پاشان عیسای پێغەمبەر هاوڕێکانی دادەبەزنەوە سەرزەوی، کە سەیردەکەن یەک بستەخاک نەماوە کەبە چەوری و لاشەی بۆ گەنیان پڕ نەبووبێت، لەو کاتە عیسای پێغەمبەر هاوڕێکانی داوای یارمەتی لەخودای دلۆڤان دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە، خودای گەورەش جۆرە باڵندەیەک دەنێرێت وەک ملی حوشتر دەرێژن، هەڵیان دەگرێت و فڕێیان دەدات بۆ ئەو شوێنەی خۆی دەیەوێت، پاشان خوای گەورە بارانێک دەنێرێت کەهیچ خانوویەک کەلەبەردو مووی ئاژەڵ دروست کرابێت خۆی لەبەر ئەو بارانە ناگرێت، ئیتر بەجۆرێک زەوی دەشواتەوە هەتا وەک ئاوێنەی لێدێت، پاشان خودای گەورەو میهرەبان بەزەوی دەڵێت، بەرووبوومەکەت بهێنە بەرهەم و بەرەکەتەکەت دەربهێنە، لەو ڕۆژەدا کۆمەڵێک کەس لەیەک هەنار تێر دەخۆن، وەشیریش بەرەکەتی دەکەوێتێ و زۆر دەبێت، هەتاوەکو شیری ووشترێکی ئاوس بەشی کۆمەڵێ خەڵکی زۆر دەکات، و شیری مانگایەکی ئاوس بەشی یەک هۆز لەخەڵک دەکات، وەشیری مەڕێک بەشی کۆمەڵێک لەخزم و ناسیاو دەکات، لەکاتێکدا ئەوان ئاوادەبن تاوەکو خودای گەورە بایەکی فێنک و خۆش دەنێرێت، دەدات بەژێر باڵیانداو گیانی هەموو ئیماندارو هەموو موسلمانێک دەکێشێت، تەنها



خراپە کاران دەمێنێتەوە، بەبێ شەرم پیاوان لەگەڵ ئافرەتان جووت دەبن وەکو گوێ درێژ لەپێش چاوی خەڵکیدا، جاقیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەستێت)) موسلیم ڕیوایەتی کردووە

لــەڕێــوایــەتێــکی دیکــەدا: ﷺ دەفەرمووێت (فیرغب عیسى إلى الله وأصحابه قال، فيرسل الله عليهم طيرا كأعناق البخت ، فتحملهم فتطرحهم بالمهبل ويستوقد المسلمون من قسيهم ونشابهم وجعابهم سبع سنين) واتە: (...ئینجا عیسای پێغەمبەرو هاوڕێکانی داوای یارمەتی و پاڕانەوە لەخودای گەورە دەکەن، دەڵێن جا خودای گەورەو دلۆڤان جۆرە باڵندەیەک دەنێرێت وەک ملی ووشتر وان، لاشە بۆ گەنەکانیان هەڵدەگرێت دەیانباتە ناو چاڵاییەکی قووڵ، ئینجا مووسڵمانەکان بەتیرو کەوان و کۆڵەپشتەکانیانەوە ئەوان دەیانسووتێنن کەحەوت ساڵ بەردەوام دەبێت) ترمذی ڕیوایەتی کردووە

- لەعەبدوللای کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت: (کاتێک شەوڕێیی بە پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت کرا، گەیشتەئیبراهیم و موسا و عیسا - سەلامی خوایان لەسەر بێت - باسی ڕۆژی دواییان دەکرد، فەرمووی: پرسیارەکەیان لەعیسا کرد، باسی کوژرانی دەجالی کرد و فەرمووی: خەڵکەکە دەگەڕێنەوە ووڵاتی خۆیان جا یەئجوج و مەئجوج پێشوازیان لێ دەکەن و لەهەموو بەرزایی و کون و کەلەبەرێکەوە بڵاو دەبنەوە، بەلای هیچ ئاوێکدا تێناپەڕن ئیلا هەمووی دەخۆنەوەو بەلای هیچ شتێکدا ناڕۆن ئیلا پیس و خراپی دەکەن، دێنە لای من داوام لێدەکەن لەخودا بپاڕێمەوە، جا خودای گەورە هەموویان دەمرێنێت و زەوی بۆ گەن دەبێت لەبەر بۆنی لاشەکانیان، دیسان دێنەلای من، جا لەخودا دەپاڕێمەوەو داوای یارمەتی لێ دەکەم، لەو کاتەدا خودای گەورە لەئاسمانەوە باران دەنێرێت لاشەکانیان ئاو دەیبات و فڕێیان دەداتە ناو دەریاوە) حاکم ڕیوایەتی کردووە.

- لەئەبوهورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت لەدرێژەی باسەکەی دا لەبارەی یەئجوج و مەئجوج دەفەرمووێت ( یەئجوج و مەئجوج لەسەر خەڵکی دەردەچن و ئاوەکان دەخۆنەوە، خەڵکی لەبەریان ڕادەکات تیرەکانیان بەرەو ئاسمان دەهاوێژن، بەخوێن دەگەڕێتەوە لایان، جادەڵێن : بەسەر خەڵکی زەویدا سەرکەوتین و، زاڵبووین بەسەر ئەهلی ئاسماندا، لەوکاتەدا خودای گەورە کرمێک دەنێرێتە سەرملیان، لەناویان دەبات، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، گیانلبەرەکانی سەر زەوی بەگۆشت و خوێنی ئەوان زۆر قەڵەو دەبن) ترمذی ڕیوایەتی کردووە

## لەوحەدیسە لاوازانەی کە هاتووە لەوانە:

لەبارەی یەئجوج و مەئجوج ئایات و حەدیسی زۆر هاتوون، وەلەنێو خەڵکدا هەندێک حەدیسی زەعیف بڵاون، لێرەدا هەندێک لەو حەدیسە زەعیفانە باس دەکەین:
لەحوذەیفەی کوڕی یەمان ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت : پرسیاری یەئجوج و مەئجوجم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمووی (سألت رسول الله ﷺ ، عن يأجوج ومأجوج ؟ قال : « يأجوج أمة ، ومأجوج أمة ، كل أمة أربعمائة ألف أمة ، لا يموت الرجل حتى ينظر إلى ألف ذكر بين يديه من صلبه ، كل واحد قد حمل السلاح « قلت : يا رسول الله ، صفهم لنا ؟ قال : « هم ثلاثة أصناف : صنف منهم أمثال الأرز « قلت : وما الأرز ؟ قال : « شجر بالشام طول الشجرة عشرون ومائة ذراع في السماء « ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : « هؤلاء الذين لا يقوم لهم حيل ولا حديد ، وصنف منهم يفترش بأذنه ، ويلتحف بالأخرى ، لا يمرون بفيل ولا وحش ولا جمل ولا خنزير إلا أكلوه ، ومن مات منهم أكلوه ، مقدمتهم بالشام ، وساقتهم بخراسان ، يشربون أنهار المشرق ، وبحيرة طبرية )
**واتە: ( ئەجوج ئوممەتێکە، و مەئجوجیش ئوممەتێکە، هەر ئوممەتێک لەوانە چوار سەد هەزار ئوممەتن، هیچ پیاوێک لەوانە نامرێت تاوەکو سەیری هەزار نێرینە لەنەوەی خۆی دەکات توانای چەک هەڵگرتنیان دەبێت ) ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا وەسفی ئەوانەمان بۆ بکە، فەرمووی (ئەوانە سێ پۆلن، پۆلێک لەوانە وەک و ئورز وانە) ووتم ئورز چییە؟ فەرمووی درەختێکە لەشام، درێژی ئەو درەختە سەدو بیست باڵە بۆ ئاسمان) ئینجا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی (ئەوانە پێویستیان بەهێزی بازوو و ئاسن نیە، وە پۆلێکیشیان لەوانە گوێ یەکیان ڕادەخەن و گوێیەکەی تریان بەخۆیان دادەن، بەلای هیچ فیل و دڕندەو وشترو بەرازێکدا ناڕۆن ئیلا دەیخۆن، وە هەر یەکێک لەوان مرد دەیخۆن، پێشەکیەکەیان لەشامە، کۆتاییەکەیان لەخوراسانە، ڕووبارەکانی ڕۆژ هەڵات هەموو دەیخۆن لەگەڵ دەریاچەی تەبەریە)** طەبرانی ریوایەتی کردووە

## لەناو چوونیان

یەئجوج و مەئجوج پیاوو ئافرەت و منداڵیان لەزەویدا خراپەکاری و فەسادی دەکەن وەخەڵک دەکوژن و قەدەغە کراوەکان ئەتک دەکەن، لەخۆبایی و داوێن پیسن، تاوەکو کوفرەکەیان وای لێدێت کەوا تیرەکانیان بەرەو ئاسمان دەهاوێژن بۆ ئەوەی زاڵبن بەسەر ئەوانەی ئاسماندا، وەک چۆن زاڵبوون بەسەر ئەوانەی لەسەر زەویدان، هیچ کەسێک لێیان دەرباز نابێت تەنها ئەوانەی لەشوێنە زۆر قایمەکان دان، یاخود ئەوانەی خۆیان شاردۆتەوە.
لەوانەی لەشوێنە قایمەکان دان عیسا علیه السلام و ئیماندارەکانی لەگەڵیدان، کەوا تووشی

برسیەتی و پێدوایستی و تێکۆشان بۆ شتی گەورە دەبنەوە.
لەو کاتەدا عیسا علیه السلام و هاوڕێکانی پەنا دەبەنەبەر پەروەردگاریان کەوا لەحەدیسەکانی پێشوودا باسکرا، بۆیە خودای گەورە کرمێک ڕەوانەدەکات بۆ سەرملی یەئجوج و مەئجوج، جا هەموویان دەمرن، پاشان خودای گەورە بارانێک دەنێرێت و زەوی دەشواتەوە تاوەکو وەک ئاوێنەی ساف و لووسی لێدێت، پاشان خودای گەورە بەزەوی دەفەرموێت، بەروبوومەکەت بەرهەم بهێنەو بەرەکەتەکە بێتە دەرەوە.
لەئەبی سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت (تفتح يأجوج ومأجوج ، يخرجون على الناس كما قال الله تعالى: ﴿ مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴾، فيعيثون في الأرض ، وينحاز المسلمون إلى مدائنهم وحصونهم ، ويضمون إليهم مواشيهم ، ويشربون مياه الأرض حتى إن بعضهم ليمر بالنهر فيشربون ما فيه حتى يتركوه يابسا ، حتى إن من بعدهم ليمر بذلك النهر فيقول : لقد كان هاهنا ماء مرة ، حتى إذا لم يبق من الناس أحد إلا أخذ في حصن أو مدينة ، قال قائلهم : هؤلاء أهل الأرض قد فرغنا منهم بقي أهل السماء ، قال : ثم يهز أحدهم حربته ، ثم يرمي بها إلى السماء ، فترجع مخضبة دما للبلاء والفتنة ، فبينما هم على ذلك بعث الله عليهم دودا في أعناقهم كالنغف ، فيخرج في أعناقهم فيصبحون موتى ، لا يسمع لهم حس ، فيقول المسلمون : ألا رجل يشري لنا بنفسه فينظر ما فعل هذا العدو ، قال : ثم يتجرد رجل منهم لذلك محتسبا بنفسه قد وطنها بنفسه على أنه مقتول ، فينزل فيجدهم موتى بعضهم على بعض ، فينادي : يا معشر المسلمين أبشروا ، فإن الله قد كفاكم عدوكم ، فيخرجون من مدائنهم وحصونهم ، ويسرحون مواشيهم فما يكون لها رعي إلا لحومهم ، فتشكر عنه كأحسن ما شكرت عن شيء من نبات أصابته قط. )
**واتە: (یەئجوج و مەئجوج بەربەستەکە دەکەنەوە، بەسەر خەڵکیدا دەرەکەون هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت (لەزەویدا بڵاو دەبنەوە)، جا موسلمانەکان پەنا دەبەنەبەر شوێنە قایمەکان و مزگەکان و مەڕو ماڵاتەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، ئینجا یەئجوج و مەئجوج ئاوەکانی سەرزەوی دەخۆنەوە هەتاکو هەندێکیان بەلای رووباردا تێپەڕ دەبن ئاوی تیا نامێنێت بیخۆنەوە، بەووشکی بەجێی دەهێڵن ئەوانەی لەدواوەیان کەبەلای رووبارەکەتێدەپەڕێت دەڵێت : ئا لێرەدا ئاو هەبوو، پاشان پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت (تاوەکو هیچ کەسێک نامێنێت تەنها ئەوانەی لەشوێنەقائمەکان خۆیان حەشارداوە، جا یەکێکیان دەڵێت – واتە لەناو یەئجوج و مەئجوج – ئا ئەمانە خەڵکی زەوین سەر کەوتین بەسەریاندا تەنها ئەهلی ئاسمان ماوە، پاشان یەکێک لەوان تیروکەوانەکەی دەهەژێنێت، پاشان تیرێک دەهاوێت بۆ ئاسمان و بەخوێنی سوور دەگەڕێتەوە، واتە ئەمە بەڵاو فیتنەیەکە لەلایەن**

**خودای گەورە بۆیان، کاتێک ئاوا دەمێننەوە خودای بەخشتندەی میهرەبان کرمێک دەنێرێت بۆ سەر گەردنیان وەک ملی حوشتر وایە، لەگەردنیان دەردەچێت، بەیەکجار هەموویان دەمرن و گوێت لەهیچ هەست و نەستێکی ئەوان نابێت، جا موسڵمانەکان دەڵێن: ئایا پیاوێک نیە گیانی خۆی فیدابکات بۆ ئێمە بچێت سەیربکات بزانێت ئەم دوژمنە چی دەکات، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت : پاشان پیاوێک لەموسلمانەکان جورئەت پەیدا دەکات و بەئاگاداریەوە سەیر دەکات دەبینێت ئەوەی تیرەکەی هاوێشتە ئاسمان کوژراوە، ئینجا دادەبەزێتە خوارەوە دەبینێت هەموو مردوون کەوتوونەتە سەریەکتر، لەوکاتەدا بانگ دەکات: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان مژدەتان لێبێت خودای گەورە ئێوەی ڕزگار لەدەست دوژمنەکەتان، جا موسلمانەکان لەمۆلگەو شوێنە قایمەکانیان دێنە دەرەوە، مەڕو ماڵاتەکانیان دەلەوەڕێنن، هیچ لەوەڕێک نیە بیخۆن تەنها گۆشتی مردووەکان نەبێت، مەڕو ماڵاتەکان بەخواردنی گۆشتەکانیان زۆر قەڵەو دەبن هیچ کاتێک بەڕووەک و گژوگیا ئەوەندە قەڵەو نەبوونە )** ئەحمەد ابن ماجە و حاکم ریوایەتیان کردووە

((تشکر)) واتە : قەڵەو دەبێت



لەریوایەتێکی دیکەدا لەعطیە العوفی ئەویش لەئەبی سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێبێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (فيهلكون من في الأرض إلا من تعلق بحصن، فلما فرغوا من أهل الأرض أقبل بعضهم على بعض، فقالوا : إنما بقي من في الحصون ومن في السماء فيرمون بسهامهم ، فخرت عليهم منغمرة دما ، فقالوا : قد استرحتم ممن في السماء ، وبقي من في الحصون ، فحاصروهم حتى اشتد عليهم الحصر والبلاء، فبينما هم كذلك إذ أرسل الله عليهم نغفا في أعناقهم ، فقصمت أعناقهم ، فمال بعضهم على بعض موتى ، فقال رجل منهم : قتلهم الله رب الكعبة . قال : إنما يفعلون هذا مخادعة فنخرج إليهم ، فيهلكونا ، كما أهلكوا إخواننا، فقال : افتحوا لي الباب . فقال أصحابه: لا نفتح فقال : دلوني بحبل ، فلما نزل وجدهم موتى) **واتە:**

**( ئەوەی لەسەر زەویە لەناوی دەبەن تەنها ئەو کەسانەی لەمۆلگە قایمەکان خۆیان حەشارداوە، کاتێک بەسەر ئەهلی زەویدا سەردەکەون هەندێک لەگەڵ هەندێکیان قسە دەکەن**

**دەڵێن: تەنها ئەوانە ماون کە لەمۆڵگە قایمەکانن وە ئەوانەی لەئاسمانن جاتیرەکانیان بۆ ئاسمان دەهاوێژن بەخوێن تیرەکە دەگەڕێتەوە، ئینجا دەڵێن ئەوا بەسەر ئەهلی ئاسمانیش زاڵبووین تەنها ئەوانە ماون کە لەناو مۆڵگە قایمەکاندان، جاموسلمانەکان گەمارۆ دەدەن تاوەکو تووشی برسیەتی و پێداویستی زۆر دەبن، لەکاتێکدا ئاوا دەمێننەوە، لەو کاتەدا خوای گەورە کرمێک دەنێرێت بۆ سەر گەردنیان، هەموویان بەسەر یەکتردا دەکەون و دەمرن، پیاوێک لەموسلمانەکان دەڵێن: خودای خاوەنی کەعبە هەموویانی کوشت موسلمانەکان وتیان: لەوانەیە بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئێمە وایان کردبێت، ئەگەر بچێتە لایان لەوانەیە لەناومان ببەن هەر وەک ئەوانیان لەناو برد، موسلمانەکە دەڵێت، دەرگاکەم بۆ بکەنەوە، بەهاوڕێکەیان دەڵێن: ناکەینەوە، دەڵێن : گوریسێکم بۆ بێنن، کاتێک دادەبەزێتە خوارەوە سەیر دەکات هەموویان مردوون)** احمد بن منیع ریوایەتی کردووە.

## لەدوای یەئجوج و مەئجوج شەڕو کوشتار نامێنێت

پاش ئەوەی خودای (عزوجل) یەئجوج و مەئجوج لەناو دەبات، لەئیماندارەکان زیاتر کەسێک نامێنێتەوە، بەرەکەت و خێرو خۆشی بڵاو دەبێتەوە، وەدڵ و دەروونەکانیان خاوێنە، وەجەنگ و شەڕو کوشتار بەهیچ جۆرێک نامێنێت.

لەسلمەی کچی نفیل ڕەزای خوالی لەسەر بێت دەڵێت ((لەکاتێکدا من لەلای پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دانیشتبووم پیاوێک هاتە لای و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو ئەسپی خۆیان واز لێهێناوە، وە چەکەکانیان داناوە و، هەندێک قەوم دەڵێن شەڕو کوشتار نەماوە، وە شەڕو جەنگ بار قورسی خۆیان داناوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((كذبوا، الآن جاء القتال وإنَّهُ لايزال مِن أمتـي أمّة يُقاتلون في سبيل الله لايضرّهم من خالفَهُم، يزيغُ الله قلوب قوم يرْزقهم منهم، يقاتلون حتى تقوم السّاعة، ولا تضع الحرب اوزارها حتى يخرجُ يأجوج ومأجوج)) **واتە: ((درۆیان کرد، ئێستا هاتنی شەڕو جەنگە، هێشتا لەئوممەتی من ئوممەتێک هەیە بەردەوام لەشەڕ کردن دان لەپێناوی خودا و ئەوەی لەدواوەیانە زەرەریان پێ ناگەیەنێت، خودای گەورە دڵی هەندێک قەوم دەگۆڕێت و ڕزق و ڕۆزی بەوان دەدات، شەر دەکەن تاکو قیامەت هەڵدەستێ، وە شەڕو کوشتار بارقورسی خۆی دانانێت تاوەکو یەئجوج و مەئجوج دەردەچێت))** نسائی و ئەحمەد و طبرانی ریوایەتیان کردووە.

## حەج کردن دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت پاش ئەئجوج و مەئجوج

لەئەبی سەعیدی خودری رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت ((لَيُحَجَّن البيت و لَيُعْتَمَرن بعد خروج يأجوج ومأجوج)) **واتە: (خەڵکی حەجی کەعبە دەکەن و عەمرەش دەکەن پاش دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج)** بوخاری ریوایەتی کردووە





## ئەو بەربەستەی کەوا ذو القرنین دروستی کردووە، لەسەر یەئجوج و مەئجوج . ئایا کەس بینیویەتی ؟! یا خود دەکرێت کەسێک بیبینێت؟

یەکێک لەسەحابەکان بینیویەتی...بوخاری باسدەکات بەشێوەیەکی چەسپاندن و دڵنیاکەرەوە: ((پیاوێک ووتی بە پێغەمبەر ﷺ ئەو بەربەستەم بینیوە وەک پۆشاکێکی ڕەنگاوڕەنگ وایە هێلی سپی و ڕەش و چەند ڕەنگێکی دیکە شی تێدایە، پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت بۆ باوەڕکردن بەقسەکەی وە لەدروستی شێوەو سیفەتەکەی فەرمووی ((بێگومان بینیووتە)).

**ئیبن حجر** دەڵێت ((ئەو حەدیسەگەیشتۆتە ئیبن ئەبی عومەر لەڕێگای سەعید ئیبن ئەبی عروبە لەقەتادە ئەویش لەپیاوێک لەئەهلی مەدینە کەبەپێغەمبەری ووتوە ﷺ : ئەی پێغەمبەری خوا ، من بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوجم بینیوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((کیفَ رأیتهُ؟)) **واتە:** ((چۆن بینیووتە))؟ ووتی وەک پۆشاکێکی ڕەنگاوڕەنگ وابوو ڕێگای سوورو ڕێگای ڕەشی تێدایە، پێغەمبەر ﷺ بۆ سەلماندنی قسەی ئەو فەرمووی: ((قد رأیتَهُ)) **واتە:** ((بێگومان بینیووتە)) فتح الباری ١٠/١٢٩)

**الحافظ ابن کثیر** ڕەحمەتی خوای لێبێت – باسی ئەو چیرۆکە دەکات لەبارەی بەربەستەکە، وە هەوڵدانی هەندێک پادشا بۆ گەیشتن بەو بەربەستە جا دەڵێت (خەلیفە واثق لە وڵاتەکەی خۆی هەندێک لەسەر کردەکانی نارد وە پۆلێک سەربازی لەگەڵیدا ئامادە کرد بۆ ئەوەی بەربەستەکە ببیننەوە، بۆ ئەوەی پێی نیشان بدەن لەکاتی گەڕانەوەیاندا، جا وڵات بەووڵات و شوێن بەشوێن گەڕان، وە لەم پادشایە بۆ ئەو پادشایە گەڕان و سووڕان ، تاوەکو گەیشتنەلای بەربەستێک، بینیان ئەو بەربەستە لەئاسن و مس دارێژراوە، باسیان کرد کەوا ئەوان دەرگایەکی گەورەیان بینیووە کەچەند قوفڵی گەورەی لێدرابوو، وە بینیان پاشماوەی هەندێک خشت و بەرد



کەوا لەدروستکردنی بەربەستەکە بەکارهێنرابوو، وە لەوێدا هەندێک پاسەوانی هاوسنووری پادشایەک لەوێ بوون، بینیان دوو چیای زۆر بڵندو گەردن کەشە، هیچ کەسێک توانای ئەوەی

**نیە بچێتە خوارەوە، وە لەدەورو پشتیدا هیچ چیایەک نیە، پاشان گەڕانەوە وولآتی خۆیان، سەفەرەکەشیان زیاتر لەدووساڵی خایاند، وەشتی زۆر ناخۆش و سەیرو سەرسورهێنەریان بینیبوو))** البداية والنهاية ١٢٦/٧، الحافظ ابن كثير – ڕحمەتی خوای لێبێت – باسی هیچ سەنەدێکی نەکردووە، بۆ ئەم چیرۆکە، وە قسەشی لەسەر نەکردووە، خوای گەورەش زاناترە لەم بارەیەوە.

**خەلیفە الواثق:** حوکمی دەوڵەتی عەباسی کردووە لەساڵی ٢٢٧ – ٢٣٢ کۆچی بەرامبەر / ٨٤٢ – ٨٤٧ زایینی وە ڕێز بەندی لەناو خەلیفەی عەباسییەکاندا نۆیەمین خەلیفەیە.

## ئایا بەربەستەکەی ذی القرنین پەیوەندی هەیە بەشوورە گەورەکەی چین؟

لێرەدا چەند جیاوازیەک هەیە لەنێوان بەربەستەکەی ذی القرنین وە شورەی چین لەچەند ڕوویەکەوە :

**١. ئەو بەربەستەی ذو القرنین دروستی کردووە بۆ بەرگریکردن لەهێرشی یەئجوج و مەئجوجە، بەڵام شوورەکە خەڵکی چین خۆیان دروستیان کردووە بۆ پاراستنی موڵک وماڵی خۆیان.**

**٢. بێگومان کەرەستەی بەربەستەکە دیارە کە لەئایەتەکاندا باسکراوە لەئاسن و مس دروست کراوە، بەڵام شوورەی چین لەبەردو خشتی سوور دروستکراوە.**

**٣. بەربەستی یەئجوج و مەئجوج لەنێوان دوو چیادا دروستکراوە کە دەروازەی نێوان دووچیاکەی گرتووە، تەنها ئەو ڕێڕەوە هەیە، بەڵام شوورەی چین بەربەستێکە لەسەر لووتکەی چیاکان و ڕێرەوەکان وە لەڕۆژ هەلاتی چین درێژ دەبێتەوە بۆ ڕۆژئاوای چین بەدرێژایی هەزارەها میل.**

**٤. بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج ناکرێت کون بکرێت یان بڕوخێندرێت تەنها ئەگەر خودای گەورە ویستی لەسەر بێت لەکۆتایی زەماندا، بەڵام شوورەی چین لەزۆر شوێندا ڕووخاوە، خەڵکی پێیدا دەچنە ژوورەوەو دەردەچن، بەڵکو لەزۆر شوێندا خەڵکی خۆیان بەشێکیان لێ هەڵوەشاندۆتەوە.**

**شوورە گەورەکەی چین:** درێژترین بینایە لەمێژوودا درێژیەکەی دەگاتە (٦٤٠٠ کیلۆمەتر)، بەدەست دروستکراوە سەرەتای دروستکردنەکەی لەسەدەی چواری پێش زایینی دەستی پێکردووە، بەردەوام بوو تاکو سەرەتای سەدەی حەڤدەی زایینی چینیەکان ئەم شوورەیان دروست کرد بۆ پاراستنی سنووری باکوریان لەداگیرکەران، ئەم سنوورە درێژ دەبێتەوە لەباکووری چین لەنێوان کەناری ڕۆژ هەڵاتی باکوور و ناوەڕاستی چین بەدرێژایی ساڵەکان





بەشێک لەم شوورەیە ڕووخاوەو چاککراوەتەوە بەشی سەرەکی ئەم شوورەیە درێژیەکەی (٣٤٦٠ کیلۆمەترە) وە بەرزی شوورەکە (٧,٥ مەترە) و پانیەکەی لەبنچینەدا (٧٥مەترە) و تەسک دەبێتەوە تاکو (٤,٦ مەتر) لەلووتکەی چیاکاندا، وە چەند تاوەرێکی تێدایە بۆ چاودێری کردن دووری نێوان هەر تاوەرێک لەسەر شوورەکە (١٨٠مەترە)، بە تێپەڕبوونی سەدەکات بەشێکی زۆر لەو شوورەیە ڕووخاوە، دەسەڵاتدارە شیوعیەکانی چین توانیان سێ بەشی ئەم شوورەیە چاک بکەنەوە لەساڵی (١٩٤٩زاییینی)، بەڵام چینیەکان ئەم شوورەیە بۆ بەرگریکردن لەخۆیان بەکاری ناهێنن.



شورەی چینی گەورە



وێنەیەك لەناوەوەی شورەکە

## بۆ چی مانگە دەستکردەکان بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجووجیان ئاشکرا نەکردووە؟

زانینی هەموو پارچە زەویەک و ئەوەی لەناوەوەو دەرەوەی دایە لەهەموو دروستکراوێک ناتوانن شوێنی ئەو بەربەستە بزانن تەنها خودای بەرزو بەتوانا نەبێت.
کەوا زانست و زانیاریەکەی هەموو شتێکی داپۆشیوە، وە پێویست ناکات و پێویستیش نیە لەسەر ئاشکراکردنی شوێنی بەربەستەکەی یەئجوج و مەئجوج، یان شوێنی دەجال، یاخود زۆرێک لەو درستکراوانەی کەشوێنیان لەسەر زەوی دیار نیە. بێگومان خودای گەورە شوێنی دیتنی یەئجوج و مەئجوج و بەرستەکەی لەپێش چاوی خەڵک شاردۆتەوە، یاخود لەنێوان ئەوان و لەنێوان خەڵکیدا شتێکی وای داناوە کەقەدەغە دەکات لەدیتن و گەیشتن پێیان هەروەک خودای گەورە وەک نموونە بەسەر بەنی ئیسرائیلیەکانی سەپاند کەوا چل ساڵ لەیەک شوێندا وونیکردن و لەشوێنی خۆیاندا چەقابوون و تەنها لەوجێگایەدا بەدەوری خۆیاندا دەسوڕانەوە، وە بۆ خەڵکی ئاشکرانەکران تاوەکو کۆتایی بە وونبوونەکەیان هات، خودای گەورەش لەسەر هەمووشتێک بەتوانایە، بۆ هەموو شتێکیش ئەجەل و کاتی بۆ داناوە.

خودای (عزوجل) دەفەرموێت ﴿ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۚ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ۚ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾ واتە ( **لەگەڵ ئەوەشدا - قەومەکەی تۆ ئەو بەرنامەو قورئانەیان بەدرۆزانی، لەکاتێکدا هەر ئەوەیە حەقیقەت و ڕاستی پێیان بڵێ: ئەوە ئیتر من دەسەڵاتی ڕزگارکردنی ئێوەم نیەو من پشتیوانی ئێوە نیم - ئەگەر خوابەڵایەکتان بەسەر بهێنێت- (٦٦) بۆ هەموو هەواڵێک - کە لەقورئاندا هاتووە- کات و شوێنی بەدی هاتنی خۆی هەیە، لەئایندەشدا دەیزانن(٦٧)** ) ) الانعام/٦٦-٦٧

کەچی لەسەرەتادا هیچ کەس نەیتوانی شتێک ئاشکرا بکات لەگەڵ ئەوەشدا لەم دواییانەدا گەلێ شت ئاشکراکراوە چونکە تەنها خودای گەورە بۆ هەموو شتێک ئەجەل و کاتی ئاشکراکردنی بۆ داناوە.

چیرۆکی وونبوونی بەنی ئیسرائیل لەوکاتەی کە خودای گەورە موساو قەمەوکەی ڕزگارکرد موسا (علیه السلام) پێی ووتن ﴿ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴾

کەوا خاکی بیت المقدس بو لێیان قەدەغە کرابوو بچنە ناویەوە، جا ووتیان : ﴿ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا مِنْهَا فَإِنَّا دَاخِلُونَ ﴾ قەومەکە وتیان ئەوانە قەومێکی زۆردارن واتە هێزو تواناو خاوەن دەسەلاتن، هیچ کاتێک ناچنە ناویەوە، لەکاتێکدا ئەوانە موساو قەومەکەیان قەدەغەکردبوو بچنە ناوخ[illegible] ی بیت المقدس کەوا خودای گەورە لەسەری واجب کردبوون، خودای گەورە دەفەرموویێت ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي الْأَرْضِ ﴾ ئەوانە چل ساڵ بەوونبوویی مانەوە لەیەک شوێندا پاشان دەڕۆیشتن کاتێک شەو دادەهات بۆ بەیانی سەیریان دەکرد تەنها لەجێگای خۆیان ماونەتەوەو دەسوڕێنەوە، نەیاندەزانی ڕوو لەکوێ دەکەن بەدرێژایی چڵ ساڵ دەرۆیشتن، خودای گەورە ئەو سزایەی بەسەر ئەواندا سەپاند ئەمەش پاداشتی ئەو لووت بەرزی ستەمەی ئەوان بوون کاتێک پێیان وترا بڕۆنە ناو خاکی بیت المقدس ئەوانیش بەگوێیان نەکردو بەرهەڵستکار بوون، بە (موسا) یان ووت ﴿ فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ ﴾ ووتیان ئەی موسا بۆ خۆت و خوایەکەت بڕۆنە ناو بیت المقدس شەڕ بکەن دژی فرعەون ئێمە بۆ خۆمان لێرە دەمێنینەوە.

لەکۆتاییەکەیدا .. **قاضی عیاض** دەڵێت **((ئەو حەدیسانەی هاتوون لەبارەی یەئجوج و مەئجوج، ئەو هەواڵانە هەموویان ڕاست و دروستن پێویستە باوەڕی پێ بهێنین، چونکە دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە، وە هەواڵیان لەبارەیەوە هاتووە کەوا کەس توانای شەڕ کردنیان لەگەڵدا نیە لەبەر زۆری ئەوان، یەئجوج و مەئجوج پێغەمبەر عیسا (علیه السلام) و ئەو ئیماندارانەی کە لەگەڵیدان گەمارۆدەدەن کەلەدەستی دەجال ڕزگار بوونە، جا لەخودا دەپاڕێنەوەو داوای هاوکاری لێدەکات ئینجا خودای (عزوجل) هەموویان بەیەکجار بەهۆی کرمێکەوە لەناودەبات — ئەو کرمەش لەگەردنیان دەخوات- جا زەوی و ئیماندارەکان تووشی ئەزیەت و بۆ نی پیس دەکات لەبەر لاشەکانیان، دیسان عیساو هاوڕێکانی لەخودای گەورە دەپاڕێنەوە ئینجا خودای (عزوجل) جۆرە باڵندەیەک دەنێرێت و لاشەکەیان هەڵدەگرێت بۆ ئەو شوێنەی خودای گەورە دەیەوێت))** شرح مشکاة المصابیح (٢/٦)

# وە لەکۆتاییدا..

## ئایا پێویستە لەسەر موسلمانان شەڕیان لەگەڵدا بکەن؟

**وەڵام** // نەخێر، کاتێک پێشتر باسی چیرۆکی عیسا (علیه السلام مان کرد کەوا خودای (عزوجل) بەعیسای فەرموو (إني قد بعثت عباداً لي لايدان لأحد بقتالهم فحرّز عبادي الى الطور) واتە: **(ئەی عیسا من کۆمەڵە بەندەیەکم رەوانە کردووە بۆ سەر زەوی کەس دەسەڵاتی شەڕکردنی نیە لەگەڵیاندا جا بەندە ئیماندارەکانم کۆبکەرەوەو بیانبە بۆ شوێنە قایمەکانی کێوی طور)** موسلیم ریوایەتی کردووە






لە نیشانە گەورەکانی رۆژی دوایی کەوا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە، سێ ڕۆ چوونی گەورە روودەدات کەخەڵکی زۆر دەچڵەکێنێ و ترس دایان دەگرێت، وە کاریگەریەکی زۆریشی لەسەریاندا دەبێت.

## مانای ڕۆ چوون:

**لەت بوونی زەوی و ئەوەی لەسەریەتی روو دەچێتە خوارەوە :**

**وەلەسەردەمی ئێستاو ڕابردووشدا چەندەها جۆر ڕۆ چوونی زەوی روویانداوە، کە هێزو قەبارەکەیان لەیەکتر جیایە، بەڵام ئەو سێ روو چوونە کەلەحەدیسەکاندا باسکراوە ئەوا کاریگەرەو هەواڵەکەی بڵاو دەبێتەوە هەموو کەس باسی دەکات.**

**ئەو سێ روو چوونە کە لەحەدیسەکاندا هاتووە کەوا لەنیشانەکانی رۆژی دواییە ئەوا لەکۆتایی زەماندا دەبێت، زۆر بەڵگەو دەقی باوەڕپێکراو هەیە.**



وێنەیەک لەڕوو چوونی زەوی کەوا لەیەکێک لە شەقامەکانی دانیمارک روویداوە، ئەمەش ئەو ڕووچوونە نیە کەمەبەستی لە ڕۆژی دواییە.





وێنەیەکی تر لەهەمان ڕووچوونی زەوی کەلەسەرەوە ڕوون کراوەتەوە

## ئەو حەدیسانەی لەبارەی ڕۆچوونەکان هاتوون:

لەحوذیفەی کوڕی ئەسیری غەفاری رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : (پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان و ئێمەش قسەمان دەکرد، فەرمووی (فقال : ما تذاكرون ؟ قالوا : نذكر الساعة ، قال : « إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات - فذكر - الدخان ، والدجال ، والدابة ، وطلوع الشمس من مغربها ، ونزول عيسى ابن مريم صلى الله عليه وسلم ، ويأجوج ومأجوج ، وثلاثة خسوف : خسف بالمشرق ، وخسف بالمغرب ، وخسف بجزيرة العرب ، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن ، تطرد الناس إلى محشرهم) **واتە: (باسی چی دەکەن؟ ووتمان : باسی ڕۆژی دوایی دەکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ڕۆژی دوایی دانایەت تاوەکو دەنیشانە لەپێشی دا دەبینن جا باسی کردن : دووکەڵەکە و، دەجال و، الدابە (ئاژەڵە قەسەکەرەکە) و، هەڵاتنی ڕۆژ لەرۆژ ئاواو، دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم (علیە السلام) و یەئجوج و مەئجوج و، سێ رووچوونی زەوی: رووچوونێک لەرۆژ هەڵات، وە رووچوونێک لەرۆژ ئاوا، وە روو چوونێک لەدورگەی عەرەب، وە کۆتایی ئەمانە ئاگرێکە لەیەمەن دەردەچێت خەڵکی راودەنێت بۆ شوێنی کۆبوونەوەیان)** موسلیم ریوایەتی کردووە.

### ئەو حەدیسانەی هاتوون لەبارەی رووچوونی زەوی بەگشتی :

لەهەندێک ڕیوایەت و گێڕانەوەدا دەستنیشانکردنی شوێنەکەو هۆکاری یەکێک لەسێ رووچوونە گەورەکان هاتووە، ئەویش رووچوونێک کەلەدوورگەی عەرەب دەبێت،




لە أم سلمە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (يكون اختلاف عند موت خليفة، فيخرج رجل من قريش من أهل مكة فيخرجونه وهو كاره، فيبايعونه بين الركن والمقام، فيبعثون اليه جيشاً من أهل الشام، فإذا كانوا بالبيداء، خُسف بهم، فإذا بلغ الناس ذلك أتاه أبدال أهل الشام وعصابة

أهل العراق فيبايعونه) **واتە:** ((ناکۆکی و ئاژاوە لەکاتی مردنی خەلیفەیەک ڕوودەدات لەو کاتەدا پیاوێک لەئەهلی قورەیش لە (مەدینە) رادەکات بەرەو (مەککە)، کە سانێک لەخەڵکی مەککە دێن بۆ لای و بەنابەدڵی دەیهێننە دەرەوەو بەیعەتی دەدەنێ، لەنێوان (روکن) و (مەقام)دا، پاشان لەشکرێک لەووڵاتی شامەوە ڕەوانە دەکرێتە سەری، لەبیابانێک لەنێوان مەککەو مەدینە لەشکرەکە ڕوو دەچێت جا کاتێک ئەو هەواڵە بڵاو دەبێتەوە کەسانی موسڵمان و ئیماندار لەئەهلی شام و کۆمەڵێک کەسی ئیماندار لەئەهلی عێراق دێنەلای و بەیعەتی دەدەنێ)) ابن حبان ڕوایەتی کردووە.

## حەدیسەکان لەبارەی هەندێک ڕوو چوونی دیکە وەک سزایەک لەسەر یاخیبووەکان :

لەئەبی الباهلی رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت (يبيت قوم من هذه الأمة على طعام وشراب ولهو ، فيصبحون قد مسخوا خنازير، وليخسفن بقبائل فيها وفي دور فيها ، حتى يصبحوا فيقولوا خسف الليلة ببني فلان خسف الليلة بدار بني فلان ، وأرسلت عليهم حصباء حجارة كما أرسلت على قوم لوط، وأرسلت عليهم الريح العقيم فتنسفهم كما نسفت من كان قبلهم بشربهم الخمر، وأكلهم الربا ، ولبسهم الحرير ، واتخاذهم القينات ، وقطيعتهم الرحم قال : وذكر خصلة أخرى فنسيتها) **واتە:** ((قەومێک لەو ئوممەتەدا پەیدا دەبێت خانوو لەسەر خواردن و خواردنەوەو ڕابواردن دروست دەکات، شێوەو ڕوخساری خۆیان وەک بەراز دەگۆڕن، جا لە ئەو هۆزانەدا بەزەویدا ڕوودەچن و لەخانووەکانی دەوروپشتیاندا زەوی ڕووچوون ڕوودەدات تاوەکو وای لێدێت دەڵێن: ئەمشەو فلان بنەماڵە لەزەویدا چوونە خوارەوە، ئەمشەو فلان ماڵ زەوی ڕووچوون تێیدا ڕوویدا، هەروەها بەردو چەو بەسەریاندا دەبارێت، وەبایەکی بێ کەڵک ڕەوانەی سەریان دەکرێت وە هەناسەیان پێ دەدرێت وورگیان دەتەقێت، هەروەک لە پێش ئەوانە ئەو کەسانەی عەرەقیان دەخواردەوەو ڕیبایان دەخوارد، وەپۆشاکی ئاوریشمیان لەبەردەکردو ئەوانەی گۆرانی بێژی ئافرەتیان دەهێناو ئەوانەی پەیوەندی خزمایەتیان دەپچڕاند هەموویان لەناوچوون، ووتی: پێغەمبەر ﷺ باسی هەندێ سیفەت و خەسڵەتی دیکەی کرد من لەبیرم کردووە)) حاکم ڕیوایەتی کردووە.

- لەئیبن و عومەرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (في أمتي خسف ومسخ وقذف) **واتە:** ((لەئوممەتەکەمدا زەوی ڕوو چوون و شێوەو ڕووخسار گۆڕین و بەرد باران کردن ڕوودەدات)) حاکم ڕیوایەتی کردووە.

- وە لەئیبن و عومەرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت (فبينا رجل يجر إزاره من الخيلاء خسف به، فهو يتجلجل في الارض الى يوم القيامة) **واتە: (پیاو دەردەکەوێت پۆشاک و قژپچەکانی ڕادەکێشێت لەبەر گەورەیی و خۆبەزل زانین لەزەوی ڕوو دەچێت، ئەمەو دەنگ و جوولەی لێوە دێت لەسەر زەوی تاوەکو ڕۆژی قیامەت))** بوخاری ریوایەتی کردووە.

- لەئەنەسەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە (يا أنس ، إن الناس يمصرون أمصارا ، وإن مصرا منها يقال له : البصرة - أو البصيرة - فإن أنت مررت بها ، أو دخلتها ، فإياك وسباخها ، وكلاءها ، وسوقها ، وباب أمرائها ، وعليك بضواحيها ، فإنه يكون بها خسف وقذف ورجف ، وقوم يبيتون يصبحون قردة وخنازير) **واتە: ((ئەی ئەنەس، کەسانێک هەن زۆر کەللە ڕەق و پێداگیرن، وەیەکێک لەو کەللەڕەقانە دەڵێن خەڵکی (بەسرە)ن یاخود (بوسەیرە)، جا ئەگەر تۆ بەوێداتێپەربوویت یان چوویە ناویەوە خۆت بپارێزە لەدانیشتن تێیدا، وەسەرنج دان و خواردن و خواردنەوە لەناویداو، گەڕان لەناو بازاڕەکەی، وەلەبەر دەرگای فەرمانڕەواکانی و، پێویستە تەنها لەدەورووبەری شارەکە بمێنیتەوە چونکە لەوانەیە زەوی ڕوو چوون و بەرد باران و زەوی لەرزە تێیدا ڕووبدات، وە قەومێکیش هەن خانوو دروست دەکەن دەبنە مەیموون و بەراز))** ئەوبوداود ڕیوایەتی کردووە.




پێغەمبەر ﷺ لەو حەدیسەدا هەواڵی داوە، کەوا کەسانێک لەووڵاتێکدا شارێک دروست دەکەن پێی دەڵێن بەسرە، جا پێغەمبەر ﷺ ئەنەس ئاگادار دەکاتەوە لەچوونە ژوورەوە بۆ ناو ئەو شارە لەخاکەسوێریەکەی،و بازاڕو ئەو شوێنانەی خەڵکی تێیدا کڕین و فرۆشتن دەکەن، وە ئاگاداری دەکاتەوە نەکەی لەدەرگای فەرمانڕەوا ستەمکارەکانی ئەو شارە بدەیت، لەکاتێکدا لەوانەیە لەو شارەدا زەوی رووچوون و بەردباران و بوومەلەرزەو رووخسار گۆڕین ڕووبدات، پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی دەکات کەوا لەدەوروبەری شارەکە بمێنیتەوە، بۆ دوورە پەرێز بوونی لە لەناوچوون.





- لەنافیعەوە کەوا پیاوێک هەتالای ئیبن عومەر ڕەزای خوای لەسەر بێت ووتی : (فلان کەس سەلامت پێ ڕادەگەیەنێت ئیبن عومەر ووتی: پێم گەیشتووە کەوا ئەو بیدعەیەکی تازەی داهێناوە، ئەگەر ئەو قسەیەی کردووە ئەوا سەلامی ئەوم پێ ڕامەگەیەنە، من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو (لەئوممەتی من یاخود لەو ئوممەتەدا رووخسار گۆڕین و زەوی ڕووچوون و بەرد بارانکردن ڕوودەدا، وەئەوەش خاوەنی ئەو چارەنووسەیە) ابن ماجەو ترمذی ریوایەتیان کردووە .

## لەو حەدیسانەدا ڕوودانی جۆرەها زەوی ڕووچوونی تێدایە لەو ئوممەتدا.

بەڵام سێ ڕووچوونە گەورەکە ئەوە لەکۆتایی زەماندا ڕوودەدات، کەوا لەحەدیسی پێشوو باسی ئاشکرا کردنی یەکێک لەو زەوی ڕوو چوونانەو هۆکارەکانی کراوە، بەڵام دوو ڕوو چوونەکەی دیکە، کەوا لەکۆتایی زەماندا ڕوودەدات، بەڵام من ناوەستم لەسەر حەدیسێک کە دەسەڵات لەسەر شوێن و هۆکاری دوو ڕووچوونەکە بکات، خودای گەورە لەهەمووکەس زاناترە.






**نیشانەکانی** ڕۆژی دوایی جۆراوجۆرن، لەوانە پەیوەندی هەیە بەزەوی ڕۆچوون و بێ بارانی و ووشکە سالی، لەوانە پەیوەندی هەیە بەخەڵک وەک زۆربوونی ئافرەتان و کەم بوونی پیاوان، وە لەوانە پەیوەندی هەیە بەئەخلاق و خوو ڕەوشت وەک داوێن پیسی، وە لەوانە پەیوەندی هەیە بەئاسمان و گەردوون، یەکێک لەوانە دووکەڵ.


وێنەیەکی نیشانەیی روو لەشارێك دەکات بەڵام ئەو دووکەڵە نیە کە لەئایەتەکەدا مەبەستیەتی

- مەبەست چیە لەدووکەڵ؟
- وەئایا ئەو نیشانەیە ڕوویداوە؟
- حیکمەت لەو دووکەڵە چیە؟

بنچینەو ڕەسەنی ئەو نیشانەیە لەنیشانەکانی ڕۆژی دواییە، خودای گەورە دەفەرموێت :

﴿إِن فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ

رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ الدخان/١٠-١٣

واتە (چاوەڕێبە ڕۆژێک دێت ئاسمان دوو کەڵێکی دیارو ئاشکرا لەگەڵ خۆی دەهێنێت (١٠) خەڵکی دەگرێتەوەو دایان دەپۆشێت، ئەو دووکەڵە عەزابێکی بەئازارە (١١) بەناچاری دان بە دەسەڵاتی خوادا دەنێین و ، دەڵێن : پەروەردگارا تۆ ئەم سزاو ئازارەمان لەکۆڵ بکەرەوە، بێگومان ئێمە باوەڕدارین !! (١٢) - تازە بەسەر چوو!! کەی بێدار بوونەوەو ئیمان هێنانی ناچاری سوودی هەیە بۆیان - چۆن و لەکوێ ئامۆژگاری وەردەگرن، لەکاتێکدا پێغەمبەرێکی ئاشکرایان بۆ ڕەوانە کرابوو (١٣) )

## ناکۆکی و جیاوازی زانایان لەمەبەستی دووکەڵەکە که لەو ئایەتەدا هاتووە لەسەر دوو جۆرە:

١. هەندێک دەڵێن کەوا ئەو دووکەڵە بەو هۆیەوە کەقورەیشەکانی تووشی زەحمەتی و برسیەتی کرد لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نزای لێکردن کە ئەوان بەپیر بانگەوازیەکەوە، نەچوون بۆیە هەموویان سەیری ئاسمانیان کردوو چاوەکانیان بڕیبوو لەئاسمان هیچیان نەبینی تەنها شتێک وەکو دووکەڵ وابوو لەبەر توندی و کاریگەری بەڵایەکە، وە بۆ ئەم قەولەش عبدوللای کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لەسەر بێت خاوەنیەتی، وەکۆمەڵێک لەپێشینیەکان شوێنی کەوتن لەهەموویان باشتر ئیبن جریری الطبری بوو ڕەحمەتی خوای لێبێت.

لە (مەسروقی کوڕی ئەجدەع)ەوە دەڵێت: ((ئێمە لەلای عەبدوللای کوڕی مەسعود دانیشتبووین پیاوێک هاتەلای و ووتی : ئەی باوکی عەبدول ڕەحمان، یەکێک لەدوورەوە هاتووە دەڵێت نیشانەی دووکەڵەکە بەڕێوەیەو دێت وەهەناسەی کافرەکان دەگرێت و هەموو گیانیان پێ دەئاوسێت، وە بۆ ئیماندارانیش وەکو هەڵامەت وایە، جا عەبدوللا دانیشت بەتوورەی ووتی : ئەی خەڵکینە لەخوا بترسن، کێ ئێوەی فێرکردووە بەشتێک کە دەیلێن و لێی نازانن، ئەوەی نازانێت بابڵێت: خوای گەورە لەهەموو کەس زاناترە، وەهەر کەسێک لەئێوە شتێک دەزانێت بافێری ئەو کەسەبکات کەنایزانێت، وە هەرکاتێک شتێک نازانێت بابڵێت: خوای گەورە دەزانێت، چونکە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووە ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴾، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک هەندێک خەڵکی بینی پشتیان تێ دەکات و ڕادەکەن پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت پێیانی فەرموو

(( اللهم سبع کسبع یوسف)) دەڵێت: ساڵێک بەسەریاندا تێپەڕی هیجیان نەما تاکو وای لێهات پێستەی دڕندەو مردوویان دەخوارد لەبرسان، جا یەکێک لەوان سەیری ئاسمانی کرد دیتی ئاسمان پارچەیەک دووکەڵە. متفق علیه

هەروەها **ئیبن مەسعود** دەڵێت (پێنج نیشانە هاتوون و تێپەڕیوون: اللزام ، والروم، والبطشة، والقمر، والدجال ) بوخاری و موسلیم ریوایەتیان کردووە.

**اللزام :** ئاماژەیە بەو فەرموودەیە کە خودای گەورە دەفەرموویت ﴿ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾ ﴾(الفرقان/٧٧) **واتە :** کەچی زۆربەتان هەر پیغەمبەرو قورئانتان بەدرۆزانی، ئەگەر بەردەوام وابن، ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لەئایندەدا یەختان پێ دەگرێت و لە کۆڵتان نابێتەوە))

**والروم:** ئاماژەیە بەو فەرموودەیە کەوا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ الرُّومُ ﴿٢﴾ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ ﴾ : (الروم/١-٣)
**واتە:** هەر خوا خۆی زانایە بەنهێنی ئەو پیتانە (١) ڕۆمەکان تێکشکێندران (بەدەستی فارسەکان) (٢) لەنزیکترین ونزمترین وولاتیاندا، بەلام لەئایندەدا ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە (٣) ))

**البطشة:** ئاماژەیە بەو فەرموودەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَىٰ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (الدخان/١٦) **واتە :** ((ڕۆژێک دێت هەڵمەتی گەورەی خۆمان بۆ تاوانباران دەبەین و ئێمە بەدڵنیاییەوە تۆڵە سێنەرین لەستەمکاران)
مەبەست لە (البطشةالكبرى) غەزای بەدرە.

**القمر :** ئاماژەیە بەو فەرموودیە کەوا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴿١﴾ ﴾ القمر/١ **واتە:** (ڕۆژی قیامەت نزیک بۆتەوەو مانگیش لەت بوو)

**والدخان:** ئاماژەیە بەو فەرموودەیە کەوا خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الدخان/١٠
**واتە:** (چاوەڕێ بەڕۆژێک دێت ئاسمان دووکەڵێکی دیارو ئاشکرالەگەڵ خۆی دەهێنێت)

٢. زۆر لەزاناياكان بۆ چوونيان وايە كە ئەم دووكەڵە لەنيشانەكانى چاوەڕوان كراوى ڕۆژى دواييە كە هێشتا نەهاتووە، بێگومان نزيكى ڕۆژى قيامەت ڕوو دەدات، كە خاوەنى ئەم بۆ چوونانەش عەلى كوڕى ئەبى تاليب و ئيبن عەباس و ئەبى سەعيدى خودريە – ڕەزاى خوا لەهەموويان بێت –

الحافظ ابن كثير ڕەحمەتى خواى لێبێت ئەمەيان پەسند دەكات، بەڵگەو سەڵمانديشى ئەو حەديسانەش كەپێشتر باسكراوە بۆ سەڵمادن لەسەر ئەو نيشانەيە.

هەندێكيش لەزانايان بۆ چوونيان وايە بۆ كۆكردنەوەو يەكدەنگى لەنێوان ئەو نيشانانە، كە وا دەڵێن ئەوە دووكەڵە يەكێكيان دەركەوتووەو ئەويتر كە ماوەتەو لە كۆتايى زەماندا ڕوودەدات، بەڵام نيشانەى يەكەم كەوا دەركەوتووە كەوا هۆزەكانى قورەيش بينيان كە ئاسمان پارچەيەك دووكەڵ بوو، ئەو دووكەڵەش دووكەڵى ڕاستەقينەنيە كەوا لەكاتى دەركەوتنى نيشانەكانە، كەوا يەكێكە لەنيشانەكانى ڕۆژى دوايى.

**ئيبن مەسعود** ڕەزاى خواى لەسەر بێت دەيووت **(ئەمە دوو دووكەڵە يەكێكيان هاتووەو تێپەڕيوە، ئەوەى ماوەتەوە نێوان ئاسمان و زەوى پڕدەكات، بۆ ئيمانداران وەك هەڵامەت دەبێت، بەڵام بۆ كافرەكان ئەوا گوێچكەكانى كون دەكات** ( التذكرة من ص٦٥٥)

ئەوەى لەهەمووى پەسندترو شياو تر ئەوەيە كەوا دووكەڵە چاوەڕوان كراوەكە هێشتا ڕووينەداوە، ئەمەش چەمكێكە لەقورئان، خوداى گەورەو ميهرەبان دەفەرموێت :

﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ ﴾ الدخان/١٠

**واتە :** (چاوەڕوان بە ڕۆژێك دێت ئاسمان دوكەڵێكى ديارو ئاشكرا لەگەڵ خۆى دەهێنێت) كەوا هەموو كەسێك دەيبينێت.

بەڵام ئەوەى ئيبن مەسعوود ڕەزاى خواى لەسەر بێت باسيكردووە كاتێك تووشى قورێشيەكان هات، ئەمە تەنها خەياڵێك بووە بەچاو بينيوويانە لەبەر توونديى كاريگەرى برسيەتى و هيلاك بوونيان، كەوا خواى گەورە دەفەرمووێت ﴿ يَغۡشَى ٱلنَّاسَ ﴾ **واتە:** (بەڕاستى و بەحەقيقەت هەموو كەس دادەپۆشێت، هەروەها دەفەرمووێت ﴿ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ **واتە** ( ئەم دووكەڵە عەزابێكى بەئازارە)

## ئەو حەدیسانەی هاتوون لەبارەی دووکەڵەکە :

- عن حذيفة رضي الله عنه قال ﷺ (فقال : ما تذاكرون ؟ قالوا : نذكر الساعة ، قال : إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات - فذكر - الدخان ، والدجال ) **واته:** لەحوذەیفەوە رەزای خوای لێبێت پێغەمبەر ﷺ هاتەلامان و ئێمەش قسەمان دەکرد، فەرمووی **(باسی چی دەکەن )؟ ووتمان : باسی رۆژی دوایی دەکەین، فەرمووی (قیامەت دانایەت تاوەکو دەنیشانە لەپێشی دا دەبینن جا باسی کرد: دووکەڵەکەو دەجال و الدابە و هەڵاتنی رۆژ لەرۆژ ئاواو دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم و یەئجوج و مەئجوج و سێ ڕوو چوون، رووچوونێک لەرۆژهەلات و رووچوونێک لەرۆژئاواوە رووچوونێک لەدوورگەی عەرەب وکۆتایی ئەمانە ئاگرێکە لەیەمەن دەردەچێت و خەڵکی ڕاودەنێت بۆ شوێنی کۆبوونەوەیان)** ئەحمەد و ترمذی ریوایەتیان کردووە

- ئەبی هورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت (بأدروا بالأعمال ستاً، طلوع الشمس من مغربها أو الدخان أو الدجال أو الدابة أو خاصة احدكم أو أمر العامة) **واته: (دەست پێشخەربن بەکارو کردەوەی چاک بەر لەوەی شەش فیتنەی گەورە ڕووتان تێبکات ئەوانیش، هەڵاتنی رۆژ لەرۆژ ئاوا، یان دوکەڵەکە، یان دەجال، یان الدابە، یان سەرقاڵیەک وەک و نەساغی، یان کاروباری گشتی )** موسلیم ریوایەتی کردووە

- **لەعەبدوللای ابن أبی ملكيه** دەڵێت **(رۆژێ چوومەلای ئیبنو عەباس ڕەزای خوای لێبێت نانی بەیانیم لا خوارد ئینجا ووتی : ئەمشەو تاکو بەیانی نەخەوتووم، ووتم : بۆچی؟ ووتی: ووتیان کەوا ئەستێرەی کلک دار هەڵاتووە جامنیش ترسام لەوەی کە دووکەڵەکە ڕووبدات و بێت بۆیە تاکو بەیانی نەخەوتم )** ابن جرير و ابی حاتم ریوایەتیان کردووە

ئەمەش ترسی ئیبن عەباس دەردەخات لە دووکەڵەکە، لەوەی کەوا نیشانەیە کە لەنیشانەکانی رۆژی دوایی.






لە کۆتایی زەماندا لەگەڵ بڵاوبوونەوەی فەساد و خراپەکاری، وە ڕاهاتنی خەڵک لەسەری، شیرازەی ژیان تێک دەچێت، وە ئیماندارو دوو ڕوو تێکەڵی یەکتر دەبن، وە موسڵمان لەگەڵ کافر تێکەڵی یەکتر دەبێت، لەو کاتە خوای گەورە مۆڵەت بۆ دەرچوونی (الدابە ) ئاژەڵە قسەکەرەکە دەدات.

- دابە چییە؟
- لەکوێ و کەی دەدەچێت ؟
- ئەرکە گرنگەکەی چیە؟

## ئەو ئایەتانەی هاتوون لەبارەی باسکردنی (دابة)

خودای گەورەو میهرەبان دەفەرموویت ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾﴾ واتە (**کاتێک بڕیاری بەرپابوونی - قیامەت درا، یاخوودنزیک بۆوە - زیندەوەرێک لەزەوی دەردەهێنین بۆیان کەقسەیان بۆ دەکات کە : بەڕاستی زۆربەی خەڵکی باوەڕیان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبووە**) النمل/٨٢

مانای فەرموودەی ﴿تُكَلِّمُهُمْ﴾ دەڵێن : قسەیان بۆ دەکات، وەهەندێک دەڵێن: بەدرۆیان دەخاتەوە ...لەوانە سەعیدی کوڕی جوبەیر وەعاصم الجحدری وە ئەبو رجاء العطاردی ئەمە پەسند دەکەن و دەڵێن - تُكَلِّمُهُمْ - واتە: بەدرۆیان دەخاتەوە.

لەهیچ حەدیسێکی سەحیح و دروستدا سیفەت و خەسڵەتی ئەو ئاژەڵە قسەکەرە نەسەلمێندراوە.

الماوردی والثعلبی بەئاژەڵێکی سەر سوڕهێنەر وەسفی دەکەن و، دەستنیشانیان نەکردووە وەک ئەوەی: سەری وەک سەری گا وایە، وەگوێیەکەی وەک گوێی فیل وایە...هتد.

### بەڵام ئەوەی دەیزانین لەتایبەتمەندی و سیفەتەکەی:

- **ئەو (دابە) یان ئاژەڵێکی قسەکەری ڕاستەقینەیە..**
- **ئەو قسە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات.**
- **ئەو لەزەوی دەردەهێدرێت.**

## لەکوێ دەردەچێت ؟




- دەڵێن لەچیای سەفا لەمەککە دەردەچێت.
- دەڵێن لەژێرەوەی کەعبە دەردەچێت
- دەڵێن لەبیابان و سەحرادا دەردەچێت.



هیچ حەدیسێکی سەحیح ودروست دەستنیشانکردنی شوێنی دەرچوونەکەی نەسەڵماندووە. ئێمەش دەڵێین : باوەڕمان هەیە کەوا ئەم ئاژەلە دەردەچێت، هەروەها خوای گەورە هەواڵی پێداوە، بەڵام نازانین لەکوێ دەردەچێت.

## ئایا ڕاستی و ڕاستەقینەیی (دابە) کە چیە؟

- دەڵێن : پیاوێکە قسەو مشت و مڕ لەگەڵ خەڵکی دەکات ئەوەش نارەواو نادروستە.
- دەڵێن: ئەو ئاژەڵە ووشترەکەی پێغەمبەر (صالح )ە علیه السلام.
- دەڵێن : لەچەشنی یاخود وەچەی وشترەکەی پێغەمبەر (صالح)ە علیه السلام

## (دابە)کە یاخود ئاژەڵە قسەکەرەکە چی دەکات؟

ئاژەڵە کە بەخەڵک دەڵێت (أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ) واتە (بەڕاستی ئەو خەڵکە باوەڕ ناهێنن بەبەڵگەو نیشانەکانی خوای گەورە)

هەروەک لەو فەرموودەی خوای گەورەدا هاتووە ﴿ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾

**واتە (کاتێک بڕیاری بەرپابوونی - قیامەت درا، یاخوودنزیک بۆوە - زیندەوەرێک لەزەوی دەردەهێنین بۆیان کەقسەیان بۆ دەکات کە: بەڕاستی زۆربەی خەڵکی باوەڕیان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبووە)** النمل/٨٢.

### نیشانەکردن یاخود مۆرکردنی خەڵک (داخکردن بەئاگر)

لەئەبی امامە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (تخرج الدابة تَسِمُ الناس على خراطيمهم - جمع خرطوم وهو الأنف - ثم يغمرون فيكم - اي يختلطون الناس - حتى يشتري الرجل البعير فيقول : ممن اشتريته ؟ فيقول : اشتريته من أحد المخطمين) **واتە: (زیندەوەرەکە دەردەچێت و خەڵکی نیشانە دەکات لەسەر لووتیان تاکو لەنێوانتاندا بڵاو دەبنەوە هەتا پیاوێک وشترێک دەکرێت وپێی دەگوترێت: ئەو وشترەت لەکوێ کڕی؟ ئەویش دەڵێت: لەیەکێک لەنیشانە کراوەکان)** ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

- چۆنیەتی نیشانەکردنە یاخود مۆرکردنەکە، ئایا بەردەوام دەبێت؟
- ئایا نەوەکانی دوای ئەوان ئەو نیشانانەیان پێوەیە؟
- پاش ئەوەی ئاژەڵەکە خەڵکی نیشانەکرد، وە حەق و ناحەق لەیەکتر جیابوونەوە، ئیماندار لەکافر جیابووەوە، پاشان چی ڕوودەدات؟





نموونەیەک لەنیشانەکردن کەوا عەرەبەکان دەیکەن بەڵام چۆنیەتی نیشانەکردنی ئاژەڵ کە بۆ خەڵکی هەر خوا زاناترە

خەڵکی زەمانێک بەو حاڵەتە دەمێنێتەوەو بەردەوام دەبن، تاوەکو وای لێدێت پیاو ئەگەر بانگی یەکێک بکات دەڵێت ئەی ئیماندار...یان ئەی کافر.

هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە دەیەوێت قیامەت هەڵبستێت ئینجا بایەکی فێنک و خۆش دەنێرێت و گیانی ئیماندارانی پێ دەکێشێت، چونکە ڕۆژی دوایی دانایەت تەنها لەسەر خەڵکانی خراپ و تاوانباران نەبێت . وە ئیمانداران خەمی داچڵەکینە گەورەکەیان نیە.

لەعەبدوللای کوڕی عەمرو ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (يخرج الدجال في أمتي فيمكث أربعين - لا أدري : أربعين يوما ، أو أربعين شهرا ، أو أربعين عاما - فيبعث الله عيسى ابن مريم كأنه عروة بن مسعود ، فيطلبه فيهلكه ، ثم يمكث الناس سبع سنين ، ليس بين اثنين عداوة ، ثم يرسل الله ريحا باردة من قبل الشأم ، فلا يبقى على وجه الأرض أحد في قلبه مثقال ذرة من خير أو إيمان إلا قبضته ، حتى لو أن أحدكم دخل في كبد جبل لدخلته عليه ، حتى تقبضه « قال : سمعتها من رسول الله صلى الله عليه وسلم ، قال : « فيبقى شرار الناس في خفة الطير وأحلام السباع ، لا يعرفون معروفا ولا ينكرون منكرا ، فيتمثل لهم الشيطان ، فيقول : ألا تستجيبون ؟ فيقولون : فما تأمرنا ؟ فيأمرهم بعبادة الأوثان ، وهم في ذلك دار رزقهم ، حسن عيشهم ، ثم ينفخ في الصور ، فلا

يسمعه أحد إلا أصغى ليتا ورفع ليتا ، قال : وأول من يسمعه رجل يلوط حوض إبله ، قال : فيصعق ، ويصعق الناس ) **واتە:** : ( دەجاڵ لەسەر ئوممەتەکەم دەردەچێت، چاچل دەمێنێتەوە، نازانم چل رۆژە، یان چل مانگە، یان چل ساڵە، لەوکاتە خودای گەورە عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێت هەروەک (عەروەی کوڕی مەسعود)ە داوا لەخودا دەکات و لەناوی دەبات، پاشان چونکە حەوت ساڵ دەمێننەوە هەتا لەنێوان دووکەسدا هیچ ناکۆکیەک نابێت، پاشان خوای گەورە بایەکی سارد لەلای شامەوە دەنێرێت، هیچ کەسێک لەسەر ڕووی زەوی نامێنێتەوە ئەگەر لەدڵدا تەنها میسقالە زەڕەیەک چاکەیان ئیمان هەبێت ئیلا گیانی دەکێشرێت، تەنانەت ئەگەر کەسێکتان بچێتە ناو جەرگەی چیاکانەوە ئەوا شوێنی دەکەوێت و پێی دەگات، تەنها خراپترین کەس دەمێنێتەوە ئەگەر لەپێشی باڵندە دابن، نازانن چاکە بکەن و، نەهی لەخراپە بکەن، جاشەیتان خۆی



دەخاتە سەر شێوەیەکی وا کەبیبینن و پێیان دەڵێت: ئایا وەڵام نادەنەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: چ فەرمانێکمان پێدەکەیت؟! ئەویش فەرمانیان پێ دەکات بەبت پەرستی، لەکاتێکدا ئەوان رزق و رۆزییان زۆرەو، گوزەرانیشیان باشە، پاشان فوو ئەکرێ بە کەڕەنادا، خەڵکی گوێیان لێ دەبێت وە یەکەم کەس کەوا گوێی لەو کەڕەنایە دەبێت پیاوێکە کەوا حەوزی وشترکەی چاک دەکاتەوە، جا دەتۆقێ و رادەچڵەکێ و خەڵکیش دەتۆقێت و ڕادەچڵەکێن). موسلیم ریوایەتی کردووە

لەریوایەتێکی دیکەدا لەئەبوهورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (إن الله يبعث ريحاً من اليمن الين من الحرير، فلا تدع أحداً في قلبه مثقال حبة - او قال مثقال ذرة من أيمان إلا قبضته ) **واتە: (خودای گەورە بایەک دەنێرێت لەیەمەن لەئاوریشم نەرمتر، هیچ کەسێک ناهێڵێت ئەگەر میسقالە زەرەیەک چاکەو ئیمان لەدڵیدا هەبێت ئیلا گیانی دەکێشرێت)** موسلیم ریوایەتی کردووە.

*پاش ئەو بایە خراپەکارن کەس لەسەر رووی زەوی دەمێننەوە ..قیامەت لەسەر ئەوانە هەڵدەستێت..*






لە نیشانەکانی رۆژی دوایی کەوا گەورەو بچووک دەیبینێت، گۆڕانێکی کت و پڕو لەناکاو لەسیستەمی جوولەی گەردووندا ڕوودەدات.

لەوکاتەدا خەڵکی لەبەرەبەیانی ئەو رۆژەدان کەوا چاوەڕێی هەڵاتنی رۆژن وەکو جاران لەشوێنی خۆی لەرۆژ هەڵات هەڵبێت هەروەک ئەمە حاڵی ئەوە لەوکاتەی خودای گەورە دروستی کردووە، چۆن دەبێت ئەگەر رۆژ لەرۆژئاوا هەڵبێت، بەڵێ. رۆژ لەرۆژ ئاواوە، هەڵدێت... لەوکاتەدا دەرگای تەوبەکردن دادەخرێت.



## ئەو ئایەتانەی باس لەهەڵاتنی رۆژ لە رۆژ ئاوا دەکەن:

خودای گەورە دەفەرموویت ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾﴾ الانعام/١٥٨

**واتە (ئایا ئەوانە هیچ شتێک دەکەن جگە لەوەی کەفریشتەی گیان کێشانیان بۆ بێت؟ یان پەروەردگارت خۆی یەکسەر بێت بێ چەندو چوون؟ یان هەندێک لەنیشانەکانی پەروەردگارت دەربکەوێت لەرۆژی هاتنی هەندێک لەنیشانەکانی پەروەردگارت ئەو کەسەی ئەو رۆژە ئیمان و باوەڕ دەهێنێت، ئەو ئیمان و باوەڕی سوودی بۆی نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنا بێت، یان کردەوەی چاکی لەگەڵ ئیمانەکەیدا ئەنجام نەدابێت، پێیان بڵێ: چاوەڕێ بکەن، ئێمەش چاوەڕوانین)**

## ئەو حەدیسانەی هاتوون لەبارەی هەڵاتنی رۆژ لەرۆژ ئاوا:

- لەئەبوو هورەیرە رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ثلاث إذا خرجن لا ينفع نفساً إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في ايمانها خيراً، طلوع الشمس من مغربها والدجال ودابة الارض) **واتە: (سێ نیشانە هەن ئەگەر دەرکەوتن ئەوا هیچ کەسێک سوود لەئیمانەکەی نابینێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێت یان کردەوەی چاکی لەگەڵ ئیمانەکەیدا ئەنجام نەدابێت، هەڵاتنی رۆژ لە رۆژ ئاواوە، دەرچوونی دەجال، و دەرچوونی (دابە الارض)** موسلیم ریوایەتی کردووە

حیکمەت لەداخستنی دەرگای تەوبەکردن : **چونکە ئیمان جێگیر دەبێت لەزۆر لایەنەکانی وەک باوەڕ هێنان بەغەیب و شتی نادیارو شاراوە، ئەگەر رۆژ لەرۆژ ئاوا هەڵات ئەوا باوەڕهێنانەکە سوودی نابێت چونکە بەچاو بینراوە غەیبەکەش ئاشکراو ڕوون بۆوە، نەک بەدیتنی غەیبەکە ئیمان بهێنێت، ئەوا وەک ئیمانەکەی فیرعەونی لێدێت کاتێک هەستی دەکرد دەخنکێت.**

- لەئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێبێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها ، فإذا طلعت فرآها الناس آمنوا أجمعون ، فذلك حين : لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل ، أو كسبت في إيمانها خيرا ولتقومن الساعة وقد نشر الرجلان ثوبهما بينهما فلا يتبايعانه ، ولا يطويانه ، ولتقومن الساعة وقد انصرف الرجل بلبن لقحته فلا يطعمه ، ولتقومن الساعة وهو يليط حوضه فلا يسقي فيه ، ولتقومن الساعة وقد رفع أحدكم أكلته إلى فيه فلا يطعمها)
**واتە: (قیامەت هەڵناستێت تاوەکو رۆژ لەرۆژ ئاوا هەڵدێت، ئەگەر هەڵات دەبینێت خەڵکی هەر هەموویان ئیمان دەهێنن لەو کاتەدا ئیمان هێنان سوودی نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنا بێت یان کردەوەی چاکی لەگەڵ ئیمانەکەی ئەنجام نەدابێت، لەو کاتەدا قیامەت هەڵدەستێت کەوا دووپیاوی کڕیارو فرۆشیار لەنێوانیاندا کراسێک مامەڵە دەکەن هێشتا تەواو نابێت قیامەت هەڵدەستێت، لەو کاتە پیاوێک وشترەکەی دەدۆشێت هێشتا لێی ناخواتەوە قیامەت هەڵدەستێت، لەو کاتەدا پیاوێک حەوزی وشترەکەی چاک دەکاتەوە هێشتا ووشترەکەی ئاوی لێ ناخواتەوە قیامەت هەڵدەستێت، لەکاتێکدا یەکێک پێش ئەوەی پاروەنانەکەی بخاتە دەمیەوە قیامەت هەڵدەستێت )** موسلیم ریوایەتی کردووە

- لەئەبی ذر رەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (أتدرون أين تذهب هذه الشمس ؟ قالوا : الله ورسوله أعلم قال : إن هذه تجري حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش ، فتخر ساجدة ، فلا تزال كذلك حتى يقال لها : ارتفعي ، ارجعي من حيث جئت ، فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ، ثم تجري حتى تنتهي إلى مستقرها تحت العرش ، فتخر ساجدة ، ولا تزال كذلك حتى يقال لها : ارتفعي ، ارجعي من حيث جئت ، فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ، ثم تجري لا يستنكر الناس منها شيئا حتى تنتهي إلى مستقرها ذاك تحت العرش ، فيقال لها : ارتفعي أصبحي طالعة من مغربك، فتصبح طالعة من مغربها « ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : « أتدرون متى ذاكم ؟ ذاك حين لا ينفع نفسا إيمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في إيمانها خيرا)
**واتە: (ئایا دەزانن ئەو رۆژە بۆ کوێ دەڕوات؟ ووتیان خوداو پێغەمبەرەکەی درودی خوای لەسەر بێت باشتر دەزانن، فەرمووی (ئەو رۆژە دەڕوات تاکو دەگاتە جێگای راوەستانی لەژێر عەرشدا، جا لەوێدا کڕنۆش دەبات، لەوێ بەردەوام ئاوا دەمێنێتەوە تاوەکو پێی دەگوترێت: بەرز ببەوە، وەبگەڕێوە ئەو شوێنەی کەلێوەی هاتوویت، ئەویش دەگەڕێتەوە لەرۆژ هەڵاتەوە دەردەچێت، دیسان دەڕوات تادەگاتە جێگای راوەستانی**

لەژێر عەرشدا، لەوێ کڕنۆش دەبات، جا هەر لەوێ بەردەوام ئاوا دەمێنێتەوە تاوەکو پێی دەگوترێت، بەرزببەوە، بگەڕێوە ئەو شوێنەی کەلێوەی هاتووی، ئەویش دەگەڕێتەوەو لەرۆژ هەڵاتەوە هەڵدێت، پاشان دەڕوات کەخەڵکی هیچ گومان و جیاوازییەکی لێ نابینێت، تاوەکو دەگاتە جێگای ڕاوەستانی خۆی کەئەویش لەژێر عەرشی خودایە، پێی دەگوترێت، بەرزببەوە، لەرۆژ ئاواوە هەڵبێ ئەویش لەرۆژ ئاواوە هەڵدێت، جا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت (ئایا دەزانن ئەمەکەی روودەدات؟ ئەو کاتەی باوەڕ هێنان سوودی نابێت ئەگەر ئەو کەسەی پێشتر باوەڕی نەهێنا بێت یان کردەوەیەکی چاکی لەگەڵ باوەڕەکەی ئەنجام نەدابێت) موسلیم ریوایەتی کردووە.

- لەعەبدوللای کوڕی عەمر و رەزا خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویت (إن اول الأيات خروجاً طلوع الشمس من مغربها وخروج الدابة على الناس ضحى، وأيهما ما كانت قبل صاحبتها فالأخرى على إثرها قريباً) **واتە:** (یەکەم نیشانە گەورەکان کەپەیدا دەبێت هەڵاتنی رۆژ لەرۆژ ئاوایە، وە دەرچوونی گیان لەبەرە قسەکەرەکەیە بۆ نێو خەڵک لەچێشتەنگاودا، جا کامەیان بەپێش ئەویتر کەوت ئەوا ئەوی تر بەدوایدا نزیکەو دێت ) موسلیم ریوایەتی کردووە



تێبینی

هەندێک کەس شتەکان تێکەڵ و پێکەڵ دەکەن و کێشەو گرفتیان بۆ دروست دەبێت، چۆن پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت. لەو حەدیسەدا هەواڵی داوە کەوا یەکەم نیشانە گەورەکان هەڵاتنی رۆژ لەرۆژ ئاوایە وەدەرچوونی ئاژەڵەکەیە. لەکاتێکدا لەحەدیسەکانی تردا هاتووە کەوا یەکەم نیشانە گەورەکان هاتنی دەجالە یان مەهدیە یان نیشانەیەکی دیکە.

وە ئایا چۆن هەڵوەستەبکەین و بوەستین و سەربکەوین لە نێوان حەدیسەکاندا؟

**ئیبن حجر دەڵێت** : ( ئەوەی زۆر پەسند دەكرێت لەكۆی هەواڵەكاندا: كەوا دەرچوونی دەجال یەكەم نیشانە گەورەكانە كە مۆڵەتی پێ دەدرێت بەگۆڕانی باری گشتی لەزۆربەی ناوچەكانی زەوی، ئەمەش كۆتایی دێت بەمردنی عیسای كوڕی مەریەم، بەڵام هەڵاتنی رۆژ لەرۆژئاوا یەكەم نیشانە گەورەكانی مۆڵەت پێدراوە ئەویش بەگۆڕانی باری جیهانی لای سەرەوە، ئەمەش كۆتایی دێت بەهەڵسانی قیامەت، وە رەنگە دەرچوونی ئاژەڵە قسەكەرەكە (الدابە) هەر لەو رۆژەدا روویدات كاتێك رۆژ لەرۆژ ئاوا هەڵدێت موسلیم لەعەبدوللای كوڕی عەمرو ریوایەت دەكات و دەڵێت : (یەكەم نیشانە گە ورەكانی كەپەیدا دەبێت دەركەوتنی رۆژ لەرۆژ ئاوایە، وە دەرچوونی ئاژەڵە قسەكەرەكەیە (الدابە) لەسەر خەڵكی لەكاتی چێشتەنگاودا، جا كامەیان بەپێش ئەویتر كەوت ئەوا ئەوی دیكە بەدوایدا نزیكەو دێت ) سەیری الفتح /١١/٣٥٣ ) بكە.

## فەرمانكردن بەدەستپێشخەری و پەلەكردن بەكارو كردەوەی چاكە .

لەئەبی هورەیرەوە رەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت كەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (بأدروا بالأعمال ستاً، طلوع الشمس من مغربها أو الدخان أو الدجال أو الدابة أو خاصة احدكم أو أمر العامة)

**واتە: (پەلە بكەن لەكارو كردەوەی چاك پێش ئەو شەش نیشانەگەورانە دەركەون: هەڵاتنی رۆژ لە رۆژ ئاوا، یان دوكەڵەكە، یان دەجال، یان دەرچوونی (الدابە) یان سەر قاڵكردنی كارێكی تایبەت، یان كاروباری گشتی )** موسلیم ریوایەتی كردووە.









# ئاگرێک خەڵکی راو دەنێت بۆ شوێنی کۆبوونەوەیان




دوا نیشانەکانی ڕۆژی دواییە . وەکۆتایی هێماو نیشانەکانیەتی، ئاگرێک لەیەمەن دەردەچێت خەڵکی ڕاپێچ دەکات بۆ زەوی مەحشەر لەوێ کۆیان دەکاتەوە... زەوی مەحشەر زەویەکی سپی و یەکسانە وەک کولێرەیەکی پاک وایە کەوا هیچ نیشانەیەک یان شتێکی بەبەرزایی تیا نیە بۆ هیچ کەسێک...

- ئایا سیفەت و تایبەتمەندی ئەو ئاگرە چییە ؟
- وە چۆن دەردە چێت ؟
- لەکوێ دەردەچێت ؟
- ئایا لەپاشان چی ڕوودەدات.



## ئەو حەدیسانەی هاتوون لەبارەی ئەو ئاگرەوە

- لەحوذەیفەی کوڕی ئەسیدی غەفاری ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان و ئێمەش قسەمان دەکرد، فەرمووی (**فقال** : ما تذاكرون ؟ **قالوا** : نذكر الساعة ، **قال** : إنها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات - فذكر - الدخان ، والدجال ، والدابة ، وطلوع الشمس من مغربها ، ونزول عيسى ابن مريم صلى الله عليه وسلم ، ويأجوج ومأجوج ، وثلاثة خسوف : خسف بالمشرق ، وخسف بالمغرب ، وخسف بجزيرة العرب ، وآخر ذلك نار تخرج من اليمن ، تطرد الناس إلى محشرهم) **واتە: (باسی چی دەکەن)؟ وتیان باسی ڕۆژی دوایی دەکەین، فەرمووی (قیامەت هەڵناسێت تاوەکو دەنیشانە لەپێشدا دەبینن، جا باسی کرد : دووکەڵەکەو، دەجال و، (الدابە) و، هەڵاتنی ڕۆژ لەڕۆژ ئاواو، سێ ڕووچوونی زەوی، ڕووچونێک لەڕۆژ هەڵات، ڕووچوونێک لەڕۆژ ئاوا، ڕووچوونێک لەدوورگەی عەرەب و، کۆتایی ئەوە ئاگرێک لەیەمەن دەردەچێت خەڵکی ڕاو دەنێت بۆ شوێنی کۆبوونەوەیان)** موسلیم ڕیوایەتی کردووە

وە لەڕیوایەتێکی دیکەدا: (نار تخرج من قعره عدن ترحل الناس) **واتە:** (ئاگرێک دەردەچێت لەقووڵایی عەدەن خەڵکی ڕاو دەنێت) موسلیم ریوایەتی کردووە .

- لەعەبدوللای کوڕی عەمرو ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (ستخرج نار قبل يوم القيامة من بحر حضرموت أو من حضرموت تحشر الناس، **قالوا:** فبم تأمرنا يا رسول الله ؟ قال عليكم بالشام) **واتە: (پێش هاتنی قیامەت ئاگرێک دەردەچێت لەدەریای حەزرەمەوت، یاخود لەحەزرەمەوت خەڵکی کۆدەکاتەوە) وتیان جا چ فەرمانێکمان پێدەکەیت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی : (بڕۆن بۆ شام)** ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە.

لەئەنەس ڕەزای خوای لەسەر بێت دەڵێت (بَلَغَ عبدالله بن سلام مَقْدِمُ رسول الله ﷺ المدينة، فأتاه فقال : اني سائلك عن ثلاث لا يعلمهن الا نبي: ما أول أشراط الساعة؟ وما أول طعام يأكله أهل الجنة؟ ومن أي شيء ينزع الولد إلى أبيه؟ ومن

أي شيء ينزع إلى أخواله؟ فقال ﷺ : اخبرني بهن آنفا جبريل قال : فقال عبد الله ذاك عدو اليهود من الملائكة ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : أما أول أشراط الساعة فنار تحشر الناس من المشرق إلى المغرب ، وأما أول طعام يأكله أهل الجنة فزيادة كبد حوت ، وأما الشبه في الولد : فإن الرجل إذا غشي المرأة فسبقها ماؤه كان الشبه له ، وإذا سبق ماؤها كان الشبه لها « قال : أشهد أنك رسول الله)

**واته:** (کاتێک پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە عەبدوڵلای کوڕی سەلام چووە لای و ووتی: من سێ پرسیارت لێ دەکەم کەس نایزانێت تەنها پێغەمبەر نەبێت: ئایا یەکەم نیشانەکانی رۆژی دوایی چیە؟ وە ئایا یەکەم خواردن کە ئەهلی بەهەشت دەیخوات چیە؟ وە ئایا منداڵ لەچ شتێک بەباوکی دەچێت؟ وە بەچ شتێک بەخاڵەکانی دەچێت؟ ئینجا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی (جوبرەئیل لەسەرەوە وەڵامەکانی پێ ووتم) ئینجا عەبدوللا ووتی: ئەو دوژمنی یەهودەیەکانە لەناو فریشتەکاندا، ئینجا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت فەرمووی **(یەکەم نیشانەکانی رۆژی دوایی، ئاگرێکە خەڵکی لەرۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژ ئاوا کۆدەکاتەوە، وەیەکەم خواردنیش کەئەهلی بەهەشت دەیخۆن سەرە پارچەی جەرگی نەهەنگە، بەڵام وێکچوون لەمنداڵەکە، ئەگەر هاتوو پیاوێک چووە لای ئافرەکەی تۆوەکەی پێش ئاوی ئافرەتەکە کەوت ئەوا منداڵەکە بەباوکی دەچێت، بەڵام ئەگەر ئاوی ئافرەتەکە پێش کەوت ئەوا منداڵەکە بەدایکی دەچێت) ووتی : شایەدی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خودای .. )** بوخاری ریوایەتی کردووە.





لەعەبدوللای کوڕی عەمر ڕەزا خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت (أول الآيات طلوع الشمس من مغربها، وخروج الدابة على الناس ضحى، فأيهما خرجت قبل الأخرى فالأخرى منها قريب) واتە: (یەکەم نیشانە گەورەکان هەڵاتنی ڕۆژ لەرۆژ ئاوایەو، دەرچوونی (الدابە) لەنێو خەڵکدا لەچێشتەنگاودا، جا هەر کامەیان لەپێش ئەویتر دەربچێت ئەوا ئەوی دیکە دێت و لێی نزیکە) موسلیم ڕیوایەتی کردووە .

چۆن سەرکەوین لەنێوان ئەوەی پێشدەکەوێ لەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی، وە هەواڵ پێدانی ئەو حەدیسە ئاشکرا بکە کەوا ئاگرەکە یەکەم نیشانەکانی ڕۆژی دواییە ؟

وەڵام/
مەبەستەکە لێرەدا لەنیشانەکانی هەستانی ڕۆژی دواییە، نەک نیشانەکانی نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی، لەڕیوایەتێکی دیکەی بوخاری ئەو فەرموودەیە دەسەلمێنێ : (ئایا یەکەم نیشانەی ڕۆژی دوایی چیە؟ واتە هەڵسانی قیامەت.

بەڕەنگاری ئاراکی

ئەو ئاگرەی کەوا خەڵکی کۆ دەکاتەوە، ئەوا ئەو ئاگرەنیە کەوا لەخاکی حیجاز دەردەکەوێت و گەردنی حوشتر لەبوصری ڕووناک دەکاتەوە، چونکە ئەو ئاگرە لەسەدەی حەوتەم دەرکەوت ئەمەش لەنیشانە بچووکەکانی ڕۆژی دواییە.

## چۆنیەتی کۆکردنەوەی خەڵکی

لەئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (يحشر الناس على ثلاث طرائق : راغبين راهبين ، واثنان على بعير ، وثلاثة على بعير ، وأربعة على بعير ، وعشرة على بعير ، ويحشر بقيتهم النار ، تقيل معهم حيث قالوا ، وتبيت معهم حيث باتوا ، وتصبح معهم حيث أصبحوا ، وتمسي معهم حيث أمسوا) **واتە: (خەڵکی لەسەر سێ ڕێگاو شێوە کۆدەکرێتەوە، جۆرێکیان بەئارەزووی خۆیان، وەجۆرێکیان لەترسانا و، جۆرێکی تریان دووکەس لەسەر ووشترێک، وەسێ کەس لەسەر وشترێک، و چوار کەس لەسەر ووشترێک، وە دەکەس لەسەر وشترێک، ئەوەش کەماوەتەوە ئەوا ئاگرە گەورەکە ڕاویان دەنێ و کۆیان دەکاتەوە، ئەگەر شەویان بەسەرداهات هەر لەگەڵیانە، ئەگەر بەیانیان بەسەرداهات هەر لەگەڵیانە، لەکوێ ئێوارەیان کردەوە ئەوا هەر ڕاویان دەنێ و ازیان لێ ناهێنێ)** بوخاری ریوایەتی کردووە.

وەماناکەی، ئەوە ئاگرە مەبەستی ئەوە نیە خەڵکی بسوتێنێ، بەڵکو ڕاپێچیان دەکات بۆ زەوی کۆ بوونەوە لەشام، جا ئەگەر خەڵکەکە ڕۆیشتن وە ماندووبون و دانیشتن بۆنان خواردن و خەوتن، ئاگرەکەش رادەوەستێت، هەرکاتێک هەڵسان لەسەر نان خواردن ئەوا ئاگرەکە راویان دەنێتەوە، جا ئەگەر خەڵکەکەیشەو مانەوە ئاگرەکەش لەگەڵیاندا دەمێنێتەوە، هەرکاتێک بەیانیان بەسەرداهات ڕۆیشتن ئەوا ئاگرکەش لەگەڵیاندا دەڕوات و ڕاپێچیان دەکات.. تاوەکو دواییەکەی دەیانباتە ووڵاتی شام.

لەئەبی ذر ڕەزای خوای لەسەر بێت کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (إن الناس يحشرون ثلاثة أفواج : فوجا طاعمين كاسيين راكبين ، فوجا يمشون ويسعون ، فوجا تسحبهم الملائكة على وجوههم فقال قائل منهم، هذان قد فرعناهما فما بال الذين يمشون ويسعون ؟ قال : « يلقي الله الآفة على الظهر فلا ظهر حتى لايبقى ظهر حتى إن الرجل ليكون له الحديقة المُعجبة فيعطيها بالشارف ذات القتب فلا يقدر عليها.) **واتە: (خەڵکی لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر سێ دەستە یان سێ کۆمەڵ کۆدەبنەوە، دەستەیەک بەسواری و بەتێری و بەپۆشتەیی، وە دەستەیەک بەپێ دەڕۆن و هەوڵدەدەن، وە دەستەیەک فریشتەکان لەسەردەم و چاویان ڕایاندەکێشن) جا یەکێک لەوان دەڵێت : ئەو دوانەیەمانزانی**

ئەی مەبەست لەوانە چیە؟ کەبەیی دەڕۆن و هەوڵدەدەن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (خوای گەورە ئافاتێک دەنێرێتە سەر وڵاخی بار هەڵگر تاوای لێدێت وڵاخ نامێنێت، تەنانەت پیاویان تیا دەبێت کە باخچەیەکی زۆر سەر سوڕهێنەری هەیە دەیدات بەپیرە حوشترێک کە کورتانی پێوە بێت، کەچی هێشتا پێی ناکڕدرێت) ئەحمەد و نیسائی ریوایەتیان کردووە .





# کۆتایی

سوپاس و ستایشی خودای گەورە دەکەم لەسەر ئەوەی ماوەی پێدام و دڵی خۆشکردم وچاودێری کردم لەتەواو کردنی ئەو کتێبە، وە لەخودای مەزن و دلۆڤان دەپاڕێمەوە کەوا سوودی هەبێت و نیەت و مەبەستێکی پاک و بێگەردی تێدابێت بۆ ڕەزامەندی خودای بەخشندەی میهرەبان.

بێگومان وویست و ئارەزووم وابوو کەباسەکانم بۆ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی بەشێوازی نوێ بێت وە سەرنج ڕاکێش بێت، تاوەکو خوێنەر لەنێوان سوود وەرگرتنێکی دڵخۆشکەر، وە دڵخۆشکەرێکی بەسوود کۆبکاتەوە، وەتەمەننا دەکەم کەسەر کەوتووبم لەوەی هیواو ئومێدم وابوو، وەبیکەم بەدیاری بەوەی من دەمەوێت؟

ئایا چی لەوە جوانترە کاتێک خوێنەرێکی پیاو یان ئافرەت ئەو کتێبە دەخوێنێتەوە، وە نووکی پێنووسەکەی هەڵدەگێڕێت و، بۆ چوون و تێروانینی خۆی بۆ من دەنووسێت، یاخود تێبینی یەکەی، یاخود ئاوڕدانەوەیەک وەک لەوکتێبە، منیش سوپاسگوزار دەبم بەرامبەر ئەو چاکەیە.

**لەخودای پەروەردگار دەپاڕێمەوە هەموو لایەک سەر کەوتوو بکات... ئامین**

**نووسینی**

د. محمد کوڕی عبدالرحمن العریفی

# ناوەرۆک

پێشەکی.......... ٤
بۆچی لەبارەی نیشانەکانی رۆژی دوایی دەدوێن.......... ٥
یاساکانی مامەڵەکردن لەگەڵ نیشانەکانی رۆژی دوایی.......... ٩
چەند یاسایەك بۆ دابەزاندنی دەقی نیشانەکانی رۆژی دوایی لەسەر راستەقینەیی.......... ١٤
مانای نیشانەکانی رۆژی دوایی.......... ٢٠
بەشەکانی نیشانەکانی رۆژی دوایی.......... ٢١
نیشانە بچووکەکان .......... ٢٣

**نیشانە بچووکەکانی رۆژی دوایی.......... ٣٣**

دەروازە.......... ٣٥
٢. رەوانە کردن و هاتنی پێغەمبەرمان محمد ﷺ .......... ٣٧
٣. مردنی پێغەمبەرمان محمد ﷺ .......... ٣٨
٤. کەرتبوونی مانگ.......... ٣٩
٥. نەمانی سەحابە بەرێزەکان.......... ٤١
٦. رزگار کردنی بیت المقدس.......... ٤٢
٧. مردنی بەکۆمەڵ وەك دەردی مەڕ .......... ٤٣
٨. زۆر بوونی دەرکەوتنی فیتنەو ئاژاوە بەهەموو جۆرەکانی.......... ٤٤
٩. دەرکەوتنی کەناڵە ئاسمانیەکان .......... ٤٦
١٠. هەواڵ پێدانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر روودانی جەنگی صفین.......... ٤٧
١١. دەرکەوتنی خەوارج (هەڵگەڕاوەکان) .......... ٤٨
١٢. دەرکەوتنی دەجالە درۆزنەکان بۆ بانگەشەکردنی پێغەمبەرایەتی.......... ٥٠
١٣. بڵاوبوونەوەی ئەمن و ئاسایش و خۆشگوزەرانی.......... ٥٥

١٤. دەرکەوتنی ئاگرێك لەحیجاز ..................................................٥٦
١٥. شەڕکردن لەگەڵ تورك ..................................................٥٨
١٦. دەرکەوتنی پۆلیس و پیاوی ستەمکار کەوا بەقامچی لەخەڵك دەدەن ..................................................٦٠
١٧. زۆر بوونی کوشت و کوشتار ..................................................٦١
١٨. بزرکردن و بەفیرۆدانی سپاردەو دەرهێنانی لەناو دڵدا..................................................٦٢
١٩. شوێن پێ هەڵگرتنی ڕێچکەکانی گەلانی ڕابردوو..................................................٦٤
٢٠. منداڵ دەبێتە گەورەو سەردار لەسەر دایکی ..................................................٦٥
٢١. دەرکەوتنی ئافرەتی ڕووت و بەرگ تەنك ..................................................٦٦
٢٢. خەڵکانی پێ پەتی و ڕووت شوانی مەڕ و بزن دەبنە خاوەنی کۆشك و خانووی بەرز..................................................٦٧
٢٣. سەلام کردن لەکەسانی ناسیاو (سەلام کردنی تایبەت ) ..................................................٩٦
٢٤. بڵاوبونەوەی بازرگانی ..................................................٧٠
٢٥. بەشدارکردنی ئافرەت لەگەڵ پیاوکەیدا لەبازرگانیدا ..................................................٧٠
٢٦. دەست بەسەردا گرتنی هەندێك بازرگان بەسەر بازاڕدا ..................................................٧٠
٢٧. شایەدی دانی بەدرۆ ..................................................٧٢
٢٨. شاردنەوەی شایەدی دانی حەق و ڕاستی ..................................................٧٤
٢٩. دەرکەوتنی نەزانین ..................................................٧٥
٣٠. دەرکەوتنی ڕەزیلی و چرووکی ..................................................٧٧
٣١. پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی ..................................................٧٧
٣٢. دراوسێی خراپ..................................................٧٧
٣٣. دەرکەوتنی خراپەکاری ..................................................٧٨
٣٤. ناپاك کردنی دەست پاك و، باوەڕکردن بەناپاك..................................................٧٩
٣٥. نەمانی پیاوچاکان و دەرکەوتنی کەسانی بێ نرخ..................................................٧٩
٣٦. گوێنەدان بەسەرچاوەی پارەکۆکردنەوە لەحەڵاڵ یان لەحەرام..................................................٨١
٣٧. وەرگرتنی دەستکەوت و غەنیمەکان لەنێوان خۆیاندا..................................................٨٢
٣٨. ئەو کاتەی سپاردە دەبێتە دەستکەوت و غەنیمە ..................................................٨٣

٣٩. ئەوانەی دەروونی خۆیان پاك ناكەنەوە بەدەرهێنانی زەكاتەكانیان.........٨٣
٤٠. فێربوونی زانست بۆ غەیری خوا .........٨٤
٤١. ملكەچی بۆ خێزان و ڕەنجاندنی دڵی دایك .........٨٤
٤٢. دانیشتن لەگەڵ برادەران و پشت گوێ خستنی دایك و باوك.........٨٥
٤٣. دەنگ بەرزكردنەوە لەناو مزگەوتەكان .........٨٦
٤٤. دەسەڵات گرتنە دەستی كەسانی بێ نرخ بەسەر گەلانی موسڵمان.........٨٧
٤٥. سووك و ڕیسواترین كەس دەبێتە پێشەوای نەتەوەكەی .........٨٧
٤٦. ڕێزگرتنی پیاوێك لەترسی ستەمەكەی .........٨٨
٤٧. حەڵاڵكردنی داوێن پیسی .........٨٩
٤٨. حەڵاڵكردنی ئاوریشم بۆ پیاوان .........٨٩
٤٩. خواردنەوەی عەرەق .........٨٩
٥٠. گۆرانی گوتن و مۆسیقا .........٨٩
٥١. خەلك مردن بەئاوات دەخوازن .........٩٢
٥٢. زەمانێك دێت پیاوێك بەیانی دەكاتەوە ئیمانداره و ئێواره دەكاتەوە كافره .........٩٣
٥٣. ڕازاندنەوەی مزگەوتەكان و شانازی پێوەكردنی .........٩٤
٥٤. ڕازاندنەوەی ماڵەكان و جوانكردنی .........٩٦
٥٥. زۆربوونی هەوره تریشقه لەكاتی نزیك بوونەوەی ڕۆژی دوایی .........٩٧
٥٦. زۆر بوونی نووسین و بڵاوبوونەوەی .........٩٨
٥٧. پەیداكردنی سەروەت و سامان بەزوبان و خۆهەڵكێشان بەقسه .........١٠٠
٥٨. بڵاوبوونەوەی كتێب جگە لەقورئان .........١٠١
٥٩. زەمانێك دێت خوێنەر تێیدا زۆر دەبێت و .........١٠٢
٦٠. زانست بكەوێتە دەست منداڵان .........١٠٤
٦١. مردنی كت وپڕو لەناكاو .........١٠٦
٦٢. فەرمانڕەوایەتی گەمژەو كاڵفامەكان.........١٠٧
٦٣. لێك نزیك بوونەوەی كات و ڕۆژەكان .........١٠٨

٦٤. کەسانی نەفام و گەمژە لەکارو باری گشتیدا قسەدەکەن ........................ ١١٠
٦٥. بەختەوەرترین کەس لەدونیا هیچ و پووچی کوڕی هیچ و پووچ دەبێت ........................ ١١١
٦٦. بەکاهێنانی مزگەوتەکان بۆ حەوانەوە جگە لەنوێژکردن ........................ ١١٢
٦٧. بەرزبوونەوەی نرخی مارەیی ئافرەت پاشان دابەزینی ........................ ١١٣
٦٨. بەرزبوونەوەی نرخی ئەسپ و وولاخەبەرزەکان پااشن دابەزینی ........................ ١١٣
٦٩. لێك نزیك بوونەوەی بازاڕەکان ........................ ١١٤
٧٠. چاوتێبڕین و پەلاماردانی گەلان بەسەر گەلانی ئیسلام ........................ ١١٥
٧١. خەڵك یەکتری پاڵدەدەن بۆ پێش نوێژی کردن ........................ ١١٧
٧٢. ڕاست دەرچوونی خەونی ئیماندار ........................ ١١٨
٧٣. زۆر بوونی درۆ ........................ ١٢٠
٧٤. پەیدابوون ڕەق و کینە و یەکتر نەدواندن لەنێو خەڵکدا ........................ ١٢١
٧٥. زۆر بوونی بوومەلەرزە ........................ ١٢٢
٧٦. زۆر بوونی ئافرەت ........................ ١٢٣
٧٧. کەم بوونی پیاو ........................ ١٢٣
٧٨. دەرکەوتنی داوێن پیسی و ئاشکراکردنی ........................ ١٢٤
٧٩. وەرگرتنی کرێ لەسەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز ........................ ١٢٥
٨٠. لەناو خەڵکدا قەڵەوی زۆر پەیدا دەبێت ........................ ١٢٦
٨١. دەرکەوتنی قەومێك دەبینن بەڵام شایەدی بەهەق نادەن ........................ ١٢٧
٨٢. دەرکەوتنی قەومێكماڵی خۆیان نەزردەکات بەڵام دڵسۆز نین ........................ ١٢٧
٨٣. بەهێز لاواز دەخوات ........................ ١٢٨
٨٤. وازهێنان لەحوکمی قورئان کە خودای گەورە دایبەزاندووە ........................ ١٢٩
٨٥. زۆر بوونی ڕۆمەکان و کەمبوونەوەی عەرەب ........................ ١٣٠
٨٦. زیادبوونی سەروەت و سامان و زۆربوونی لەناو خەڵکدا ........................ ١٣١
٨٧. دەرهێنانی زەوی خەزینەکانی ........................ ١٣٣
٨٨. دەرکەوتنی شێوە گۆڕین ........................ ١٣٤

٨٩. ڕۆچوونی زەوی ........................................١٣٤

٩٠. بەرد بارانکردن ........................................١٣٤

٩١. بارانێك ئەو ماڵانەی لەقوڕو بەرد دروستکراوە لێی دەرباز نابێت ........................................١٣٦

٩٢. بارانێك لەئاسماندا دەبارێت هیچ شتێك لەزەویدا شین نابێت ........................................١٣٧

٩٣. فیتنەیەك هەموو عەرەب دەگرێتەوە ........................................١٣٨

٩٤. قسەکردنی داروو درەخت ........................................١٣٩

٩٥. قسەکردنی بەرد سەرکەوتنە بۆ موسڵمانان ........................................١٣٩

٩٦. شەڕکردنی موسڵمانەکان لەگەڵ جوولەکەکان ........................................١٣٩

٩٧. ڕووباری فورات چیایەك لەئاڵتون دەردەخات ........................................١٤١

٩٨. زەمانێك دێت پیاو دادەمێنێت لەنێوان کردن و نەکردنی داوێن پیسی ........................................١٤٣

٩٩. گەڕانەوەی دورگەی عەرەب بەسەوزایی و ڕووبار ........................................١٤٤

١٠٠. دەرکەوتنی فیتنەی الاخلاس ........................................١٤٧

١٠١. دەرکەوتنی فیتنەی السراء ........................................١٤٧

١٠٢. دەرکەوتنی فیتنەی الدهیماء ........................................١٤٧

١٠٣. زەمانێك دێت سوجدەیەك لەهەموو دونیاو ئەوەی تیایەتی باشترە ........................................١٥٠

١٠٤. کرانەوەو گەورەبوونی مانگ ........................................١٥٢

١٠٥. زەمانێك دێت کەس نامێنێت ئیلا دەگات بەشام ........................................١٥٤

١٠٦. داستانە گەورەکەی نێوان موسڵمانان و ڕۆمەکان ........................................١٥٦

١٠٧. رزگار کردنی قوستەنتینیە (ئەستەمبۆل) ........................................١٥٦

١٠٨. کاتێك میرات دابەش ناکرێت ........................................١٦٣

١٠٩. کاتێك خەڵك دڵخۆش نابێت بەغەنیمەت ........................................١٦٣

١١٠. گەڕانەوەی خەڵك بۆ چەك و سواربووە کۆنەکان ........................................١٦٤

١١١. ئاوادان کردنەوەی بیت المقدس و کاول بوونی ........................................١٦٥

١١٢. چۆڵبوونی لەدانیشتوان و گەشتیاران ........................................١٦٥

١١٣. مەدینە پیاوەخراپەکانی لادەبات وەك... ........................................١٦٧

١١٤. نەمانی چیاکان لەشوێنی خۆیان ........................................ ١٦٩
١١٥. دەرچوونی پیاوێك لەقەحتان خەڵكی گوێڕایەڵی دەبێت ........................ ١٧٠
١١٦. دەرکەوتنی پیاوێك پێی دەڵێن جەهجاه ........................................ ١٧١
١١٧. قسەکردنی دڕندەو بێ گیانەکان ........................................ ١٧١
١١٨. قسەکردنی جێ دەستی قامچی مرۆڤ ........................................ ١٧١
١١٩. قسەکردنی قەیتانی پێلاو ........................................ ١٧١
١٢٠. هەواڵ پێدانی ڕانی مرۆڤ بەهەواڵی کەس و کاری ........................ ١٧١
١٢١. قیامەت هەڵناستێت تاوەکو ئاینی ئیسلام دەپووکێتەوە ........................ ١٧٥
١٢٢. بەرزبوونەوەو هەڵگیرانی قورئانی پیرۆز لەناو دڵەکاندا ........................ ١٧٥
١٢٣. سوپایەك دەیەوێت مەککە داگیربکات سەرەتاوە کۆتاییەکەی ڕۆدەچیت بەزەویدا ........ ١٧٧
١٢٤. وازهێنان لەحەجکردن لەکەعبەی ماڵی خوا ........................................ ١٨٠
١٢٥. گەڕانەوەی هەندێك هۆزی عەرەب بۆ بت پەرستی ........................ ١٨١
١٢٦. نەمانی هۆزی قورەیش ........................................ ١٨٢
١٢٧. روخاندنی کەعبە لەسەر دەستی پیاوێك لەحەبەشە ........................ ١٨٣
١٢٨. هەڵکردنی بایەکی فێنێك بۆ کێشانی گیانی ئیمانداران ........................ ١٨٦
١٢٩. بەرزبوونەوەی بینایەو باڵەخانەکانی مەککە ........................................ ١٨٧
١٣٠. دوایین ئوممەت نەفرەت لەئوممەتی پێش خۆیان دەکەن ........................ ١٨٨
١٣١. سورابووە نوێنەکان ... ئۆتۆمبێل ........................................ ١٨٩
١٣٢. دەرکەوتنی مەهدی ........................................ ١٩٠

**نیشانەگەورەکانی ڕۆژی دوایی ........................................ ٢٢١**

دەروازە ........................................ ٢٢٣
**١- مەسیحی دەجال ........................................ ٢٢٥**
دەروازە ........................................ ٢٢٧
**٢- دابەزینی عیسی ( علیە السلام) ........................................ ٢٩٠**

دەروازە ........................................................................................ ٢٩١
**٣- دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج ................................................ ٣٣٣**
دەروازە ........................................................................................ ٣٣٥
**٤- سێ ڕۆچوونەکەی زەوی............................................................ ٣٦٣**
دەروازە ........................................................................................ ٣٦٥
**٥- دووکەڵەکە ........................................................................... ٣٧١**
دەروازە ........................................................................................ ٣٧٣
**٨- ئاژەڵەقسەکەرەکە (الدابە) ........................................................ ٣٧٣**
دەروازە ........................................................................................ ٣٨١
**٩- هەڵاتنی ڕۆژ لەڕۆژ ئاوا ........................................................... ٣٨٩**
دەروازە ........................................................................................ ٣٩١
**١٠- ئاگرێك خەڵکی ڕاودەنێت بۆ شوێنی کۆبوونەوەیان ........................ ٣٩٧**
دەروازە ........................................................................................ ٣٩٩
کۆتایی ........................................................................................ ٤٠٤
ناوەرۆك ........................................................................................ ٤٠٨









- یەکەم پەرتوکی وێنەدار بۆ نیشانەکانی رۆژی دوایی.
- جەنگەکانی کۆتایی جیهان ..لەگەڵ کێ ؟
- حەقیقەتی محمد مەهدی..
- سەیرو سەرسوڕهێنەرەکانی مەسیحی دەجال..
- چیرۆکی یەئجوج و مەئجوج..



بڵاوکراوەی کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ فرۆشتن و چاپکردن و بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
عێراق - کوردستان - هەولێر

بە ٤٢٠٠٠ ٥ ر